ناوی کتێب: ژنێک بەسەر منارەوە
نووسینی: شێرزاد حەسەن
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئارام عەلی
تایپ: پێشەوا محەمەد
تیراژ: ٣٠٠٠
نرخ:
چاپی یەکەم_ ٢٠١١
ژمارەی سپاردن:

## بەیانی — نیوەڕۆ

لەم بەیانییە زووەدا گەڕەکی نیوەچۆڵکراو ئەوەندە کپو خامۆشە وەک ئەوەی مەردوومەکانی ناو ئەو چەند خانووانەی بە چواردەوری منارەکەدا ماونەتەوە هەر هەموو مردبن، یان لە ترسی چارەنووسێکی ڕەش حەز نەکەن بێدار ببنەوە، یان لەتاو ماندوێتیو شانو پیل کوتان و رەنجی بێ سەمەر کفتو پرزە لێبڕاو خەوتبن. ئەو چەند خانووانەی کە لێرەو لەوێدا، پەرشو بڵاو و ناڕێک ماونەتەوە، هەر

وەک شوورەیەک بە چواردەوری منارەکەدا توندو ڕەگاژۆ بناغەیان داکوتیوە، پەنجەرەکانی کە «شادی» لە بالکۆنەکەوە دەیانبینێت، لە دەیەها چاو دەچن کە شەیداو سەرسامانە لەو منارەیە بڕوانن، درەختەکانی ناو حەوشەکان بۆ هەیبەتی هێشتا قیت وەستاوی ئەو هەیکەلەی کە پیریی کەمێک سەری پێ خوارکردۆتەوەو هەر جارەو خشتێکی لێ دەکەوێتە خوارێ وەک کەوتنی ددانی پیرەمێردێک، بەدەم بایەکی هەڵکردووی ئەم پیرە پایزە هەر هەموو درەختەکان بۆی دەشنێنەوە وەک ئەوەی دڵنەوایی منارەکە بکەن کە ئێمەش وەک تۆ هێشتا بەپێوە وەستاوین، لە سۆزو غەمی کەوتنە خوارەوەی هەر خشتێک سەدەها گەڵای گریان دەبارێنین، وەک ئەوەی هەر خشتێکی کۆنینە فرمێسکێکی درشت بێت کە لە تاو تەنیاییو بە ترسێکەوە دابکەوێت، ترسی واتەواتێک کە ئەمڕۆ نا .. بەیانی منارەی تاین دەڕووخێنن، لەتەک هەر هەموو ئەو خانووانەی کە ماونەتەوە تەخت دەکرێن، ئەو منارەیەی گوایە ئەوەندە لاربۆتەوە کە لە گوینە بڕووخێت، خواپێداوەکان واتەنی: لە تەک ئەو ماڵو کولانەی سەگان و کەلاوەی ئەو دەرۆزەکەرو دۆمو قەرەجانە کە بۆتە مۆڵگەی دزو چەتەو پیاوخراپان، لە جێگەی ئەوەدا دەوڵەت لە خەمی ئەوەدایە بیکات بە «بەهەشتی شار» کە پڕ بێت لە سوپەرمارکێتو مۆتێلو مۆڵو یانە و بازاڕی هاوچەرخ، پڕ بێت لە مەلەوانگەو نافوورەو یاریگا، کە بەدەم فسکە فسکو هەناسە بڕکێوە ڕۆژانە لەناو کۆڵانەکانو ماڵەکانو

دوکانەکان‌و سەرجادەکاندا دەگاتە گوێی تۆ کە بە دەم هەراو زەناو ترسەوە مەردوومەکان باس لە ڕووخاندنی دەکەن.

بە تێڕامانێکی غەمگینەوە لە درەختەکان ورد دەبیتەوە کە بەدەم کزەیەکی ساردی ئەم بەرەبەیانە دەشنێنەوە، پیرە پایز سەربان‌و حەوشەکانی بە گەڵای زەردو قاوەیی‌و سوورباوەوە داپۆشیوە، چی چۆلەکەو کوکوختی‌و کۆترەکانی سەر منارەو درەختەکان هەن بە پرتاو بە دەم باڵەفڕەوە دادەبەزن وەک ئەوەی گەمە لە تەک گەڵا هەڵوەریوەکاندا بکەن، بە دەم هەڵفڕینەوە جارێکو دوو .. و دە جاران پشێوی‌و گێژەڵووکەیەک دەخەنە ناو گەڵاکان، ئەوەندە چڕو تێکەڵ کە گەڵاکان لە مەلەکان جیا نەکرێنەوە، کە گەڵاکان مردووانە دەکەونە سەر عەردەکە، ئانوسات فڕندەکان گەیشتوونەتەوە سەر منارەو درەختەکان، کە قەیرێکی دیکە خۆر تەواو هەڵکشا ڕووەو ئاسمان، لە ژێر هەتاودا هەر تنۆکێک شەونم دەبێت بە فرمێسکێکی قەتیسماو و بەسەر گەڵا مردووەکاندا دەبریسکێتەوە، تا هەنووکە لە چەندین نیگارو تابلۆدا شیوەنی ئەم پاییزەی نەخشاندووە، درێژترین کاتی خۆت لەو ماوەیەدا بەخشی بە نیگارێک کە تەواو سەرگەرمی کردیت ..نیگاری گەڵایەکی تەنیا بوو کە نەیەوێت وەک دوا گەڵا لە لقی درەختێکدا بپچڕێت‌و مەرگی خۆی بسەلمێنێت، دوا مۆری ماڵئاوایی پاییزو هاتنی زستانێکی تاریکو درێژو سارد بسەپێنێت. هەر وەک

ئەوەی ئەم دوا گەڵایە ڕۆحی خۆت بێتو کێبەرکێ لەگەڵ وەیشوومەدا بکات، جگە لە نیگاری شیوەنی درەختەکانی چواردەوری منارەکە بە دەم گەڵاڕێزانەوە، منارەی بزرو گەمارۆدراو بە گەردەلوولێک تێکەڵ لە هەزارەها گەڵای زەردو مەلی باڵ هەڵوەریو و دەنووک خوێناوی، یان حەوشەو بەردەرگاو سەربانو کۆڵانی ونبوو لەژێر تەبارو بارینی گەڵاکاندا کە لە شاخەکانەوە بەدەم باوو بۆرانەوە ئاسمانی شاریان داگیر کردووە. تابلۆکانت پڕبوون لە سەدەها فڕندەی پێکراو کە لەناو گێژەڵووکەیەکدا بە ئاسماندا بڵاو و هەڵچوو ... لە چاوان ون دەبوون، کە هێزی باوو بۆرانو چڕی گەڵاکان هەموو ئاراستەیەکی لێ ون کردبوون، بە جۆرێکیش هەندێکیان کوێر و ماندوو کە لە تەک گەڵاکاندا کەوتبوونە سەر تاقو بەر پەنجەرەو ناو بالکۆنو حەوشەو سەربانەکان، کە لە درەختەکان ڕادەمایت، گەڵاکانو مەلەکانو هێلانەکانو هێلکەکان پێکەوە لەوەدابوو بکەونە سەر زەوی، وەک ئەوەی بە پەتێکی نادیارەوە بە هەواوە هەڵواسرابن، لەنێوان مانەوەو کەوتندا هەوایەکی پڕ لە بێ ئۆقرەیی لە ڕۆحدا بەرپا بکەن، هەر هەنووکە هاشو هووشی پۆلێک باڵندەی جیاوازو سەرلێشێواو بەسەر منارەکەوە دەخولێنەوە وەک ئەوەی نەوێرن بنیشنەوە لە ترسی سەدەها ماری پەپکە خواردوو لە زارکی منارەکەوە ئەڵقاو ئەڵق بە بانی سەری سەرەوە، کتومت هەر وەک ئەو تابلۆیەی کە منارەکە لە بنی بنەوەی تا ترۆپکی کەلبووی لە دە لاوە بە سەدەها ڕەشە مارو زەردە ماری تێکئاڵاوەوە کە خشتێک

چییە دیار نەما بێت، سەرو کلک تێکچەقیو، چاو پڕ لە بریقەو پرشنگی ئاگر، منارەیەک لە مار، پێچو لوول هەڵکشاو بەناو بۆشایی ئاسماندا، لە سەری سەرەوەش پۆل پۆل کۆترو قەتێو قەلەباچکەو پۆڕو چۆلەکەو ڕیشۆڵەو کوکوختی گێژ دەخۆن بە تەماو قەستی ئەوەی منارە ڕەپ ڕاوەستاوەکان لەسەر کلکان دەنووک ئاژن بکەن، کەچی ناوێرن .. دەنووک کراوە بە ئەندازەیەک کە هەڵزڕێن، پڕ بە فەزای تابلۆکە گوێبیستی جووکەو چریکەو قاژەقاژو گمە دەبیت، کە تەواو ترسی ئەوەت لێدەنیشێت مارەکان بە زاری کراوەو زمانی دوو لەتەوە هەر هەموو مەلەکان دەرحاڵ هەڵبلووشن. لە شەڕی هارو کێوییانەی مەلەکانو مارەکان سام دەتگرێت، مارەکان ئەوەندە زەندەقیان چووە پەڕوباڵیان لێ ڕواوە، مەلەکانیش ئەوەندە تۆقیون شاپەڕو گەندەپەڕ هەڵداوێن،بە حەواوە لە تاو و ترسی فیشکەفیشکی مارەکان هێلکە دەکەن، هێلکەکان ڕێکو ڕاست دەکەونە ناو زاری کراوەو هەراوی مارەکان، سەرەتای جەنگو بەیەکدادانێکی خوێناوییە کە فڕندەکان بەدەم باڵەفڕەوە تۆقیونو لە هێلانە داڕماوەکانی خۆیان ڕادەمێننو پەڕوباڵیان هەڵدەوەرێن، ئاسمانی سەر منارەکەش پڕ لە شاپەڕی مەلەکان.. یەکێک لە مارەکان تا نیوە کۆترێکی لە زار ناوەو ڕێک قەپی لە سەری گرتووە.

چ زستان بێتو چ هاوین .. چ پاییزو چ بەهار..تەنیا باڵو زوو

کۆستکەوتوو عاشقانە وەک هەنووکە سەلارو سەنگین ، چ زوو بێتو چ درەنگ، هەموو بەیانییەک کە لە خەو بێدار دەبیتەوە، یەکەمین شت کە بیری لێبکەیتەوە بینینی منارەکەیە وەک ئەوەی غەریبی باڵای بکەیت و ئامادە بیت باڵاگەردانی بیت ، بە دڵەخورپێو بە هەنگاوی خێراو .. چوستو چالاکانە..خانمانە ڕووەو بالکۆنەکە مل دەنێیتو لەوێوە پڕ بە هەردوو چاوە کاڵەکانت لە منارەکە دەڕوانیت، کە چاوی لێدەکەیت هێشتا منارەی تاین بەپێوە وەستاوە، قیتو قۆزو بڵند سەری دەیدا لە ئاسمان، ئۆخەی دەکەیت، کوتە کوتی دڵت هێور دەبێتەوەو شەپۆلی پڕ کەفچڕینی خوێنت ناو جەستەت زێدە ناسکت دەنیشێتەوە، وەک ئەوەی بە زمانێکی نهێنی کە هەر خۆیتو منارەکە تێیبگەن پەیامی دڵنیایی خۆی لەگەڵ سۆزەی بەری بەیاندا دەنێرێت، وەلێ کە لەناو بالکۆنەکەوە بە چواردەوری خۆتدا دەڕوانیت خانووە چۆڵو داڕماوەکان ترسێکی کوشندە لەسەر پەڕەی ڕۆحت دەنیشێو تەواو بەر بیناییت لێڵ دەکات، هەر وەک ئەوەی هەر هەموو تۆزو خۆڵی خانووە ڕماوەکان لەسەر چاو و دڵی تۆدا نیشتبێت، چ غەمێکە کە نەتدەتوانی ژمارەیەک لەو خانەوادانە پاشگەز بکەیتەوە کە گەڕەک چۆڵ نەکەن لە ترسی چاو و ڕاوی مەسئوولەکان، یان شاگەشکە بە بەرتیلو پارەی ڕژاوی قۆنتەراتچیو خاوەن کۆمپانیاکان، یان بەخشینی هەر بەڵێنو حەزو تەماعێک بێت، یان هەڕەشەو گوڕەشەی ناو هێڵی تەلەفۆنە بێ ناوەکان، بێ ئۆقرەو غەمناک لە منارە تەنیاکە دەڕوانیت،

چەندە لە بێوەمێردێکی تەنیا دەچێت کە بێوەژنێکی تەنیا عاشقی بێت ، دەستەکانت لە تەختەبەندی هێشتا ساردی سەر بالکۆنەکە توند کردووەو ناخوازیت بەو هەموو خەمو قەهرەوە بڕووخێیتو لەوێوە سەرانگرێ بیت ڕووەو یەکێک لەو کەلاوانەی چواردەوری ماڵەکەی خۆت کە تاوەکو یەک-دوو مانگ لەمەوبەر پڕبوون لە زاقو زریقی زارۆکان، پرتەو بۆڵەو شاتەشاتی ژنە دەم بە هاوارەکان، سەردولکەی بە ئاستەم هەڵفڕیوی پیرەژنەکان تا ژێر بالکۆنەکەی، نەڕەنەڕی پڕ لە فیزاعی مێردەکانو هاتو هاواری لە ناکاو و شێتانەی کوڕو براکان، یان هەڵفڕینی ئاوازی گۆرانییەکان کە خۆشیو قریوە بخاتە دڵی کوڕوکاڵو کچە نەباڵقو سەروعوزر شۆرەکان، یان شینو واوەیلای ئازیز مردەکان، چ قەهرێکە ئەم گەڕەکە تێکڕا بار بکات .. نا .. ناکرێت .. چ جەنگێکی ڕەوایەو چ شەرەفێکی گەورەیە بۆ بێوەژنێکی وەک تۆ تەنیاو هێشتا جوانو جحێڵ چی خۆشی دنیا هەیە فریوت نەدات، چی هەڕەشەی بەرپرسە پایەدارەکان هەیە بیخەیتە ژێر پاپووجەکانت، گەر بە تەنیاش بێت نەهێڵیت ئەو چەند ماڵەی کە ماون بارگەو بنە تێکبنێنو بڕۆن، زۆر نەنگییە لەبەردەم ئەو نیوە پیاوو گەمژانەدا ببەزیت، سوێند بە سۆزەی بەیانیو شکۆمەندی منارەی هەتیوکەوتوو، بەڵام هێشتا بە پێوە وەستاو، مل نەدەیتو لە هیچ سڵ نەکەیتەوەو لە کەس نەترسیت...

لە دوورەوە ئەو ماڵانەت بینی کە هێشتا ئاوەدانو کەوتوونەتە ئەوپەڕی

گەڕەک تا دەگاتە ئەو دە-دوازدەماڵەی کە هێشتا چواردەوری تۆیان چۆڵ نەکردووە، خەندەیەک نیشتە سەر لێوانت، ڕۆژانە دوورو نزیک گڕەو ناڵەی ناقۆڵای بلدۆزەرو شۆڤلەکان خورپە دەخەنە دڵتەوە، بەوە ئاسوودەیت کە ئەو ماڵانە سوێندی شەرەفیان خواردووە چۆلی نەکەن ئەگەر شۆڤلەکان بەسەر سەر و سکی گەورەو بچووکیاندا بچەرخێن، ئەوەتا هێشتا لە ڕۆژێکی هەینیدا بێ خەمو ترس سرەوتوون، بێباک لەوەی چی لە مێشکی ئەو کەللەبەرانانەدا دەگوزەرێت، ئەو پیاوانەی شاریان لە کۆنکرێت نوقم کرد و باڵەخانە هەوربڕەکانیان ناهێڵن چیتر هەتاو وەکی جاران تاوەکو بنەبانی ژوورەکان و دڵ و چاوەکان تین و تاوی بێت. هێزێکی پەنهان لە خۆتدا دەدۆزیتەوە کە فیزو شکۆیەکی ژنانەت بداتێ کە وەک ئەو درەختانەی پیرە پاییز تەواو ڕووتیان دەکاتەوە، بە پێوە بوەستیت، وەک منارەکە کە زەبرو ستەمی زەمانە .. وەیشوومەکانی بنیادەمو ئافاتی سرووشتی دڕندە پێکەوە نەیانتوانیوە زەفەری پێبەرن، هەرگیز باکت بەوە نییە لەسەر منارەکەوە خۆت هەڵبدەیتە خوارێ گەر هەڕەشەی ڕووخاندنەکە ببەنە سەر.

تاوناتاوێک بۆن بۆگەنییەک لەو کەلاوانەوە دێت کە لە کەلاکی ئەو سەگو پشیلە کوژراوانەوە با دەیهێنێت کە هەر بە دەستی ئەنقەستو بۆ هەراسانکردنی تۆو ئەو خەڵکو خواهەی ماونەتەوە، کۆمەڵێک پیاو

و هەرزەی ملهوڕ دەیانکوژنو لەو دەوروبەرە کەلاکەکان فڕێ دەدەن، گوایە سەگو پشیلەکان هەڵگری دەردێکی نەزاندراونو کوشتنیان حەڵاڵە، سمە-ی سەگوژ شەوانە لەسەر تەلەفزیۆن بەوپەڕی شانازییەوە دووپاتی دەکاتەوە کە تەنیا خۆی دوو سەد سەگی تۆپاندووە، ئەو خانووانەی لە دوای ڕووخانەوە بوون بە گووفەک کە تا دەهات پڕ دەبوون لە زبڵو زار، چی خۆڵو خاشاکو پاشەڕۆکو گەندو گووی گەڕەکەکانی شار هەبوون کەس نەزانمو بە دزییەوە نیوەشەوان دەنێو ئەو کەلاوانەدا قلْپ دەکرانەوە، کەچی بۆنی خۆشو نەشئەبەخشی گوڵجارێک کە تۆ نازانیت تەنها لە خەیاڵی خۆتدا پەرشو بڵاویان دەکەیتەوە یان هەر بەڕاستی لەسەرزەمینێکی دوورەوە دێن تاوەکو ڕاوەدووی بۆنی زۆر ناخۆشی کەلاکەکانو سەرەنوێڵکەکانو کەڕەکیفەی ناو گووفەکان بنێن.

لە منارەکە دەڕوانیتو دەچرپێنیت و دڵی غەمینی خۆت دەدوێنیت .. ئاخۆ چی ماوە لە خۆشیو هەوەسی دونیا لە دوای ئەو هەموو دابڕانو مەرگی ناوادەو ساڵانی سیا .. لە چی بترسم؟ بێجگە لەو شەڕە شەقو شەڕە قۆچە چیم بۆ ماوەتەوە؟ پاشەکشێ بۆ؟ جگە لە تەنیایی خۆم چی دەدۆڕێنم؟ ئەوەتا هەر خشتێکی ئەم منارەیە بانگم دەکات کە ژنێکی جەربەزە بمو بیپارێزم .. پاسەوانی بمو دوژمنەکانی قاو بدەم، لێرەوە گوێم لە ورتەورتی ڕۆژوو شەوانەی بووە کە

درکاندوویەتی. من کە وەستاوم تا هەنووکە .. نەڕووخاوم .. هەڵگری ڕۆحی ملیۆنەهام .. بە هەزارەها شۆخی وەک تۆ لە سەردەمێکی دێرینەوە وەک ئێستای تۆ باڵاگەردانم بوون .. تا هەنووکەش رازو نیازو نمازی ئەوان وا دەنێو کەلێنی خشتەکانی ناو هەناوو باڵام .. مەگەر تۆ وادەزانیت درۆیەکە کە من پەرستگای چەندین خوداوەند بووم، هەر هەمووشیان وەک تۆ مێ بوونو لە مندا نیشتەجێ بوون .. پیاوە شمشێربەدەستەکانی خێڵە خوێنخۆرەکانی بیابان بەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە وەک ئافاتێکی ڕەش هاتنو پەرستگاکانی دامێنی منیان ڕماندو خواوەندەکانیشیان فڕاندو منیان تەنیا بەجێهێشت، ئێستاش هاوارو نەعرەتەی جەنگاوەرەکان و حیلەی ئەسپەکانیان و ورشە ورشی شمشێرەکانیان وا بەسەر سەرمەوە، وەرەو .. پڕ بە سییەکانت بۆنم بکە .. تا ئێستاکەش بۆنی جۆگەلەی خوێنم لێدێت کە لەو ڕۆژگارەدا بە چواردەورمدا کەفچڕینی چەمێکی سوور بەدەم فوارەی خوێنەوە سەری منداڵو پیاو و ژنی دەبرد ..!

لەو بەرەبەیانە جەرگبڕەی پاییزدا، نە شانشینی خوداکان ماونو نە پەرستگاکان، لەژێر بنمیچی هەورێکی مەییوی ڕەنگ قوڕاوی، باڵەخانە بڵندەکانی شار سامناکانە گەمارۆی منارەکەیان داوە، هەر وەک چەند کێلێکی تازە بەناو ئاسماندا ڕۆچوون، هەتا کە ساماڵیشە لە هەر چوار لاوە ناهێڵن هەتاو قەدوقامەتی منارەکە بشواتەوە، خانووە کۆنەکان

چکۆلەو داتەپیو بە ژێر سێبەری چڕو تاریکی ئەو باڵەخانانەوە بوون، هێشتا لە نێو کۆلیتو کولانەی داڕماوی ئەو ناوەدا دەیەها کەری تۆڕی و سەگە بەڕەللاو پشیلەی گەڕو جرجی خرت تەراتێن دەکەن، لەسەر شەقامەکەی ئەوبەر چەند ماشێنێکی تیژڕەو و مەردوومێک دەردەکەوتن، بە هەنگاوی سستو مردووانە، وەک بڵێی بەسەر شەقامو شۆستەکاندا ڕێ نەکەن، بەڵکو بەنێو ڕێگەیەکی پەنهانو بزری ناو خودی خۆیاندا بێنو بچن، لە ژێر سێبەری منارەکەشدا کۆمەڵێک پیاو و کوڕوکاڵ چکۆلەو جیقن مێرووله ئاسا دەجولێن، کە زۆربەی بەیانیان لەوێدا خڕدەبنەوە بە نیازو ئومێدی ئەوەی کەسێک بێتو .. وەستایەک، خەلفەیەک، بە فیزەوە ئاماژەیان بۆ بکاتو بیانبات تاوەکو نانی ئەو ڕۆژەیان حەڵاڵ بکەن.

چ بەیانییەکی خامۆشو بێ سرتەیە، کەچی درەختە بەرزو مەزنەکان نهێنییەکانیان دەچرپاندە گوێی تۆ و ئەم دونیا کەڕە، ئەو مەنگییە لە ناوئاخنی خۆیدا خەمو ترسو گێچەڵێکی هەڵگرتووە، چەندە لەوەش ناشیرینتر بێت، تۆ هەموو بەیانییەک دەستەو نەزەر دەوەستیتو بۆ هەمیشە چاوەڕوانی ئەو پڕشنگو تاوە سەیرو نائاساییە دەکەیت کە لەگەڵ کشانی خۆر بە ئاسماندا پەیامێکی نهێنی بۆ تۆ دەدرکێنێت، پڕشنگێکە لە دێرزەمانەوە ماوەتەوەو تەنها ڕۆحی تۆ دەناسێت، لە دەم کەلەوە دەبێت بە ئازاری گڕێکی سوور، بە دەوری منارەو

ماڵەکانو درەختەکانو .. گژوگیای ئەو ناوەدا گێژەڵووکەیەک دروست دەکات، وەک ئەوەی سروشتی ئەو دەوروبەرە لە گرانەتایەکی بێ کۆتایی خۆیداو لە یەک ساتەوەختی زۆر کورتدا گڕ بگرێتو شێتانە ڕووەو ڕۆحی تۆ بفڕێت کە ساڵانێکە عەشقو جوانییەکو سیحرێکی پەنهان بەردەوام تیایدا بەندکراوە.

ئەوەیان نوێژی بەیانی تۆیە لە بەرامبەر منارەکەتو نەدەکرا لە یادی بکەیتو قەڵلای بکەیتەوە، لەو پڕشنگە سوورە ڕادەمایت کە شەبەنگێکی سەد ڕەنگی بەسەر سەرتەوە ڕادەگرت، خەم دایدەگرتیت کە نەتدەتوانی بەدوایدا وێڵ بیت، ڕاڕاو غەمگین دەتپرسی ئاخۆ دەگەی بەو پڕشنگەی کە بۆتە نواڵەی دەوری سەری منارەکەو نەهێڵێت هەرگیز بکوژێتەوە، چەند ڕقت لەو دەنگە ترسنۆکەی ناخی خۆتە کە جارجارە پێت دەڵێت:

( (هەرگیز .. هەرگیز ..!))

دەزانی ئەمەیان سەرەتای کۆچێکی ئەبەدییە، نەک ڕووەو مەنزڵگا دوورەکان، سەفەرێکە بە جەنگ دەستی پێکردو.. بە جەنگ کۆتایی دێت، ڕووەو نادیار کە پێت شەرمە بترسیت، هێشتا سەرەتای کۆچەکەیەو کەچی وایت لەناو گۆڕەپانێکی خوێناویو دەگیرێیت و بۆ ناو دونیای بەرفراوانی هەزارەها شتو ڕووداوی لەبیرچوو ڕاتدەکێشن، ئاودامان خوێن، کەچی چاوت لەو پڕشنگە بڕیوەو کە ئەگەر چاوەکانت

بتروكێنیت، پڕشنگەكە دەكوژێتەوە..

هەستت لە كپیو خامۆشی دەوروبەرت ڕاگرتبوو..دەنگی بە ئاستەمی بێدەنگی، لە نادیارەوە ترپەی هەنگاوەكانیت دەبیست .. چەندین ساڵە نەتدیوە .. یان وەك ئەوە وا بوو هەرگیز نەتدیبێت، بەڵام دڵنیا بوویت جگە لەخۆی كەس نییە، چ سەیرە كە لەگەڵا پیربوونی ئەم پایزەدا دێتەوە..لە پایزێكدا كەوتە سەر ئەژنۆ و عیشقی خۆی بەیان كرد و ..پایز بوو سەری خۆی هەڵگرت و جێیهێشتیت ...بەر لەوەی بڕوات بەڵێنی ئەوەی دابوو پێت كە جارێكیان زۆر بە ئاسانی وەك بایەكی شێت و شەیدا دێتەوەو تاریكی شەقار دەكاتو لەودیو كێو و بەندەن و ئاسمانەكانەوە هەڵدەفڕێ و بەدیار دەكەوێو لە تەكتا دەوەستێت..

( (وەلێ ئەفسووس .. هەرگیز ئەوەندە جوامێر نەبوو!؟))

هەمیشە بەدەم خۆخەریك كردن بە وردە ئیشو ئەركی ناو ماڵەكەوە، ماڵی بێوەژنێكی تەنیا، لەودیو شووشەی ڕوونو خاوێنی پەنجەرەكەوە دەڕوانیتە منارەكە كە هەموو دیوارە ئاوێنەبەندەكەی بەسەر ئاسمانو منارە خۆشەویستەكەت كراوەتەوە، تا ئێستا بۆ یەك جاریش دڵت نەهاتووە پەردەكان دابدەیتەوە نەبا هیچ كامیان هەست بە تەنیایی بكەن، لەوەتەی «هۆمەر» فەوتی كردووە سێ جار چوویتەتەوە ماڵە

باوانو .. یەک شەوو بەپەلە گەڕاویتەتەوە، هەر سێ شەوەکە منارەکە وەک پیرەپیاوێکی پشت کۆم هاتە خەونتو گلەیی لێت کرد..
((بۆ بە تەنیا جێمدێڵیت؟ بۆ چراکانی ماڵەکەت کوژاندۆتەوە .. خانمەکەم؟ گوڵدانی ناو بالکۆنەکان بە من ئاو نادرێت، تریفەی مانگو جریوەی ئەستێرەکان دادم نادەن .. هیچ نەبێت چراکان خامۆش مەکە ..!))

لە دواهەمین سەرداندا منارەی تاین ئەوەندەی چنگێکی لێ مابۆوەو سەروگوێلاکی شکابوو .. ئەوەندە قەمبوورو چەما بۆوە و کەپووی بە عەردەکەوە نووسابوو بەدەم قرخەقرخەوە گلەیی کرد..
((خانمی گەورەم .. تۆ بۆ کێ بەجێمدێڵیت ..؟ بەناوی کۆتر کوشتنەوە پاسەوانەکانت بە گوللە سەرو کەللەم دادەبێژن، هەموو ئازای جەستەم زامارەو ئەو شەوەی بزانن تۆ دەڕۆیت تاپڕو ساچمەزەنەکان دێنو هەموو گیانم وردە ساچمەی ئەو تفەنگچییانەی تۆن.))

لە قەفەزە بەتاڵەکان ورد دەبیتەوە کە بوونەتە دیکۆرێکی ناو بالکۆنەکەو بە بنمیچەکەدا شۆڕ بوونەتەوە .. سەیرە .. جاروبار چۆلەکەو ڕیشۆڵەو پەڕەسێلکە لە دەروازە بەرتەنگو چکۆلەکانەوە خۆیانی تێدەپەستنو دەکەونە باڵەفڕەو هەر وەک ئەوەی بە گەمەی خۆ بەندکردنو پاشان خۆ ئازادکردن لە قەفەزەکاندا نهێنییەکو ڕازێکی

پەنهان بۆ تۆ بدرکێنن، دوای مەرگی هۆمەر بە دوو ڕۆژ هەر هەموو مەلە چکۆلەو جیقنەکانی ناو قەفەزەکانت ئازاد کردن، بولبوولەکان بە ئامانو زەمان لە قەفەزەکانەوە نەهاتنەدەر وەک ئەوەی لە باشووکەو شەهێنو بازەکانی ئاسمان بترسن، ناچار بە زۆردارەکی هەڵتدان بۆ ئاسمانو کەچی لە چاوتروکانێکدا واشەیەک زەفەری بە یەکێک لە بولبوولەکان بردو تێیوروکاو لەنێو چنگیدا ونی کرد .. جار نییە قەفەزەکان مەرگی ئەو بولبوولەت وەبیر نەهێننەوەو دڵت ژان نەکات. هەوای قەفەز کوشندەو .. ئاسمانیش پڕ لە واشەو بازو هەڵۆی بڕندە ..

هەندێک جار دەمەو بەیان، جار هەیە .. نیوەڕۆ یان سەروەختی کەوتنی زەردەپەڕ هەناسەت سوار دەبیت وەک ئەوەی خۆت لەناو قەفەزەکەدا بیتو هەواش کوشندە .. یان وەک کەنارییەک لەناو چنگی هەڵۆیەکدا بخنکێیت .. بەربینی خۆت دەشێلیو زار دەکەیتەوە بۆ کەمێک هەوای پاک، تۆ بڵێیت ترس و دڵەڕاوکێ بێت لە هاتنەوە لەناکاوی «بەهرام» ..بەڵێنە دەمەو نیوەڕۆ میوانی تۆ بێت.. گەڕانەوەی کۆنە یارێک لە دوور وڵاتەوە کە ڕەنگە لەگەڵ خۆیدا هەر هەموو دەروازەکانی دۆزەخ بکاتەوە .. دۆزەخی یادگارە ڕەشو تاڵەکان، هەڵەتەبوونو عەشقی نابووتو ناسینی هۆمەر و مەرگو هەقایەتی نەبڕاوەی ڕووخانو نەڕووخانی منارەکە.

یەکەمجار لە باخەکەی خاڵە هەباس-ت ئەو پیاوە چەلەنگەت بینی کە سێ چوار خێزانی بنەماڵەکەی خۆتانی بۆ داوەتێکی شاهانە بانگ کردبوو، ئەو باخەی کە چەندەها ژوانی شیرینی تۆ و بەهرام-ی دیبوو، بە درێژایی ئەو «زیافەتە شاهانەیە» کە ئەم وا وەسفی خوانو قەڵەباڵغییەکەی دەکرد، «هۆمەر»ی کەلەکەوێت چاوەکانی لە تۆ نەدەتروکاند، نیگا مەستەکانی بەدەم پێک هەڵدانەوە.. نیگەرانی کردیت، تۆ هەموو خەیاڵت لە جێگەیەکی دیکە بوو، ناو کەپرەکە .. ئەو کەپرەی دوا ژووانو دیداری تۆو بەهرام-ی بینی، ئەویش وەک یەکێک لەو مەلانەی ناو قەفەزەکان هەڵوەدای فڕینو هەڵاتن بێت، فڕیو .. ئەم ئاسمانەی بەجێهێشت، بە درێژایی دانیشتنەکە ملّچە ملّچ هەر هەمووان لە خواردنو خواردنەوە نەدەکەوتن، باسی هەموو شتێکیان دەکردو باسی هیچیش نەبوو .. یان تۆ لەوە غەمناکتربووی .. لەوە بێ خەیاڵتر کە بزانیت لە پشت ئەم هەموو غەڵبە غەڵبەوە چ ماناو نیازێک هەیە، لەو کچانەش بووی کە کەمترین زەوقیان بە میوانو سفرە ڕازاندنەوە بێت، بەجۆرێک دڕدۆنگ و مۆن دەبووی کە نانت پێ نەدەخوراو وەک گیانلەبەرێکی کێوی ناو قەفەزێک سەیری یەکە بە یەکەیانت دەکردو بە درۆ کەوچکت بەناو قاپەکاندا دەگێڕا، زانیت کەمێکی دیکە بمێنیتەوە دەدەیتە پڕمەی گریان، هەمیشە سۆزێکی غەمهێن زۆر بە ئاسانی دەتخاتە سەر قوڵپی گریان، دەیانوت

وای لەو هەوا خۆشەی ناو ئەم باخە، بۆ تۆ کوشندەتر بوو لە هەوای ناو قەفەز، هەنگاو بە هەنگاو پێدزکەت دەکردو خۆت لە زریک و هووڕی منداڵەکانو قاو و قیژی ژنەکانو دەمەتەقێی گەرمی پیاوەکانو کوڕە لاوەکان بە دوور دەگرت کە حەپولکی یەکتریان نەدەدا. بە بیانووی میز پێکردنی «پەری»خوشکە چکۆلەکەتو بێئاگا لەوان لەناو دار خۆخەکاندا خۆت بزر کردو ئۆخژنێک بە دڵتدا هات، دەستی خوشکەکەت گرتبوو خێراتر لەوە هەنگاوت دەنا کە کچە بچکۆل بتوانێت پێ بە پێی تۆ بڕوات، لە شتێک ڕاتدەکرد کە نەتدەزانی چییە، بەدەم ڕەوتێکی شپرزەوە سەرت نەوی دەکرد نەبا لقی درەختێک چاوە پڕ لە فرمێسکو غەمینەکانت زامار بکات، بۆنی غەریبیت لە خۆڵو هەواو هەتاو و میوەی سەر درەختەکانیش دەکرد، پەری چکۆلە زوو زوو دەنگی دەدایت کە هەڵیبڕیت تا بە دەستە وریدیلانەکەی خۆی خۆخێک لێبکاتەوە، ئارەزوویەکی وا بە تینو تاو لە دڵی ئەو کچە بچکۆلەیە سەرسامی کردیتو خۆزگەت خواست کە هەرگیز گەورە نەبوویتایەو وەک ئەم سادەو بێ خەیاڵ تاکە ئارەزوویەکت لێکردنەوەی خۆخێک بووایە، ئەوسا زیندەگی چەندە خۆشو ئاسان دەگوزەرا، چەندە بێ گریانو تلانەوەو چاوەڕوانی دەبوو...

لە دوورەوە هێشتا ژاوەژاو و هاتو هاوارو قریوەی هەر هەموویان تێکەڵو تواوە دەگەیشتنە گوێت، دەتویست دەنگو هەراو قریوەی دایکت لە هی

خوشکەکەت جیا بکەیتەوە، هی خاڵت لە باوکو براکانت، گوێت قوڵاغ کرد، لەناکاو کپیو هێمنییەک هەموو ئاسمانی سەر باخەکەی داگیر کرد، لەوە دەچوو یەکێکیان قسە بکاتو هەموویان گوێ بگرن، تۆ دوورتر دەکەوتیتەوە تا ئەو هەراو زەنایە بمرێت، بە تەنها دەنگێک .. پاشان قاقایەکی بڵندو ناقۆڵا لە دوورەوە دەهاتو ڕاوەدووی دەنایت، زرنگەیەکی کەرخو تەواو نامۆ بە ڕۆحت کە زرنگانەوەیەکی پڕ لە کەیفو هەواو هەوەس بێنێتو گێژەڵووکەیەک لە چواردەورتو بەرپێت دروست بکات، قاقایەک کە دەتوت لە قەراری بیرێکی تاریکەوە دێتو چون ئاوێکی ڕەش سەر دەکات، ئەوەیان قریوەی نێرانەی «هۆمەر؛ بوو کە لێوانلێو بوو لە شەهوەتی دیدارێک کە تۆزێک لەمەوبەر ڕێکەوت سازی کرد، لەبەر پێتدا دەتەقییەوەو هەوای دەخستە سەر لەرزە لەرزو باڵندەکانی سەر درەختەکانی دەتەراندو چەندین خۆخ وەک ئەوەی بترسێن یان تەواو گەییو بن کەوتنە سەر خۆڵەپۆکەکە، دوورتر .. هەنگاو بە هەنگاو ئەو دەنگو سەداو قاقا بڵندو ناسازە بە دواتەوە بوو، کە زانیت خۆخەکان گەییون خوشکەکەت هەڵبڕی تا بە دەستە چکۆلەکەی خۆخێک لێبکاتەوە، کەچی نەیدەتوانی .. ناچار بە چنگی گەورۆنەت چنگە چکۆلەکەی ئەمت بە خۆخەکەوە تەوق کرد تاوەکو هەست نەکات تۆ لێتکردۆتەوە، شاگەشکە بوو .. تۆش خەنیتەوەو داتگرت ..

کە هۆمەر هات هەر هەموو کەسو کار بە مناڵو مەزنەوە لەبەری

هەستان، مشکیو جەمەدانی تێکەڵی، مرادخانی بەری، پێڵاوە تازە بۆیاغ کراوەکانی بریقەیان لە چاوان دەدزی، سمێڵی پڕی کە لە ژێرەوە بۆیەکەی کاڵ ببۆوە سەرنجی ڕاکێشای، تەزبێحی سەوزو قل گەورۆنەو کارەبایی ناو دەستە گەورۆنەکانی، نیگای هەوەسبازو چاوگێڕانی پڕ بە دڵی بە قەدوبالای تۆدا لە نیگای ئەو ڕاوچییانە دەچوو کە پەنجە دەخەنە سەر پەلەپیتکەی تفەنگو تاپڕو ساچمەزەنەکانیانو بۆ تەماعی پێکانی کۆترە شینکەیەک یان کارمامزێک، چاویان پڕ دەبێت لە خوێن، چاوەکانی وەها سووربوون کە سپێنەی لە رەشێنەی جیا نەکرێنەوە، دەمانچەکەی کە بە لاقەدییەوە شۆڕو گران کەوتبووە سەر پشتێنە گوڵ گوڵییەکەی دڵتی پڕکرد لە کسپەو خورپەی ناوادە، لەناکاو دڵت وەک دڵی چۆلەکەیەکی بەندکراو دەنێو چنگی هۆمەر-دا، دەففەی سینەی ساواتی دەکوتا، لەو دەستەپیاوە ڕێکپۆشو دڵتەڕانە دەچوو کە تا دوا هەناسە واز لە خۆشیو کەیفو سەفای دونیا ناهێنن و تارمایی مەرگ هارتریان دەکات بۆ ژیان، تۆ لە ترسی نیگای شێتانەی ئەو پیاوە نەوسنە کە چڵێسیی لە دەمو لێوییەوە دەباری ولیکی دەکرد.. دەستی پەری-ت گرتو خۆت لەناو باخی پڕ لە میوەجاتەکە بزر کرد، بە یادی بەهرام-ی خالۆزات چوویتەوە لای ئەو دار تووەی کە بە دەستی خۆی لەسەر قەدی ئەو پیرە درەختە ناوەکەتی هەڵکۆڵیبوو، کە وردتر سەرنجت لێدا، پتر لە برینێک دەچوو کە زۆر دەمێک بێت قەتماغەی گرتبێت ..شادی..چەندە ناوەکەتی

خۆشدەویست، وەک سۆفییەک لەناو خەڵوەتی خۆیدا زیکر بەناوی زاتی ئیلاهییەوە بکات، لەبەر خۆیەوە سەد بارەی دەکردەوە ..شادی .. شادی .. تا تۆ دەستت دەخستە سەر دەمی .. کەچی لەژێر لێوەوەش وازی نەدەهێنا، چاوەکانت پڕبوون لە ئەسرین، پەری چکۆلانەو زیت .. بەدەم قەپگرتن لە خۆخی تووکنەوە سەری هەڵدەبڕی تا بزانێت بۆچی ئەوەندە ماتیتو نایدوێنیو وەڵامی پرسیارە سادەکانی نادەیتەوە کە دەیەوێت بزانێت درەختەکانی ناو ئەم باخەو مەلەکانی .. زیندەوەرە هەڵاتووەکانی بەر پێیەکانتان .. هەر هەموو ئەو شتانەی چواردەورتان کە سەرسامیان دەکات .. ناویان چییە...

بۆ یەکەمین جار کە بەهرام بەناو سێبەری درەختەکاندا تۆی هێنا تا ناوەکەی خۆت بەسەر قەدی ئەم پیرە دارتووەدا ببینیت.. شاگەشکە بوویتو خۆت هەڵدایە ئامێزی، ئەم نێرانەو بیژمۆتانە هەلەکەی قۆستەوە دەمو لێوی لە لاڕوومەتت نزیک خستەوە بە تەماعی خزان تا سەر لێوانت تێدەکۆشا، کوڵمەکانت وەک خۆخە لاسوورەکان گەشانەوەو بە شەرمێکەوە کە دڵشکانی ئەمی بەدوادا هات خۆت ڕاپسکاند. وای لەو چارەنووسە ڕەشەی کە وای کرد ئەم بکەوێتە ئەودیو حەوت کەژو کێو و .. زەریاوە، جەنگیش تەواو بوو .. لێرەو لەوێ تاکو تەرا هەواڵی کوڕو براو مێردی هەڵەتەو ونبوو لە دوور وڵاتانەوە دەگەیشتنەوە ناو کەسو کار، چ بە نامەیەک یان تەلەفۆنێکی قاچاغ، ڕۆژانو شەوانی

نەبڕاوەی چاوەڕوانی لە ڕۆحتی دەخواردو کەچی دەنگو هەواڵێکی خۆش یان ناخۆش لە کۆنەیاری دوورو سەرگەردانەوە نەهات، چرپەو فسکەفسکی کەس‌و کار دڵتی پتر کرمێ دەکرد، بەڵام وەک کچێکی بە شەرم‌و شکۆ پێت ئەستەم بوو ئەوەندە بێ ڕوو بیت لە ژنێک یان پیاوێک بپرسیت کە نە خۆی و نە خانەوادەکەی وشەیەک نادرکێنن تاوەکو دڵت ئاو بخواتەوە، دایکە خەمخۆرەکەت زەبوونانەو مایەپووچ کە وا دڵ پڕ لە کەدەر دەتبینێت .. کزۆڵە لە ژێر لێوەوە سەد بارەی دەکاتەوە..

((کچەکەم .. کە بنیادەم کەوتە غەریبی ..هاتنەوەو نەهاتنەوەی لە کۆشی غەیبێدایە ..!))

خۆت بە پێوە نەدەگرت‌و ئەژنۆکانت دەلەرزین، کەوتیتە سەر چیچکان، چاوەکانت لە پەری دەشاردەوە کە خۆخێکی گەییو لەناو چنگە چکۆلەکەی جێگەی نەدەبۆوە، دەبوو وریای هەنگاوەکانت بیت کە پێ لە خۆخە گەنییو و نیمچە گەنیوەکان نەنێیت کە بە چواردەورتەوەو لەو ناوە بە گۆڕێ وەربوون، بێناز دەنێو خۆڵەپۆکی ژێر درەختەکان کەوتبوون، ئەو خۆخانەی لە ترسی پیربوونی بەپەلەی پاییز، خێراو لەناکاو هەر بە درەختەکانەوە گەنی بوون، خۆخەکان واهین.. کتو پڕ سەرماو بای کوێستانان دەیانترسێنێت، هەر زوو دارتووەکەت بەجێهێشت‌و بە ترسەوە ئاوڕت دەدایەوە، بیرت نایە لە کەنگێوە

نەتوێراوە ڕوو لەم باخە بکەیتو برینەکانت بکولێنەوە ..
((خودا هاوار .. بۆ نەتکوشتم؟))

لەوەتەی ئەم باخەت ناسیوە هەرگیز ئەوەندە پەژموردەو خۆلاویی‌و غەمگین نەتدیوە، ئەو خۆڵبارانە هەناسەی دارو درەخت و بنیادەم و باڵندەکان و هە هەموو زیرۆحێکی تەنگ کردووە .. وای لەو هەموو خۆخە خراپو گەنیوە کە کرم تێیداون .. چییە؟ ئەو سێوە گەڕو کرمۆڵانە؟ گوایە هەوا ژەهراوی بووە .. دووکەڵی ئەو هەموو شەڕوشۆڕە ئاسمان‌و زەوی بۆگەن کردووە .. بۆ نا؟ بێتام‌و ڕەنگ بواردوو .. پووکاوە، چ ڕۆژگارێکی بێتام‌و بۆیە، ئەوسا کە بەهرام سەرقافڵەچی کەیف‌و سەفای هەمووان بوو، گەورەو بچووکی کۆدەکردەوەو دەیکرد بە هەللاو بەزمورەزمێک نەبێتەوە، دەبوو هەر هەمووتان لە یەکەم بەری خۆخ‌و هەنجیرو سێو و هەڵوژەو هەرمێ‌و تووەکان بخۆن، بە دزی هەموانەوە بە گوێتدا دەیچرپاند..جا خۆخەکەی بۆ من بێ ..ئەی سێوەکەی بۆ کێیە؟ کە دەیزانی سوور هەڵگەڕاویت .. دەتریقایەوەو دەیوت..
((ئەوە کوڵمە .. یان سێوە لاسوورەیە .. غەزەب .. چەندە لە خۆخێکی گەییو دەچیت کە ئەگەر زوو فریای لێکردنەوەی نەکەوم .. بێناز دەکەوێتە سەر خۆڵەکە.))

چەندە بەم غەزەلانەی دڵت دەگوشرا کە لە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانەوە

دەیدزی و دەیدا بە گوێی تۆدا..هەنووکە بیری ئەم شتە بێتامانەشی ناکەیت..چیتر نەتدەتوانی فرمێسکان ڕابگریتو لە خوشکە بچکۆلەکەتی بشاریتەوە، لە حەژمەتانا خۆخەکەی لە دەست کەوتە خوارێو بەپەلە بۆت هەڵگرتەوەو پاکت کردەوەو غەمگینانە بە قورگی نووساوەوە دووبارەو دە بارەی دەکردەوە:

((دادیل .. دادیل .. بۆ دەگریت؟ دادیل گیان بۆ دەگریت.. بۆ..؟))

چمکی کراسەکەتی دەگرتو ڕایدەکێشا، تاو نا تاوێک بە دەستە چکۆلانەکەی فرمێسکی دەسڕیت، ئەو دەستەی کە هێشتا بۆنی خۆخەکەی لێدەهاتو تووکی سەر پێستی خۆخەکە وەک سەری دەرزی دەچەقییە سەر کوڵمەکانت کە ئەم بەناو لەپ فرمێسکەکانتی دەسڕییەوە ..هێشتا دەنگو قاقای دێوئاسای ئەو پیاوە غەریبە دەگەیشتە گوێت، لە وەختی سڵاو و خێرهاتن نیازی بوو بە بیانووی تەوقەکردنەوە دەستت بگوشێت ، تۆ خۆت لە گێلی دا، هەستایتەوە سەر پێ بەو نیازەی تا ئەوسەری باخەکە بڕۆیت تاوەکو ئەو قاقاو هەڵڵایە بمرێتو نەگاتە گوێت، کەچی پێچاوپێچ بەناو ئەو هەموو درەختانەدا سەر هەوا دەکەوتو دەهات، وەک مارێکی بە فیشکە بێتو خۆخەکان لە ترسانا بلەرزنو لەتەک گەڵا تۆزاوییەکاندا پەژموورەدەو سیس بکەونە خوارێ، ئەو قریوەو هاتو هاوارە کە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی باخەکەی دەدا .. درەختەکانی غەمگینتر کرد، لەناکاو بە

زرمەی تەقینەوەیەکی ناقۆڵا کاس بوویت کە وایکرد بە سەدەها باڵندەی کێوی فریای فڕین نەکەون، بۆ تاوێک لە ترساندا سینگوڕکیان لە زەوی دەخشاندو کوێرانە خۆیان بە قەدو لق و پۆپ و گەڵای درەختەکاندا دەداو بڵندو بڵندتر ئاسمانی ئەو باخەیان جێدەهێشتو چۆڵیان دەکرد، کپو خامۆشو بێ جووکەو چریکەی خۆشخوانی فڕندەکان باخ بە تەنیا جێدەما، بە بەر چاوتەوە خۆخێکی زۆرو نیمچە گەییو و گەنیو ڕژابوون کە خەمێکی قووڵو پەنهانی دەخستە دڵتەوە، خۆخێک کەوتە بەرپێیانت کە لەلایەکەوە تاسەر ناوکەکەی قەڵشتی بوو، ئانو سات بۆنی باروتت دەکرد، هەوا هێشتا شێتو پڕ هەراو شەقژنی گوللە بوو، خۆخەکەت هەڵگرتەوەو لەو کونە ڕامایت کە لە برینێک دەچوو کە کەوتبێتە ناو دڵی خۆخەکەوە، قووڵ قووڵ کرمێکی زەردباو دەجووڵاو بەقەد قووڵی ئەو برینەو پتریش لە ناوەوە لە خۆخەکەی خواردبوو، ئەو خۆخە کرم تێکەوتووە گریانێکی خنکاو و پەنهانی دەتەقاندەوە، کرمی تاین خۆی دەشاردەوەو ڕۆ دەچووە ناو هەناوی خۆخەکەو لە تاریکیدا خۆی حەشار دەدا .. وەک کۆششێک بۆ مانەوەو زەفەر پێنەبردن .. تەواو .. مەحاڵە بێتەوە .. دڵت دەیوت سەفەری هاتو نەهاتەو هەرگیز نایدۆزیتەوە، هەتا گەر بێتەوە، بەسەر وێرانەو کاولە ئاشێکدا دەگەڕێتەوە .. بەسەر دڵێکی پارەپارەو ڕۆحێکی تاریک.

ئەمجارەیان کچە بچکۆلیش زریکاندیو وەک کرمەکە دەیویست لە

باوەشتدا خۆی بشارێتەوە .. وای .. هەنووکە چەند لە خۆخێکی لە دار داکەوتوو .. هەڵواسراو بە حەواوە، تۆز لێنیشتوو .. گەنیو .. کرم تێکەوتوو دەچیت .. هەنووکە .. ئاهـ .. ئاهـ ..
دەستڕێژێکی دیکەو شەقژنی گوللەکان شێتی کردیت، دیسانەوە قاقا کابرا لە دوورەوە پێدەکەنیو گوێت لە هەلهەلەی ژنێک بوو، زریکەی جەرگبڕی پەری، کسپەو خورپەی دڵی خۆتو تەوژمی بە تاوی خوێن تا نێو گلێنەو سەری پەنجەکانت شەپۆلی دەدا، ئەمجارەیان هەستت کرد نزیکترە، وەک ئەوەی لوولەی دەمانچەو تاپڕەکان و توتووەکان لە پەنا گوێتەوە بتەقن، هێشتا هی ئەوە نییە ئەو هەموو گەڵا ڕژاوە لەگەڵ هەنگاوی بەپەلەت هەڵفڕن، ئەو هەموو خۆخە ڕزیوە کە بەناو خۆڵو وردە بەردو گەڵا وەریوەکاندا وەک چەند دڵێکی ترسنۆکو ڕاکردوو .. بریندارو پووکاوەو کرم تێچوو غل دەبوونەوەو لە ژێر پنچکەکانو ڕەگی درەختەکاندا دەگیرسانەوە، هەندێکیان دەکەوتنە ناو قۆرتو جۆگەلەو سەر ئاو دەکەوتنو لە چاوان ون دەبوون. گوللەیەکی دیکەو .. دووانو سێو .. دە .. ئەوەندە نزیک کە ڕاچەنیت، تۆ بڵێیت باوکو براکانو خاڵو نێرینەکانی بنەماڵە لەتەک ئەو میوانە ڕەزا قورسە شەڕو گێچەڵیان لێ بوەشێتەوە؟ ئەو پیاوە کێ بوو؟ بۆچی چاوەکانی وەها خوێناوی بوون ..؟ نا .. هیچ نەبووە .. ئەوەتا بەدەم شەقژنی گوللەکانەوە لە قاقاو خەنین ناکەوێت، ئەوجۆرە پیاوانە حەزیان لە فشەو خۆ پفدانە، لەوانەیە بیەوێت بە هەواداو بەم تاپڕ تەقاندنو

قاقاو ئاگربارانەدا پەیامێکی پەنهان‌و ڕازێکی نێرانە بنێرێت، لەوانەیە نیشانە بگرنەوە بەو مەرامەی کامەیان دەستی راستە، کە یەکەیەکە لە جێبەکانیان دابەزین هەر هەموویان دەمانچە بە لاقەدییانەوە بوو .. لە سندووقی کراوەی پشتی جێبەکان ساچمەزەن‌و تاپڕ و کلاشینکۆف و توتوو و بڕنەوەکانیان دەردەهێنا .. لەتەک کێسی بیرەو ویسکی و ڤۆدگاو تروتفاقی خواردنەوەو سەرگەرمکردن، وەک کەڵەشێری سەر بارەدار کە حەز لە قووقەی خۆیان بکەن قرتە قرتیان بوو، خۆیان گیڤ دەکردەوە، لەوەدایە وەک لە سەیرانگاکاندا باوە بۆ کەیفو سەفاو نیشانە لە گۆزەو دارو بەردو پاکەت‌و شقارتە کەللەشەکر و بگرنەوە، لەوە دەچێت تەنها ئەویش نیشانەکان بشکێنێت، ئەگینا بۆ تەنها ئەو قاقا غەریب و ناسازە دێتە گوێت؟ خۆ لەوانەشە نیشانە لە کۆترو کوکوختی‌و چۆلەکەو فڕندەکانی سەر درەختەکان بگرنەوە، وات هەست دەکرد کە دیسانەوە هەر ئەو کابرایە نیشانە دەپێکێت‌و بەدەم فڕینەوە یەکەیەکە مەلەکان دەکوژێت، خەیاڵت بۆ ئەوە چوو کە بە قەد خۆخە هەڵوەریوەکان باڵندەی پێکابێت، بۆنی گۆشتی برژاو تێکەڵ بە بارووت چواردەورتی تەنی بوو، چەندە دوورتر تا ئەوپەڕی پەرژینی باخەکە ڕاوی ڕۆحی خۆت دەنێیت، ئەو بۆنی بارووتە تێکەڵ بە گۆشتی برژاو ڕاوەدووت دەنێت، ئەم بۆنە تێکەڵە هەمیشە لە هەموو کوچەیەکەوە دێت، سەرت هەڵبڕی‌و بە ئاسمانەوە مەلەکانت دەبینی کە دەپێکران و گەردەلوولو تۆزو بایەک لوولی دەدان و

لە بەرزاییەوە ڕووەو ناو باخەکە سەرانگریێ دەبوون، دوعات دەکرد هیچ کامیان نەکەونە بەر پێت، ئەمەیان چ سەیرانێکە کە ئەوەندە پڕ لە دووکەڵو بارووت و مەلی کوژراوە؟ دەمێک ساڵە خۆت لە شاییو سەیرانەکان دەدزیتەوە، هەمیشە کە هێشتا کچێکی پارچەلە بوویت، دوای گەڕانەوەت لە شاییو سەیرانەکان بەدەم جل داکەندنەوە هۆن هۆن دەگریایت، نەتدەزانی ئاخۆ هەموو کچان سایلی تۆ دوای گەڕانەوە لە شایی و سەیرانەکان دەگرین یان هەر تەنیا تۆ دڵا غەمینیت، وەک ئەوەی لە پرسەی ئازیزێکی خۆتدا گەڕابیتەوە نەک بەزمو ڕەزمو شایلۆغان، هەر دەڵێیت خۆت پاییزیتو ئەم باخەت زەرد کردو ڕەوتت ڕەشەباهێنەو گەڵاکان بە بانی سەرەوە دەفڕێنێت، شەقژنی تاپڕو ساچمەزەنەکان، قاقای نەسرەوت، میوەجاتی گەنیو .. یادی بەهرامو سۆزی جودایی .. بەدەم بای غارەوە بێئاگا لە خۆت دەستی خوشکەکەت بەردەداو .. لەناکاو دەگەڕایتەوە سەریو پەلیت دەگرتو ڕاتدەکێشا، دەتویست وەک پەپوولەیەکی سرکو خۆشبەز بەناو دارو دەوەنو پنچکو قۆرتەکاندا بکەوێتە باڵەفرە، هەردووکتان هەم دەترسانو هەم ئەم غارغارێنەتان پێ خۆشتربوو لە گریانو شیوەنی ژێر دارتووەکەو خۆخەکان، پەلەپەلی گەیشتنە ژێر کەپرەکەت بوو، جێژوانی چەند جارەی خۆتو بەهرام، چ بە دزیو چ بە ئاشکرا، بەرلەوەی سەری خۆی هەڵبگرێت سوێندی خوارد بەو چوارسەدو چوار دارخۆخەی ناو باخەکە کە هەر دەبێت بگەڕێتەوەو بتخوازێت .. وەلێ

تەواو .. گوزەشت .. هەزار ئەفسووس ..
( (خودا هاوار .. بۆ نەتکوشتم؟))

ئانو سات بەرلەوەی بچیتە ژێر کەپرەکە .. کوکوختییەک پێکراو کەوتە بەر دەمت، تکاو پاڕانەوەت بێ هوودە بوو کە نەتدەخواست مەلێکی پێکراو ببینیت، ساکایت کسپە لە جەرگتەوە دەهات، نووشتایتەوە .. هێدمەگرتی بوویت، پەری زیکاندیو کەوتە لووشکەلووشک، چڵمو لیکی تێکەڵ کرد، ئەمیان یەکەمین جاری بوو مەلێکی پێکراو ببینێت، پتر خۆی بە تۆوە دەنووساندو قەستی بوو لە ژێر باڵی تۆدا خۆی بشارێتەوە، کە دەستت بۆ برد هێشتا خوێنی گەرمی سارد نەببۆوە، باریکە داوێکی خوێن لە دەنووکییەوە تا بەرملی جۆگەلەی کردبوو کە هێشتا قەتماغەی نەگرتبوو، هەڵدەلەرزیو هەردووکتان بە دیار ئەو باڵدارەوە دەگریان، وەک ئەوەی خۆتان کوکوختی بنو پێکرابن، توند دەستی چەپت خستە سەر سەریو باسکت ئالاندە هەر هەموو جەستە چکۆلەکەی، دەنووک کراوە بۆ هەناسەیەکی خنکاو .. دڵی لە ترپەو لێدان کەوتبوو، بە پەنجەکانی دەستی ڕاستەت کۆششی ئەوەت بوو جێ ساچمەکە لە لەشی وردیلەو هێشتا گەرمی بدۆزیتەوە، گەندەپەڕێکی زۆر بە دەستتەوە هەڵدەوەرینو با دەیبردن، خشەخش دەنێو لقو پۆپو گەلای درەختەکاندا چەند فڕندەیەک بەدەم جووکەجوکی پڕ لە ترسەوە خۆیان دەشاردەوەو نەدەوێران ڕووەو ئاسمانی پڕ لە بۆنی بارووت

هەڵبفڕن، هاتو هاوارو قریوەی پیاوەکان نزیکتر دەکەوتنەوە، دیاربوو بەدەم پەلاماری شرپشێتانەو غاردانو هانکەهانکی هەناسە تەنگییەوە جانەوەرئاسا لقو پۆپی درەختەکانیان دەشکاندو نەدەپرینگانەوە، غەڵبەغەڵبێکی تێکەڵ، گەرچی دەنگی نامۆو ناسازی کابرات لە دەنگی براکانت جیا دەکردەوە، وەک تارمایی چەند بەڵایەکی ناگەهان بە پرتاو دەهاتن، بە خۆیانو تاپرو ساچمەزەنەکانیانەوە، سەرمەست بەو ڕەشە ڕاوەی لە ئاسماندا بەرپایان کردبوو لە حریتە حریت نەدەکەوتن، خاکو خۆخو سێو و هەرمێو گەڵاو گوڵیان دەپلیشاندەوە، هەر زوو .. یەکاندەر دوو خۆت گەیاندە ناو کەپرەکە، پەریێ-ت لە ئامێز کردبوو .. خۆی بە سینەو مەمکتەوە قرساندبوو، دەنێو چڵو چێوی وشکەوەبووی دیواری کەپرەکەوە چاوت لەوەبوو تەنگەتاو بەدوای مەلی پێکراودا دەگەڕان، بێئاگا لە خۆت کوکوختی خوێناوی تەکە تەک بە دەستێکتەوە شۆڕببۆوە، ئێوەش هەردووکتان لە دوو کوکوختی دایکانەو بێچووەکەی دەچوون کە لە ترسی ڕاوی ئەو پیاوە نەوسنو گۆشتخۆرانە نەتاندەزانی بۆ کوێ بفڕن، هەستو خوستتان لەخۆ بڕیبوو، هەناسە بە سینەتان تەنگو دڵەکوتێ جەستەی هەردوکتانی دەهەژاند، گەرمی لەشی کوکوختییەکە وایدەکرد مەزەندەی ئەوە بکەیت کە کوکوختی تاین لەنێوان مەرگو ژیاندا ڕاماوە، لەوانەیە لە خەونی نێوان فڕینو نیشتنەوەدا بێت، خۆ گەر بمرێت گمەگمی غەمگینی کوکوختییەک لەم باخە پەژمووردەیە کەم دەبێتەوە، تۆ

بڵێی نەمانی گمەی کۆترو کوکوختیو جریوەی پاسارییەک چی لەو ئاسمانو زەوییە بگۆڕێت؟ تۆ بڵێیت باخچەکانو دارستانەکان هەست بە مەرگی مەلەکانیان بکەن؟ ئەوکاتەی باڵندەکان دەپێکرێنو دەمرنو نایەنەوە ناو هێلانەی سەر درەختەکان .. لە چی کەم دەکاتو چی دەگۆڕێت؟ ئاخۆ باخو جۆگەلەکانو گەڵاو گوڵو چرۆکانو خودی ئاسمان چ غەمێک دایاندەگرێت؟ سەیرە .. لەوەتەی دونیا .. دونیایە .. مرۆڤ وازی لە ڕاو نەهێناوە، ڕاوی یەکدی بێت یان فڕندەکانی ئاسمانو گیانلەبەرە کێوییەکانی سەر زەمینو ماسیو نەهەنگەکانی ناو چۆمو ڕووبارو زەریاکان، دایکە دەڵێت .. تەواو کاولیان کردووە .. لەوەتەی ئەو هەموو پیاوە تفەنگ بەدەستو ملهوڕانە پەیدابوون، مەلەکانی ئاسمانو ئاژەڵی کێوی ناو کێو و دەشتەکان لە ترسی ئەو ڕەشەڕاوە کۆچیان کردووە، گوایە لە سەردەمێکی زووتردا ئاسمانی ئەم شارو وڵاتە پڕ بووە لە فڕکە فڕکی و باڵ چریکەی مەلان .. ئاسکە کێوییەکان تا بەرماڵەکان دەهاتنو نەدەترسانو نەدەپرینگانەوە.

سەیرە .. هەر دەڵێیت سەردەمی بەردینەو پیاوە کێوییەکان لە کونە ئەشکەوتەکانەوە هاتوونەتە دەرێو بە دوای مەلێکی پێکراودا عەودالن، مشتومڕی زەلامەکانو پشوو تەنگیو مشەمشیان، سوێند خواردن بە تەڵاقو گۆڕی شەهیدان، لە قریوەکەوتنو گەڕان بە دوای مەلێکدا کە ناکاتە پارووەکی هیچ کامیان، دڵساردیو دەست بە یەکدادان.. من

خۆم بینیم کە پێکراو کەوتە ئەم ئاقارەوە، پشیلە فڕاندوویەتی، بە گۆڕی شەهیدان گوونی پشیلەکانت بۆ ئاگر دەدەم، من ڕاویان بکەمو پشیلە بیانخوات، سەلامەت بیت کەس بە بڕنەو ڕاوە کوکوختیو کۆتری کردووە؟ ئەی تاپڕو ساچمەزەنت بۆ هێناوە؟ من بۆ خۆشی و میزاج حەز دەکەم چی چەک هەیە بیتەقێنم..بۆ بەراز کوشتنو کەمتیارو ڕاوی کەڵەکێوی و کۆترو کەویش.. چاوت ڕەشکەو پێشکەی کردووە، هەر تازە لەوێندەرێو لەبەر چاوت سێ دانەم نەپێکا؟ دەرزیم بۆ دانێ .. هەڵیدەگرم .. حەیفو خەسارێ. بە شەرەفی هەموومان کە ڕاوە دوژمنمان دەکردو پێشمەرگە بووم، هەر بۆ خۆشی گۆزەی سەر شانی کچانم شکاندووە، گەر منت دەبینی کە چۆن جامی سەری عەسکەرەکانم هەڵدەگرت .. فڕەفڕی چۆلەکەیەکی دایکانە کە بێچووەکەی فێری فڕین دەکرد وێڵی کردنو بەدەم غەڵبەغەڵبەوە نەهاتنەوە سەر ڕێگەی کەپرەکە، دەست لەسەر دڵ لە شەیتانو ڕەحمان دەپاڕێیتەوە نەتاندۆزنەوە، بێئاگا لە خۆت چنگت بەسەر مەلی مردارەوەبوو توند کردبوو، کە هاتو هاواری نێرەوزەکان دوورکەوتەوە، ڕوانیت چەند تنۆکێکی خوێن ڕژاونەتە سەر لبادە نەخشینەکە کە تاکە ڕایەخی ناو ئەو کەپرەبوو، کە لە ونبوونی پیاوەکان دڵنیا بوویت لەسەر چیچکان ڕوونیشتیت، کوکوختییەکەت داناو کەوتە سەر پشت، باڵەکانی کراوە وەک ئەوەی هێشتا شەیدای فڕین بێت، پەری هەر پێتەوە نووسابوو، نەیدەویست خۆی لە سینەو

بەرۆکت بکاتەوە، هێشتا هەنسکی هەڵدەدا، ناچار چوار مشقی لەسەر لبادەکە پان بوویتەوە، وەک کەسێکی ئازیز مردە پەری‌ت ڕادەژەند، ڕژانی تنۆکە خوێنەکانی کوکوختییەکە چ ڕۆژگارێکی هەم خۆش‌و هەم ڕەشی پژانی خوێنی خۆتی خستەوە یادت، ئەو لبادەی خوێنەکەی تۆی هەڵمژی وەک ئەمەیان نەخشین نەبوو .. ساف سپی‌و لە چوارگۆشەوە بە ڕەنگی شین چوار نەخش کە لە پەلکێکی پان دەچوون، دوای هەفتەیەک لە سەفەری «بەهرام» وەک میراتی عەشقێکی دۆڕاو و خوێناوی لە ژوورەکەی خۆتدا تەقەتت کرد، هەمیشە پیاسە خۆش‌و عاشقانەکانی ئێوە بەدەم شەڕە خۆخ‌و سێوەوە کە دەتانگرتە یەکدی تا ئێروکانەی دەهێنان، خۆخەکان نەرمتربوون لە سێوەکان، ڕێکەوتی ئەوەی دەکرد یەکێکتان خۆخێک، سێوێک بەر لا ڕوومەت یان سەرو سینەی بکەوێت‌و ببێت بە مایەی لاواندنەوەو ماچی دڵنەوایی‌و ئاشتبوونەوە، هەر هەموو پیاسەکان بۆ مەرامێک بوو کە بەهرام نەیدەگەیشتێ، تا لە دوا پیاسەدا زەفەری پێبردیت. هەر هەموو پیاسەکە وەها عاشقانە بوو کە باخەکەی پتر دەگەشاندەوە، لێکحاڵیبوونێکی پەنهانی دروست دەکرد، گەرچی وەک هەر کچێکی نائاشنا بەسۆزو ترساو لە هەر تەماسێک سووکێ دەستی خۆت لەناو دەستی بەهرام ڕادەپسکاند، وشکی‌و بێزەوقییەکت دەنواند، دەترسایت لە شتێک کە خۆیشت نەزانی چییە، سڵەمینەوەیەک بوو لەو موچرکانەی لەسەری پەنجەکانتەوە تا ناو کەللەی کاست مێرووڵەی دەکرد، ئەوەش

لە نێرینەیی ئەمی دەداو توورەو درِدۆنگو مۆنتری دەکرد بەڕادەیەک کە بە قەهرەوە شەق لەو بەردانە هەڵبدات کە دەکەوتنە بەر نووکی پێڵاوەکانی، لەناوەوە خوێنی دەکوڵاو کەچی بە درۆ خۆی هێورتر پیشان دەدا، تۆ نەتدەویست بە ئەنقەست کڵپەی شەهوەتێک لەناخی ئەودا دابگیرسێنیت، هەمیشە هەستت دەکرد کە دەستێکی نادیار بەر لەشت دەکەوێت، هەرجارەو پارچەیەک.. کە زۆر جاران لەسەر گەردیلەیەک، خانەیەک یان خاڵێکدا چڕ دەبۆوەو پاشان ئەندام بە ئەندامی دەتەنییەوەو تا دواجار هەر هەموو جەستەتی داگیر دەکرد، جار بە جار لەو بایە دەچوو کە تاوێک فێنکت بکاتەوەو پاشان بتخاتە سەر هەوایەکی گەرم، بایەک کە ئاسان لە ژێر جلەکانتەوە خۆی پف بداتو پەرت بێتو کەس هەستی پێنەکات، کەچی بتخاتە سەر جۆشو خرۆشێک، دەترسایت و دڵت پەراسووەکانی دەکوتاو کەچی مەستانە چاوەکانت دەنووقاند، هەر ئەو ترسە بوو کە وای لێتدەکرد هەر جارەو بە فێڵێکو بیانوویەکو درۆیەکی کچانە یەکێک لە خوشکو برا بچکۆلەکانت بخەیتە دوای خۆتو ژووانەکان تێکبدەیت، هەر ئەو جارە کە هەردووکتان پێکەوە بوون.. پتر سامت لێنیشت، هەر بە سەلیقە زانیت ڕووەو کەپرەکە دەتبات، بێئاگا لە خۆتانو بەسەر پنچکو دەوەنو گیاو گۆڵێکدا هەنگاوی خێراتان دەناو سەدەها زیندەوەری تۆقیو دەنێو کونو کەلەبەرەکاندا لە ترسی هەنگاوی هاری ئێوە خۆیان دەشاردەوە، شنەبایەک لە ڕووخساری هەردووکتانی دەدا کە

بۆنی چرۆکانی دەهێناو فێنکی دەکردنەوە، زوو زوو دەستت دەگرتو لەسەری پەنجەکانییەوە تەزوویەک بە هەموو شادەمارو دەمارە دەزوولەییەکانی لەشتدا شەپۆلی دەدا، دەستێکی نەرمو تەڕ بە ئارەقەی سۆزو شەرمو ترسێک.. ناسکتر لەوەی بەهرام بوێرێت بیگوشێت، تۆ بە چ حەیبەتێکەوە لێوەکانت دەکرۆشت، ئەو هەموو ئارەقەو جواناوە لەکوێوە دەهات؟ تۆ بە شەرمەوە سەرت خستە سەر شانیو زانیت لاوونیو سەیرت دەکات کە هێشتا بە تاسووقەوە لێوەکانت دەکرۆشت، بە تەریقییەوە وازت لەو لێو کرۆشتنە هێناو جێگەی ددانەکانت بەسەر لێوە تەنکەکەتەوە ڕیزە چاڵێکی شیرینی بەجێهێشت کە خوێن بە تاو و خێرا پڕی دەکردنەوە، بێئاگا لە خۆتان لقو پۆپی درەختەکان دەیدا لە سەرو دەمو چاو و شانو ملتان، بەدەم چرپەو هەناسەبڕکێوە گەیشتنە ژێر کەپرەکە، هەر وەک نێچیرێک یان قوربانییەک گران هەنگاوت دەناو خۆت دەگرخاند وەک ئەوەی پێشبینی تیغێک بکەیت لەسەر گەردنی خۆت، لەنێوان ترسو لەزەتدا لە پەلو پۆ کەوتیت، بێئاگا لە خۆت وەک کەسێکی نیوە خنکاو ڕاکشایت، بۆ تاوێک کە درێژەی کێشا نەتدەتوانی هیچ ببینیت، وەک ئەوەی شەرم کوێری کردبیت یان هەتاوێکی بەتین چاوەکانی پێ داخستبیت و پێڵووەکانت لێکبنێیت، زۆر لە دۆخی چوونە ناو خەو و خەونێک دەچوو، هەر ئەو دەستە نادیارە کە دەیەها جار بەر شوێنێکی پەنهانی ڕۆحت دەکەوت، بەر پنتێکی نادیاری لەشت کەوتو لە حەیبەتدا

ڕادەچەنی، چەندە بوێرانەو .. بەڵام نەرمو لەسەرخۆ بە هەر هەموو کونو کەلەبەرو گۆشەی جەستەتدا سەفەری دەکرد تا دەگەیشتە سەر پەڕەی ڕۆحی سەراسیمەو هەم پەژموردەت، وەک زیندەوەرێکی بێ زیان ژێر جلەکانت دەگەڕا، دەقاو دەق وەک ئەوەی بترسێتو ئەو زیندەوەرە سستو هێشتا هێمنە لەتەک جووڵەیەکی ئۆدا هاربێتو بتگەزێت یان ژەهری کوشندەی خۆی دەنێو خوێنتدا بڕێژێت، هەر لە سۆنگەی ئەو ترسەدا نەتدەوێرا بجووڵێیت، تەواو هەستو خوستت لەخۆت بڕی، دڵت کوتەکوت تاوی دەسەندو لەوەدا بوو لە دەففەی سنگتەوە بێتەدەرێ، چوارپەلو بڕبڕەی پشتو تەوێڵت ئارەقیان دەردا، سۆزێکی گەرم چاوەکانتی تەڕکرد، بەهرام پتر دەشڵەژا .. ناچار دە جاران سەرو پرچو چاوەکاتنی ماچ کرد .. ئاخر بۆ .. چی بووە .. بۆ؟ ماچەکانت لێ خۆش دەهاتن، وەها مەست بوو کە فرمێسکەکانتی دەخواردەوە، ئەمەیان هەرگیز عیشوەو ناز نەبوو. خەمێکی کچانە بوو کە مەحاڵ بوو پەی پێ ببات، ئەم پتر لێوەکانو کوڵمەکانتی بە فرمێسکەکانەوە هەڵدمژی، کەوتە دوای جۆگەلە فرمێسکەکان کە دەڕژانەوە هەر دوو لالێوو خونچەی دەمەکەتی پتر ئاو دەداو دادەخزا تا قۆرتی چەناگەت، وەک زیندەوەرێکی تینوو .. زەبەللاح بکەوێتە ناو پیاڵەیەک هەنگوین، شیلەی زارتی هەڵمژی، ئەوەیان کە تەواو لە شەرمدا نوقمی کردیت و تەریقبوونەوەیەکی کچانە شلو کوتی کردیت.. بووی بە پەڕۆ، هەناسەی لەبەر بڕیت، وەها

کوشندە بوو ئەو شلبوونی دەمارانە کە دەماری پشتتی بەزاندو تنۆک تنۆک میزت بەخۆتدا کرد، ئەوەندەی دیکە لە شەرمو شکانێکدا دەمردیت و پتر خۆت تەڕدەکرد، هەموو خەیاڵت لای ئەو دەستە بوو کە خودا هاوار نەگاتە سەر ئەو تەڕاییە، دەستەکە وەک زیندەوەرێکی نەسرەوتو بزێو و هار خۆی تەنکو تەنکتر دەکرد، باریکتر وەک داوە دەزوویەک تاوەکو ژێر پێستە پاکەکەت بگەڕێت، سەرچاوەی خوێنە گەرمو گەشەکەت بدۆزێتەوەو تیایدا مەلە بکاتو لێی بخواتەوە، بەڵکو ئەوە خوایە بگاتە ناو دڵتو دوورتر لەوەش بڕوات تا دەگاتە سەر پەڕەی زۆر تەنکی ڕۆحت، دەگەڕا .. دەگەڕا .. نەرمایییەک بدۆزێتەوە، درزێکو کونو کەلەبەرێک تاوەکو لەوێوە ئاسان بچێتە ناو شادەمارێک یان دەمارێک باریکو دەزوولەیی، بێ خەمو هێواش، بەپەلەو چرپنانە دەگەڕا، شپرزەو سەرلێشێواو، تازە تەواو .. نەتدەتوانی بجووڵێیت، چونکە نەدەکرا بزانیت لە ژێر ئەو کەپرەدا چی لە چواردەوری لەشی ڕاکشاوتدا دەگەڕێتو چی ڕوودەدات، تازە لەوە درەنگتر بوو فریای خۆڕاتەکاندن و خۆ ڕاپسکاندنێک بکەویت .. تەواو .. گوزەشت، نەتدەتوانی زار بکەیتەوە یان ببزویت، گوێ تەپو زار لە گۆ کەوتوو .. بینایی لێڵ، زیندەوەرەکە گەورۆنەتر دەبوو چون لە سەرچاوەی خوێنێکی دەخواردەوە، تا دەهات پتر سەدەها پێو پەلی لێ دەڕوا، سەدەها شاخو زمانو زاری لێدەڕسکا، تۆش لە هەزار لاوە گەمارۆ درابوویت، لەوە دەچوو کەڵبەو زمانی ئاوێتەی هەنگوین و شیر بڕێژن

کە ئەوەندە شیرین بێت .. شیلەی شەهوەتێک لە خوێندا پتر کەف بکاتو تاڵی خۆی بەو شەکراوە بکوژێت، ژەهرێک کە لەوە دەچوو ئەوەندە برسیو تینووت بکات کە چی لەسەر زەوی هەیەو چی بە دارەوەیە بیخۆیت، کەچی هێشتا هەر تێر نەبیت، ئاوی کانیاو و ڕووبارەکانیش تینوویێتیت نەشکێنن، لەنێوان سێبەرو هەتاودا جۆلانەت دەکرد، لەنێوان ئاگرو بەفردا سەمات دەکرد، لەنێوان خەوو بێداریدا گەمەت دەکرد، مارئاسا بەدەم زمان دەرهێنانەوە دەستەکانی دەگەڕا .. دەگەڕا لە خاڵێک، لە گەردیلەیەک کە شکانی تەلیسمەکە لەوێدا چڕبووبێتەوە، دەگەڕا لە بەرزیو نزمییەک کە لەنێوانیاندا سیحری چێژێک خۆی حەشاردا بێت، شەپۆلی شەهوەتێکی خەوتوو بێدار بکاتەوە، بەنێو پێدەشتی تەڕی ئەو لەشەدا دەگەڕا کە دەتگوت سروشتێکی زیندووەو سیحرێک چاوەکانی پێ لێکناوە، نەرمو شیرین دەگەڕا کە پتر هەوای گەرمی ژێر پەنجەکانیو ناو لەپی بوو بەر پێستی پاکت دەکەوتو دەیخستیتە سەر لەرزەلەرزێک .. هەر دەگەڕا لە شوێنێک .. لە پنتێک کە هەموو هەستو نەستەکانی لەوێدا مەیی بن، دەیزانی گەر نەگاتە ئەو پنتەی بۆتە جوغزی ڕۆحو لەشت کە هیچ بەرزەخێک نامێنێت، مەحاڵە بتوانێت لەو خەوە خۆشە بێدارت بکاتەوە، هەواو هەتاو پێکەوە پیلانیان دەگێڕا کە ئەو جەستە بێباکو ڕاکشاوەت دەست لەخۆی بشواتو فریوی گەمەیەک دوور بیبات، لەتەک هەر ڕاچەنینێکدا دەتزانی خەریکە لەو زنەیە نزیک دەبێتەوە کە

سەد کانی لەزەت لەو لەشو ڕۆحەدا دەتەقێنێتەوە، وەک ئەوە وابوو فشاری شێتانەی جۆگە ئاوێک لە ژێر سنگی زۆری شاخەکاندا بۆ خاکێکی نەرمین بگەڕێت تاوەکو بەدەم تافەتافەوە بتەقێتەوە، هەر دەتوت ئەم بەو تەماسە هارو ئاگرینەی ڕاوەدووی ئەو جۆگەلە ترسنۆکە دەنێت کە پێچاوپێچ بەناو خۆڵو بەردو ڕەگی درەختەکاندا ڕێگەیەک بۆ خۆی بکاتەوە، ئەو جۆگەلەیەی کە بەفر بووەو بە گەرمی هەوەسێکی ئاگرین تواوەتەوەو دڵۆپ دڵۆپ بەردی شاخە وشکو تینووەکان هەڵیانمژیوە، تنۆک تنۆک لە یەکدی بزر دەبوون، کە هێشتا کلوو کلوو دەبارین وەک ئەوە وابوو کە پێشبینی ئەوەیان کردبێت پێکەوە لە سەرچاوەیەکی دیکە دەتەقنەوە، ئەوە بە تەنها دەستەکانی ئەم بوو کە بانگی هەر هەموو تنۆکەکانی کرد کە لە خاڵی خاکێکدا .. لە پنتی لەزەتێکدا کۆببنەوەو پاشان لە زنەیەکدا بتەقنەوەو تۆی سووتاو لەناو شەتاوی شێتی سەرچاوەیەکی پاکدا بشۆنەوە .. وای لەو دەستانەی کە چەندەها شەو خەونی پێوە بینیون، بۆ یەکجارو بۆ دواجار وەک تەقینەوەی زنەیەکو داڕژانی لەبەر هەتاودا چاوەکانت کرانەوەو دەبریقانەوە، کانییەکی سەرشێتو ڕاکردوو بەتاو دەهات، سەری دەکێشا بە داروبەردو ڕەگی تێکئالاوی درەختەکان، ئەویش تینووتر لە ڕێبوارێکی وێڵی ناو بیابانێک دەمی پێوەناو تا مەستبوونو گەیشتن بەو سنوورانەی ژیانو مەرگ تیایدا یەکدی ناناسنەوە، تیژ بەلای یەکدیدا تێدەپەڕنو لە یەکدی قاچاغ دەبنو هیچ کامیان ئاوڕ لەوی

دیکەیان ناداتەوە، ئەوساتەیە کە چەندە نزیکن، هەزار ئەوەندە دوور لە یەکدی دەکەون، چەندە بێدارو زیندوو دەبنەوە، ئەوەندە پتر لەناو یەکدا خنکاون، هەر یەکەی بە توولەڕێگەیەکدا دەڕواتو لەنێو دارو دەوەنێکدا خۆیان ون دەکەن، لەوێدا کە مەحاڵە حەز نەکەیت فریو بخۆیت، وەک ئەوەی لە چۆلەوانی بیتو دەم بە نزاوە تکاکار بیت کەسێک بێتو تاڵانت بکاتو بتدزێت .. بتدزێتو تا ماویت لە خۆیدا بتشارێتەوە، لەوەدەچوو گوێت لە ڕەگی تینووی درەختەکان بێت کە لە بنی چینە بزرو شاراوەکانی ناخی زەوییەکی ڕەقەندا ڕۆبچن و بگەنە سەر ئاو و کارێزە خەوتووەکان تا تەڕبوونی دوا دەماری گەڵا وشکو سیسبووەکان لەو ئاوە سازگارە بخۆنەوە، ڕوو لە ئاسمان هەورێکی ئاوس بە بارانت دەبینی کە تا سەر کەپرەکە دادەخزاو خۆی نەوی دەکردو ئاوپڕژێنی دەکردیت، وەک دەنێو کەژاوەدا بن سێبەرو تاریکی بۆ دەهێنان کە ئەو کەمە شەرمەی ماوە بە تەواوی داینێن، هەر دوو دەستی هاری دەگەیشتنە ناو جۆگەلەکان، شێتو هەڵوەدا لەناو ئەو حەوزە شینەدا پەلت دەکوتاو ڕاوەدووی ماسییەکی سوورو سرکت دەنا کە ڕاوکردنی وەها ئاسان نەبوو، شاگەشکە بەو سەدەها مەلەی لەسەر درەختەکانی چواردەوری کەپرەکە، لە جووکەو چریکە نەدەکەوتن، ناچارو سەرمەست وەک زنەیەکی خنکاو تەقیبێتەوە .. پڕ بە هەناو و ڕۆحی پەژمووردەو وشکی خۆت تەڕ تەڕ دەبوویت..

چەند جارێک ناڵاندت، بەدەم لەزەتەوە بووبێت یان ئازارێک کە هەرگیز

لەمەوبەر هەستت پێنەکردبێت، وەک تەرک لەسەر پشت کەوتبووی، ئەم هێشتا دەمی لە شیلە چەقی بوو، باڵەکانت کرابوونەوە وەک مەلێکی پێکراو، هێشتا لەوە سڕتر بوویت بزانیت ئەو برینە ئەبەدییەی نێوان هەردوو ڕانت برینێکی دیکەی تێبۆوە کە مەحاڵە سارێژ بێت، پڕ بە هەردوو چنگت خۆڵت کۆکردبۆوە، نە هەورەکە سەر کەپرەکەی بەجێدەهێشتو نە مەلەکانی سەر درەختەکان لە خوێندن دەکەوتن، ئەمجارەیان خوێندنەکەیان خوێناویو غەمهێن بوو، زۆریش تینوو بوویت، ئەوەندە تینوو کە زمانت بە بن مەلاشووتەوە نووسابوو، بە عەزرەتێکەوە نالاندت..

((تینوومە .. خەریکە دەخنکێم!))

ئەم هەر بێئاگا بوو لەو داوایە، خۆی وەک ئەوەبوو بەسەر ئاوەوە بێتو سەرگەرمی باسکەمەلە بێت، هێشتا هەر لەناو گۆمە شینەکە بوو ..

((ئاگرێک لە هەناومەوە تا کەللەی سەرم دەمسوتێنێ))

قەستی دەکرد خۆی بخاتە ناو زەریایەکەوە تا ئەو ئاگرە بکوژێنێتەوە. ماندووانەو بێباکانە بە سەدای سەنگینی نێرینەیەکەوە زاری کردەوەو فەرمانی پێتکرد:

((هەستە .. خۆت کۆکەرەوە!))

هێشتا ماسولکەکانت تورتو ژانێک کە بەر موسوڵدانتی ئاگردەدا،

وەها کوشندە کە نەوێرێت هەر دوو قاچی بڵاو و ڕاکشاوت بجووڵێنیت، هەر دوو باسکیشت ئەوەندە قورس بوون وەک ئەوە بوو کە لە قورقووشم گیرابن. لەناکاو مەلەکان خامۆش بوون، درەختەکان بەدەم بای وەشتەوە کە لە باکوورەوە دەهات لە گەڵاکان ڕووت دەبوونەوە. نەتدەوێرا چاوەکانت بکەیتەوە، لەوە دەترسای شتێک ببینیت کە لە هەموو ژیانت ترساویت بیبینیت.

( (هاوار خودایە .. یان بمکوژە ..

یان ئەوەیان خەونێکی ناخۆش بێتو هیچی تر ..!))

( (منیش .. ئەوەم نەدەویست.))

وەک ئەوە وابوو لە خەوێکی ناخۆش بێداربووبێتەوە یان خۆی لە تاوانێکی گەورە بدزێتەوە دەستی لە گەردنتەوە ئاڵاندو لەبەرخۆیەوە دووبارەی دەکردەوە کە بیبووریت...

( (من ئەوەم نەدەویست.))

وەک خۆ پاککردنەوەی گوناهبارێک لەبەردەم مەزارێکدا کە داروبەردی ماچ بکات، ماچی دەکردیت و دڵی دەدایتەوە، بە نیگایەکی وێڵو شێت ئاسا هەموو جەستەی

تۆی بە دوو چاوی خوێنینەوە دەپشکنی، خوێنێکی زۆر لە دەوری گوڵەکەی نێوان هەردوو ڕانت پەرت دەبوو، ماچەکان وەک کوتە گۆشتێکی جنراو لەنێوان لێوەکانت جێدەمان، خوێنێک لەسەری زمانت یان لێوەکانتەوە تامێکی سوێری دەگەیاندە بن مەڵاشووت، تەڕاییەکی

گەرم لە خوێنو ئارەقەی تێکەڵ سێگۆشە تاریکو کوتراوەکەی خوار مووسڵدانتی دەخستە ژێر نمە و خوناوێک، لە دەرەوەش چڕی تاریکیی هێرشی دەهێنا بێئەوەی بزانیت چەندە تێپەڕیوە بەسەر زەردەپەڕی ئێوارەدا، تەواو بێئاگا بوویت لەو جێگۆڕکێیەی نێوان ڕووناکیو تاریکی، بەزەحمەت پێڵووەکانت بۆ هەڵدەهات، دەستەکانت دەلەرزین، بەهرام لە تەنیشتتەوە وەک تەرک کەوتبوو، بەدەم هەناسەبڕکێوە زەحمەت هەناسەی دەدا، وەک ئەوە وابوو بۆ خۆشی لەسەر پشت درێژ بووبێتو هاتووە لە ژێر کەپرەکەدا وەنەوزێک بدات، دەستێکی بێ جووڵەو سڕ جێماو لە ژێر سەری کاسو پڕ ترسی تۆ، ترسێکی کچانە لە دۆڕاندنی شتێک کە لە منداڵیتەوە زەندەقیان بردوویت نەیدۆڕێنی، دەبوو هیچ گەمەیەک نەکەیت هەڵبەزو دابەزی تێدا بێت.. ڕاکردن و غارغارێن بڤەیە.. سواری پاسکیل و کەرو پەت پەتێن وگەمەکردن لەگەڵا هەتیوو مەتیوی بیژمۆت.. هەر هەمووی مایەی لە دەستدانی ئەو پەردەیەیە کە یەکە سەرمایەی کچانە..»بێ-بن-بوون» کردنەوەی هەموو دەروازەکانی دۆزەخە لەسەر خۆت و تایەفەت.. تازە تەواو .. گوزەشت.. واوەیلا بۆ حاڵت... هەتا درەختەکان کە تاوێک لەمەوبەر لەناو شەماڵێکدا دەشنانەوە، کەچی ورشەی گەڵایەک نەدەهاتە بەرگوێ، وەک ئەوەی دوا شەوی پاییز بێتو دوا گەڵایەک بە درەختەکانەوە نەمابێ، پتر لە تارمایی تاریک دەچوون تا لە درەخت، بە دزییەوە بۆ تاکێک لە گوارەکانت دەگەڕایت کە لە گەرمەی ڕامووساندا

پچڕابوو، هەڵوەشابۆوە .. کەچی هێزت نەبوو خۆت کۆ بکەیتەوە، ئەو مەستیو مڕبوونەی دوای رامووسان حەزی ئەوەی خستە بەر دڵی بەهرام کە دەستی لە ژێر شانو ملی تۆدا دەربێنێو زۆر بێباکانە وەک نێرێک کە ڕاوێکی بردبێتەوەو ئەم لە نماییشێکدا بێ، جگەرەکەی ئاگرداو بەدەم مژێکی قووڵەوە سییەکانی پڕکرد لە دووکەڵو سەری بڵند کردو بە بای کرد، هەرگیز ئەم دیمەنە لە ڕاستی نەدەچوو .. هەرگیز، هەستایە سەرپێو لە کەپرەکە چووە دەر تاوەکو سەیری تاریکی بکات، تاوێکو گوێت لە شوڕە شوڕی میزکردنەکەی بوو کە درێژەی کێشا، دوورتر کەوتەوە وەک ئەوەی خۆی لە تاوانێک بدزێتەوە یان بزانێت کە کچێک بایی ئەوەندە شەرمنە کە زات ناکات لەبەرچاوی کوڕێکدا نیوە ڕووت خۆی کۆبکاتەوە، یان تەریقبوونەوە لەوەی کە بوو..کە روویدا.. ناهێڵێت بجووڵێت، جلەکانی بەرتو پێڵاوەکانت بەو ناوەدا تووڕ هەڵدرابوون، دەبوو تا زووەو جگەرەکەی تەواو نەکردووە بەپەلە پڕوزێ فریا بکەویت، لە کووپەکەی ژێر کەپرەکەوە بێباک تنۆکە ئاوەکان بە ئیقاعێکەوە دەڕژانە ناو قاپولکەیەک کە هەوایەکی غەمینی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، کە هەستایتە سەرپێو کشایتەوە، خوێنێکی زۆر ڕژابووە سەر بەڕەکەی ژێرتان کە مەگەر خوێنێکی وا زۆر بەتەنها لەسەربڕینی کاریلەیەک یان قازێکەوە بڕژێت، سەرت سوڕماو بۆ تاوێک تاسایت، پاشان بیرت کەوتەوە ئەم بەیانییە بەدەم سک ئێشەوە بێداربوویتەوە، درەنگ زانیت کە ئێستا سەروەختی خوێن

بینینی خۆتە کە دایکە ناوی ناوە بێنوێژبوون، کەمەکێ ئاسوودە بوویت کە هەرچی بێت ترسی ئەوەت نییە ئاوس بیت، نەخۆش ئاسا جلەکانت لەبەر کرد، ئەو ترسەی لە منداڵییەوە ڕژابووە ناو خوێنت ئێستاکە کەفی دەکردو دەمارەکانتی دەسووتاند، ترسی بێ بن بوونـ ی .. گوناهـ .. گوناهـ .. گوناهـ پڕ بە هەوای خنکاوی ناو سینەت هاوارێک بوو شێتی دەکردیت، هەستت کرد جلەکانی بەرت ناتوانن داتپۆشن و هێشتا هەر ڕووتیت، تاریکی دەمەو ئێوارە ناتشارێتەوە، بەدەم قوڵپی گریانێکەوە تکات لێدەێکرد کە نەیەتە ژێر کەپرەکە تاوەکو خۆت کۆدەکەیتەوە، بە شکانی کچێکەوە کە هەموو سەرمایەی پاکیزی و پەردەیەکی تەنکە هەر دوو دەستت لە خۆڵو بەردی ژێر کەپرەکە وەردەداو فرمێسک نەیدەهێشت هیچ ببینیت یان چڕی تاریکی ژێر هەورو هێڵێک کە هیچ بارانێکی پێ نییە، هێزی ئەوەی نەبوو جامێک لە کووپە ئاوەکەوە هەڵێنجێتو زاری وشکەوەبووی تۆ تەڕ بکات، لەوەدەچوو بەهرام دوورکەوتبێتەوە، دوورتر لەوەی کە بە جامە ئاوێک فریات بکەوێت، کە هەنگاوت دەناو لەشت بەدەم لەرزینێکەوە کە هەر لە لەرزینی گرانەتا دەچوو هەناوتی دەردێناو ناوکتی دەخست، هەر هەنگاوێکو خوێنێکی خەستو مەییوت لێ دەڕژا...

*

هەر لەم شوێنەدا بوو، لەسەر لبادێکی سپی پات کە تا ئێستاکەش ماکی خوێنەکەی بەسەرەوەو ئەوەندە کاڵ نەبۆتەوە ئەو یادگارە دوورو

غەمینەت لەبیر بباتەوە، ترسی جەنگو ڕژانی ئەم هەموو خوێنە بوو دەنێو کوشتارگاکاندا یان ڕژانی ئەو گۆمە خوێنەی دامێنی تۆ کە هەڵەتەو دەربەدەری وڵاتو شارانی کرد، دوای یەک مانگ لەم خوێن پژانە بوو کە سەری خۆی هەڵگرت، پاش ئەوەی بە میهری عاشقێکەوە وتت..

((مەترسێ خوێنم هەیە!))

داتە پرمەی گریان.. گریانێک کە ژێر نەبیتەوە، وەها بە کوڵ دەکوڵایت کە پەری زەندەقچوو، چمکی کراسەکەتی ڕادەتەکاندو بەدەم قیژەوە دەستەو دامێنت دەبوو .. بێئاگا لە زریکەی پەریو مەلی پێکراوی ناو چنگت هاوارت دەکرد ..

((خودا هاوار .. بۆ نەتکوشتم؟))

لە قیژەو هاواری خوشکە چکۆلەکەت ڕاچەنیتو وەئاگا هاتیتەوە کە خۆیو کوکوختییەکی بریندارو مردارەوەبوو بە دەستییەوە، خۆی بە سینەتدا دەکوتاو دەپاڕایەوە..

((دادیل .. مەگری .. بۆ وادەکەی دادیل؟))

نەتزانی چۆن مەلی پێکراو چۆتە ناو چنگی، توند لە ئامێزت گرتو ماچت کرد، بە شەرمێکەوە .. شەرمی خوشکی گەورە کە هەترەشی خوشکە بچکۆلەکەی بردبێت بۆنت دەکردو سەرو پرچت هەڵدەگلۆفیو فرمێسکەکانیت دەسڕییەوە، شپرزەو خێرا کوکوختییە کوژراوەکەت لە دەستی دەرهێنا، بە ترسێکەوە دەیپرسی..

( (بۆ کوشتیان دادیل؟ چی لێبکەین دادیل؟))

بە خەمو پەرۆشییەوە سەیری چاوە تەڕەکانیت دەکرد کە سێ ڕیز فرمێسکی دەباراند، خوشکانەو بە نەغمەیەکی منداڵانەوە پێتوت..

( (هەر ئێستا چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنین .. با پشیلە نەیخوات.))

بەدەم فرمێسک سڕینەوە لە نزیک کەپرەکە بە پەلیکە دارێک چاڵێکی چکۆلەت هەڵکەند، بەڵام بایی ئەوەندە قووڵ بوو کە کوکوختییەکە بشارێتەوە، داوات کرد پەری دوو بەردی گەورۆنە بدۆزێتەوە تاوەکو بیکەن بە کێلی گۆڕەکەی، بەدەم پەیداکردنی بەردو ناشتنی کوکوختییەکەوە فرمێسکەکانی نەدەوەستان، کە تەدارەکی ناشتنەکە تەواو بوو بە دیار گۆڕێکی چکۆلەوە دۆش دامابوون، منگنانەو بەدەم گریانەوە پرسی..

( (ئەم کوکوختییەش دەچێتەوە بەهەشت دادیل؟))

( (هەر ئێستا بە قوربان ..))

( (کەی .. کەی دادیل؟))

( (کە ئێمە ڕۆیشتین .. ڕۆحەکەم ..))

تۆ دە جاران خۆت وەک ئەو کوکوختییە کوژراوە بینی کە خوێنی هەردووکتان لە ژێر ئەو کەپرەدا تکان، هەر تاوێک لەمەوبەر بە ئاسماندا سەربەستانە لە شەققەی باڵی دەدا، بۆ دەبێت خوێنی پاکیزەیی تۆو کوکوختییەکە لەژێر هەمان کەپرو دوو لبادی دەستکردی خاڵت بڕژێن؟!

***

هێشتا لەناو بالکۆنەکە وەستاویتو سەیری باڵای منارەکە دەکەیت، لەسەرەوە بۆ بناغەکەی، لە بناغەوە بۆ ترۆپکی کەلبووی کە نارێک لێرەو لەوێدا خشتەکانی کەوتوونو خوراون، وەک ئەوەی دەعبایەک لە ئاسمانەوە دابەزیبێتو لە هەر هەموو لایەکەوە قەپاڵی لێگرتبێت، ئاخۆ چەند چینی خوراون، لەو کۆترە شینکەو کێوییانە ڕادەمایتو کەیفساز بوویت کە بە دەوری منارەکەدا هەڵدەفڕین، دوور تا چاو بڕ دەکات بە تاکو جووتو پۆل پۆل بەسەر ماڵەکانو کەلاوەکاندا ڕووەو ئاسۆ لە شەقەی باڵ دەدەن، ڕووەو شینایی ئاسمانو خۆ لە هەتاودا دەشۆنو مەستانە دێنەوەو باڵا گەردانی منارەکە دەبن، گەرچی ساڵانێکی زۆر تێپەڕین کەچی خەونەکانت پڕن لە کوکوختیو کەو و کۆتری کوژراو، هەمیشە خەونی ئەو کوکوختییەیە کە بە ئاسمانەوە پێکرا کە دوا چریکەی خوێنینی پاش پێکران لەتەک سەدەها فڕندەی دیکەدا وەک شاپەڕو گەندە پەڕەکانیان بەسەر تۆدا دەبارێن، هەر لەو ڕۆژەوەی لەناو باخەکەی خاڵتدا، هۆمەر کوکوختییەکەی کوشتو خۆت ناشتت خەونی جڕناوفڕنا دەبینیت، خەونێکە دووبارەو دە بارە دەبێتەوە، تۆیت و وەک کوکوختییەک یان کۆترێکی گەورۆنە بەسەر ئاسمانی باخێکدا بێئاگا لە خەیاڵی ڕاوچییەکان ئاسمانان تەی

دەکەیت، بێئاگا لە ڕازو نهێنی ناو دڵی پیسی ڕاوچی دەنیشیتەوەو هەڵدەفڕیت، هەمیشە بەسەر گردو تەپۆلکەکانەوە هۆمەڕ-ت لێ پەیدا دەبێت، هەر بە هەمان شەرواڵو مرادخانییەوە، تاپڕ بە دەستەوە، مشکیو جامانە تێکەڵ، بە ڕۆحو دڵی سەد ڕاوچییەوە نیشانەت لێدەگرێتەوە، تۆش سەرمەستی هەتاو و هەوای بن باڵەکانت مەحاڵە خەیاڵی خوێناوی ڕاوکەرەکان بخوێنیتەوە، تا گڕی ساچمەو پێکرانو کەوتنو دەنووک لە خۆڵ چەقین.. سووسەی هیچ ناکەیت، ڕاوچییەکان لەناو خەونەکانتدا جێگۆڕکێ دەکەن: هۆمەر، باوکت، براکانت، بەهرام، پیاوانی بنەماڵە تا دەگات بە کوڕوکاڵی گەڕەک، هەرجارەو یەکێکیان دەتپێکێت، وای لێهاتووە هەندێک شەو لە ترسی تارمایی ئەو تاپڕ بە دەستو تفەنگچییانە پتر بە ئاسماندا هەڵدەفڕیت، گوللەی گڕگرتوو تاوێک خێراو تاوێک هێواش ئاسمانەکانت بۆ دەگەڕێت، وەک واشەیەکی نەفرەتی گوللەی گڕدار بەدوای کلکتەوە ..جارێک بەر باڵی ڕاستەتو جارێک چەپ، جارێک چاوەکانت پڕدەکەن لە خوێنو جارێک دەنووکت، هەمیشە نیوە زیندوو دەکەوتیتە بەر پێیانو هەر تاوێکو لەناو لەپی یەکێکیاندا دەمردیت، جار هەبوو تیماریان دەکردیت، ئاو و دانیان بۆ ڕۆدەکردیت، زیندوو دەبوویتەوەو لە قەفەزیان دەنایت، بەڵام هەرگیز ئازادو بەرەڵڵا نەدەکرایت، پەڕو باڵیان دەکردیت نەبا بفڕیت، چەندە لە مەلێکی شکەستەباڵو پاشووبەستە دەچیت، خۆزگەت دەخواست کە یەکێک بوویتایە لەو باڵندە بەرز فڕیوانەی کە سنوور نافامن،

بەسەر گوندو شاری غەریبو باخەکانی دونیاو سنووره دەستکردەکانو دوور لە نیشانەی ڕاوکەرەکان کۆچی گەرمیانو کوێستانت بکردایە، جارو بار کلکتیان قوت دەکردو لەنێو ژنو منداڵەکانیاندا بەرەڵڵایان دەکردیت، هەندێکجار بەدەست منداڵە هارو چەتوونەکانەوە باڵەکانت هەڵدەوەرین، کچانو کەیبانووی ماڵەکان کە غەمگینو ماندوو دەبوون بە دەست ئەرکو ئیشی ناوماڵو لە داخی باوکو مێردو براکانیان سۆڵو گەسکیان تێدەگرتیت، بە ئەنقەست پێیان لێدەنایت .. دەمردیت، جاروبار لە ئازاری ئەو تیغەو گوێزانە بێدار دەبوویتەوە کە تۆلازە توورەو تۆسنەکان دەیانخستە سەر ملت، خەونێکی دیکەو ڕاوێکی دیکەو مەرگێکی دیکە ..

هەر واش بوو، کتو مت وەک پاڵەوانی ناو داستانو هەقایەتە پڕ درۆکان، وەک خەونێکی ناخۆش کە بەڕاست دەگەڕێت، هۆمەر-ی تاین ڕاوکەرێکی چاپووکو لێزان بوو، لە هەموو لایەکەوە کە تۆ باڵەفرەت بۆ دەکرد ئەم فاقەو تەپکەو داوی دادەنایەوە، تۆش نێچیرێکی شکستەباڵو دەنووک پڕ خوێن، برسیو تینوو، لانە خراپو ئاسمانت پڕ دووکەڵ، ماندووی دەست چاوەڕوانی ساڵانێکی دوورودرێژ، بەڵێنێکی کۆنو ڕەنگ بواردوو وەک ئەو خوێنەی سەر لبادەکە کە دواجار چڵکو تۆزی زەمانە دایپۆشی، بە ڕادەیەک کۆن کە هیچ نیگارو نەخشێکی نەمێنێت، لبادێک کۆنو جێماو کە ئیتر تا دونیا

دونیایە جارێکی دیکە ژوانێکی دیکە نابینێتەوە، شەش مانگی یەکەم نامەو سێ پۆستکارتو سێ وێنەی خۆی بۆ تۆو کەسو کار نارد، لە ئێرانو تورکیاو یۆنان-ەوە، نامەی یەکەم درێژو پڕ سۆز بوو، نامەکانو کارتەکان بۆنی دەستو پلی ئەو پەیکە ناشارەزایانەی لێدەهات، بۆنی چڵکو ئارەقە، لە دە لاوە دڵۆپەی ئاو بێت یان ئارەقە یان فرمێسک چەندین وشەی سڕیبۆوە، نامەکان جار لە دوای جار کورت دەبوونەوە، دەبوون بە کارتی ڕەنگاو ڕەنگ، دیمەنی شارانێک کە پڕن لە جادەی ئاوەدانو خەڵکی خاوێن، تاوەرو باڵەخانەو بورجی بڵند کە منارەکەت بە بەراورد لەتەک ئەواندا پەنجە تووتەیە، لە ڕەسمەکاندا تەنیاو لە قەراغی زەریایەکی بەر بەرینو بێ سنوور وەک خەمی بێ کۆتایی چاوەڕوانی، هەر ئەو شەش مانگەو ئیتر وەک ئەوە وابوو زەریاکان قووتیان دابێت.. یان ڕێگاکان وێڵیان کرد بێت..ئاخۆ جەهەننەمی ئەودیو کێوەکان سووتاندوویەتی یان بەهەشتەکانی فریویان داوە؟

ڕاپەڕین هاتو دەستەدەستە کوڕوکاڵی هەڵەتە دەردەکەوتنەوە، گەنجو پیر، ژنو پیاوی زۆر .. خۆیانو جانتای پڕ لە غوربەتو تاسەو سۆزی جودایی، دونیایەکی جەنجاڵو ئاوس بە حەزو خۆزگەو چاوەڕوانی .. چاوەڕوانی هەموو شتو .. هیچیش..

((خودایە بۆ نامکوژیت؟))

جاری وا هەیە بە سەعات ئەم بالکۆنەو پشت پەنجەرەکە بەجێناهێڵیت،

دەیەها سکێچی ئەم منارەیەت کردووە، کە هۆمەر وەک بووکێکی تازە سەرپشکی کردیت لەنێوان ئەم خانووە کە بۆخۆی نیگارو نەخشی سەردەم مێژوویەکی دێرینەو یان چوونە ناو کۆشکو تەلارێکی تازەی ناو خۆشترین گەڕەکی شار کە خواپێداوەکانی ناویان ناوە ((گەڕەکی شانشین)).. تۆ وتت..

((ئەم منارەو خانووە دوو توحفەی جوانن .. چاوم لێیان تێر نابێت ..))

بە چرپەوە پێیوتیت..

((کەس نایزانێت .. دەنگۆیەک هەیەو گوایە ئەم گەڕەکە پەڕپووتو داڕووخاوە بە منارەکەوە تێکدەدەن ..چونکە واتەواتەکە راست بێت یان درۆ ..گوایە لە گوینە منارەکە بڕووخێت))

ئەم هەواڵە وەک گوللەکە وابوو کە دڵی کوکوختییەکەی سمیو کوشتی. چی خوێنی لەشت هەیە تەوژمی هێنا بۆ سەرتو بە قەهرەوە وتت..

((مەگەر بەسەر خۆیاندا بیڕووخێنن ..!))

بە ترسو دڵەڕاوکێوە لە بەرامبەر تۆدا کە دەیزانی وەک هونەرمەندێک چەندە تووڕەو غەمگین دەبیت، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە درکاندی..

((گوایە منارەکە داڕزیوەو لاربۆتەوە .. ئەمڕۆ نا سبەی هەر دەڕووخێ.))

((جا لە دەستیان دێ؟))

( (هەموو شتێکیان لە دەست دێ، چەندین خانووشیان کڕیوەتەوەو نیازیانە بیکەن بە بازاڕو دوکانی تازە بابەت.))
( (هەر ئەم قسەیەت وام لێدەکات لێرە نەجووڵێمو مەگەر تەرمەکەم لەم ماڵە ببەنە دەرەوە!))
چەندە شاگەشکە بوویت کە جوامێرانە دەستی لە ملت کردو دڵنیای کردیت کە لەم بڕیارەدا هاوسۆزتەو پشتو پەنای تۆیە، ئەوەیان یەکەمین جار بوو کە ئەگەرچی خۆی دۆستی ئەو پیاوە خواپێداوانە بوو کە مرخیان لە ڕووخانی منارەکەو گەڕەکەکە خۆش کردبوو، کەچی تەنیای نەکردیتو هاتە ناو ئەو جەنگەوە کە تۆ خوێنی خۆت بۆ دەڕشت، چەندە سۆزو ڕێزێک لە ڕۆحتدا بۆ ئەو پیاوە گەورەتربوو کە تەنها وەک چەکبەدەستو ڕاوچی دەتبینی. تۆ بڵێیت ئەوەیان یەکێک لە تەڵەو فاقەکان نەبێت کە وا بکات سۆزی ژنانەت بکڕێت؟ کێ دەزانێت؟ ڕۆژگارەو دێت ...

دوای یەک مانگ لە زەماوەندەکەتان، ویستی پتر سەرسامت بکاو شاگەشکە بیت، شەوێک کە سەرگوزشتەی ڕۆژانی شاخی بۆ دەگێڕایتەوە، پێکی هەڵدەداو مەستانە وەک پیرە عاشقێک نیگای دەکردیت، تکای دونیای لێکردیت کە پێکێک شەرابی لەگەڵدا بخۆیتەوە، سوێندی خوارد کە ڕازێکی لە دڵدایەو تۆ شادومان دەکات گەر پێکێکی لە تەکدا هەڵنەدەیت .. نایدرکێنێت .. پێکەکانتان

هەڵداو بە مەراقێکی زۆر گەرمو ژنانەوە گوێت گرت، زرنگانەوەی پەرداخەکان خۆش هاتە گوێتو مەستانە وتی..
((بە خۆشی چاوەکانت .. نۆش))
هێشتا شەرمت دەکرد وەڵامی نۆشەکەی بدەیتەوە، چاوەڕێت کرد ڕازەکە بدرکێنێت، کە دەمو لێوی تەڕبووی بە شەرابەکە لستەوەو دەستی بە سمێڵیدا هێناو وتی..
((تۆ هونەرمەندیتو دەزانم چەندە حەزت لە شتی کۆنو عەنتیکەیە، هەر لە گۆزەیەکەوە تا دەگات بەم خانووە قەدیمە،تەنها تۆم دیوە قەدری ئەو شتە سەیرانە بزانیت.. هەر بۆیە ئەم خانووە دیاری منەو لەسەر تۆ تاپۆی دەکەم!))
ڕامایتو تاسایت، لەلایەکەوە وەک نموونەی تەلارسازی دوو سەدەیەک لەمەوبەر سەرسام بوویت، لەولاوە وەک هەر خانوویەک کە کڕینو فرۆشتنی لەسەرەو نرخی هەیە غەمگینی کردیت، وەک ئەوەی نیازی دڵت بخوێنێتەوە .. دڵنیای کردیتەوە..
((من دەزانم .. بۆ تۆ مەسەلە موڵکو ماڵ نییە، بۆ منیش هیچ مانایەکی نییە .. بۆ تۆ نموونەی نەخشو نیگارێکە، هەیکەلێکە وەک ئەم منارەیە کە خۆشت دەوێ))

دەتزانی هیچ مانایەکی نییە بکەویتە ناو بێنەوبەردەیەکی بێئاکام، چونکە بێگومان بوویت لە نیگاکانیو شێوەی وتنو بڕیارەکەی کە تازە

مەحاڵە بتوانیت پەشیمانی بکەیتەوە، بەتایبەتی کە هەر زوو خۆی مەست کرد، مەستی بۆ هەمیشە پیاوەکان دەخاتە سەر ئەسڵی ئەو کانزا و مەعدەنەی لێوەی دروست بوون، چ بەخشندە بێت چ قرچۆک، چ دڵڕەق بێتو چ میهرەبان، چ کەیفخۆش و چ نیگەران.. دەیەها جار ئەم ڕازەت لە باوکو براکانتو بەهرام بیستبوو، سەیرێکی منارەکەت کرد کە تریفەی مانگ دەنێو بەرگێکی زیوین نواڵەیەکی ڕۆشنی کردبوو بە کڵاوی سەری، هەر دەتوت تەماعی ئەوەیە لە پەنجەرەکەوە بێتە ژووریۆو لە تەکیاندا دابنیشیۆو یاداشتەکانی سەردەمێکی دێرینیان بۆ بگێڕێتەوە، بۆ شکاندنی هەوای خامۆشی نێوانیان کە بەخشندەیی هۆمەر خولڤاندی .. تۆ پرسیت..

( (تۆ بڕوا دەکەیت ئەو منارەیە ئەوەندە لار بووبێتەوە کە بڕووخێت؟))

بە شەرمی پیاوێکەوە کە لە دڵی گران بێت دان بەوەدا بنێت نەزانەو لەوە خراپتریش ئەوەبوو خۆی وا بنوێنێت کە هەموو شتێک لەسەر ئەو دەنگۆیەو منارەکەش دەزانێت، ڕاماو پەنای بردەوە بۆ پێکەکەی تاوەکو شپرزەبوونی خۆی بشارێتەوەو لە ژێر لێوەوە وتی..

( (تێناگەم ئەم هەرایە چییە، لەوەتەی من لەم ماڵە لە دایک بووموو ژیاوم ئەو منارەیە قیتو قۆز وەستاوە!))

ڕۆژانە بە چواردەوریدا دەخولایتەوە، لە ژێرەوەڕا سەرت هەڵدەبڕیۆو لە بالکۆنەکەوە وەک پەیکەر بە دیارییەوە نەدەجووڵایتو چاوەکانت لێ نەدەتروکاند، لێرەو لەوێ، جارو بار، خشتێک دووانی لێدەبۆوەو

دەکەوتە خوار، تۆ بە میهرو سۆزێکەوە وەک ئەوەی دڵی کەوتووی خۆت هەڵبگریتەوە، خشتەکانت هەڵدەگرتەوەو دەتپاراستن، هەر زوو ئیمزای سەدەها هونەرمەندو نووسەرت کۆکردەوەو کردتان بە پەراوێزی داواو نامەیەک بۆ ڕێکخراوی (یونسکۆ) کە هەتا زووە ئەم میراتە هونەرییە نۆژەن بکرێتەوە، لەبەرچاوی تۆ ڕێکو ڕاست بەناو ئاسماندا ڕۆچووبوو، لە ترۆپکەوە تاوەکو بناغەکەی کونو کەلەبەری وای تێکەوتبوو کە ببنە هێلانەی کۆترو چۆلەکە پاساریو مارو مێروو، فرندەکان لە ترسی هێرشی لەناکاوی منداڵەکانو کوڕە لاوەکان کە بە دارلاستیکو بەردەقانی نیشانەیان دەگرتەوە، یان لە ترسی شەقژنی تاپڕو ساچمەزەنەکان،زەندەقچوو بە گڕدانی ئاسمان بە پۆلو بە تاک لە زارکی منارەکەوە ڕووەو ئاسمان هەڵدەفڕینو قەیرێک دەتەران، ساڵ دوای ساڵ لە ترسی ئەو هەموو بەردو ئاگرە کەمتر دەبوونەوە، لەیادت ماوە ساڵانێک لەمەوبەر هەر دەتوت ئەو منارەیە هێلانەی مەلە کێوییەکانە، هەمیشە بە قەڵەمی ڕەساس چەندین دەفتەرت پڕ کرد لە سکێچو نیگاری منارەو مەلەکان، تۆ خۆت وەک هوزارێکی بەندکراوی ناو قەفەزێک بەغیلیت بەو مەلە سەربەستانە دەبرد، بەڵام کە ئێستاکە ئەو ئیرەییەت نەماوە، ماڵەکان پڕبوون لە چەکو منداڵو مەزن لە تەقەکردن ناسڵەمێنەوە، کۆتر کوشتنو ژن کوشتن وەک یەک ئاسان بووە ...

سەرەتا لە نیگارو سکێچەکانتدا منارەکە پتەو و دامەزراو و ڕێکو ڕاست بە ئاسماندا هەڵکشابوو، کەچی هەنووکە چەندین سکێچی منارەی چەماوەو نیمچە ڕووخاو لە ژێر دەستت قوت دەبێتەوە، هەتا لە خەونەکانیشتدا هەر منارەیەو بەسەر تۆو ماڵەکەتدا دەڕووخێت، هەر هەمووشی لەشێوەی منارە خۆشەویستەکەی خۆتە، هەر هەمووشی لە ئاکامی ئەم واتەواتەیە کە لە چایخانەو مەیخانەو مزگەوتو سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا باس هەر باسی لاربوونەوەی منارەکەیە، جار جار لە ڕادیۆو تەلەلفزیۆنەکاندا دیداری بۆ ساز دەکرێتو ژمارەیەک لە ئەندزیاران‌و شارەزایان زوڕنای ئەوە لێدەدەن کە ڕووخانی مسۆگەرەو بشرووخێت ئەو ماڵانەی چواردەوری خۆی کاول دەکات، تۆ کۆڵێک گومان لە فڵتەفڵتی ئەو موهەندزانە دەکەیت ..هۆمەر تووڕەو داخدارانە لەبەر دڵی تۆ کە دەزانێت نیگەرانیت بەو دەنگۆیە .. خۆی پێناگیرێ‌و هەڵدەداتێ..

( (ئەو قسە هەلەق‌و مەلەقانە چییە، خەڵکێکی عەقڵ سووکە، تەڵاقم کەوتبێ مەرامی تری لەدوایە، یەک منارەی ئەسەریمان هەیە .. کە پێیان ئاودیو نەکراوە .. دەیڕووخێنن .. گوو نەکەیتە ئەسڵ‌و فەسڵیان؟!))

کە خەمو داخێک تووڕەی دەکرد .. ئاسان هەڵدەچوو، وەک پیشەی زەمانی زوو دەستی بۆ دەمانچەکەی بەر پشتێنی دەبرد، هەناسەی

سوارو کۆکینی نەدەوەستا، چاوەکانی دەردەپۆقین، بەدەم کۆکینەوە سوور هەڵدەگەڕاو دەکەوتە سەر ئەژنۆ، کێشانی ئەو هەموو سیغارە پشووی تەنگ کردبوو، مەیخواردنەوەش سەربار .. بابەتی سەر مێزی نانخواردنو ناو پێخەفیشیان ببوو بە خەمی منارەکە، لە گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە سەفەرێکی کورتی بۆ ئاوروپا کە ناچار ساڵی دووجار دەچووە لای دکتۆرەکانی،سۆزی باوکانەش دڵی گەرم دەکرد تاوەکو چاوی بە منداڵەکانی بکەوێتەوە،لە گەڕانەوەیەکدا دوو ئەلبوومی بۆ هێنا بە دیاری کە پڕبوو لە بورجو منارەو مۆنیومێنت و تەلار و کۆتەلا. هەر کاتێک کۆکەکەی لێدەپژا دەبوو تۆ حەبو دەرمانەکانی فریا بخەیت، ساڵ دوای ساڵ هۆمەر لە کورتی دەداو تا دەهات باریکو بنێستر دەبوو، دەستەکانی دەلەرزینو ئاسان ڕەنگی دەپەڕیو زەرد هەڵدەگەڕا، لە ساڵی شەشەمی زەماوەندەکەتاندا شەنگو هێزی جارانی نەماو لە دوو مانگدا بەقەد دە ساڵ پیری ڕۆحە گەشو پڕ لە قۆشمەکەی لێ سەندەوە، تۆ زانیبووت کە لەگەڵ پۆلێک لە بەرپرسو پێشمەرگەدا ساڵانێک لەمەوبەر دەرمانخوارد کرابوو، وەلێ هەرگیز پێوەی دیار نەبوو، چاپووکو ساغڵەم دەینواند، چیرۆکی ژەهراوی بوونی ئەو پۆلە پێشمەرگەیە لە شاخ بە مەنجەڵێک دۆڵمەی دەست و دیاری سیخورێک لە گوندو شارەکانیش دەنگی دایەوە، دووانیان مردنو ئەوانی دیکەش دەبوو تا ماون لە ژێر چاودێری دکتۆرەکانو چارەسەردا بمێننەوە، دوای ئەو هەموو ساڵانە یەکە یەکە لێیان بە

دیار دەکەوت، نیشانەکانی بەدەم خوار بوونو ڕشانەوەو لەرزینی سەرو دەست دەستیپێکرد،گۆد و گێژ بەرێگادا دەرۆشتن وەک ئەوەی شەپڵە لێی دابن،  لە دوا ساڵی تەمەنی هۆمەر-دا تۆ پتر لە پەرستار دەچوویت تا خانمو کەیبانووی ماڵ، کە لەناو جێگادا کەوت چەندەها جار لە ئامێزی تۆدا دەگریاو خەونی بەوەوە دەبینی کە بۆ یەکجاری دیکە بە هەمان هێزو شەنگی جاران وەک گورگ غاربداتو بچێتەوە ناو ئەو شاخو کێوانەو شێتانە دوا ڕەشەڕاوی خۆی بکاتو چش لەوەی دەمرێت، ئەم جوامێرانە درکاندی کە لە شاخ ژەهراوی بووە، بەڵام تۆ خۆت لەوە مردووترو نائومێدتر بوویت پێشبینی دەردی گرانو مەرگی هیچ کەسێک بکەیت، بیرتە کە دایکت چەندە غەمگینانە لێت پاڕایەوە کە ئەوەیان هەلێکەو تا کەی چاوەڕێ دەبیتو دەستەو دامێنت بوو کە خۆت لە قسەو قسەلۆکی دۆستو دوژمنی ناو بنەماڵەکەو کەسو کارو دەرو دراوسێ قورتار بکەیت..

( (کچە شیرینەکەم .. ئەو زەلامە مێشکی بردووین .. نە منو نە باوکت نازانین چی پێبڵێین، ئەو برازا حەرامزادەشم دەنگو سەنگی نییە .. بەتەمای چی .. خۆ بەنیاز نیت کەزی سپی بهۆنیتەوە؟!))

هەر واش بوو .. بە تەلەفوونو نامەو دیاری هەراسانی کردبوویت، سوێندی بۆ خواردیت کە لەگەڵ دایکی منداڵەکان هیچی نەماوەو تەڵاقی رەسمی هەیە، تۆ درکاندت کە تۆ هەرگیز خواستی وات نییە، ئەم سوێندی خوارد کە تەڵاقەکە بەر لە ناسینی تۆ بووە،  ئەوان

تازە ناگەڕێنەوەو ئەمیش ناکرێت ڕەبەن بێت، تەنیایی بۆ خودا خاسە، تۆش دڵشکاو و غەمینانە گوێت دەگرتو خەندەیەکی خوار لە زارت دەکەوت، کە دەیزانی خامۆشیو کەچی بەڵێو نەخێرت نییە، سەرمەستو شەیدایانە لێت دەهاتە پێشێو دەیوت..

((ڕاستە تەمەنم هەیە، بەڵام ئەوەش بزانە کە دڵی ئەسپێک وا لەناو دەففەی سینەمدا.))

لێکدا لێکدا بە مشتەکۆڵە سەر سینەی خۆی دەکوتی، تۆش زەردەیەکی ئاشکراترت لەسەر لێوان بار دەکرد .. ئەم کەیفسازتر دەینەڕاند..

((من عومری جوانی خۆم لەسەر ئەم خاکە دانا، مووم لێنەهاتبوو بوومە پێشمەرگە .. تێدەگەی .. ئەم ئازادییە بە هەموو نازو نیعمەتی ئاوروپا ناگۆڕمەوە.. ئا.. ئەرێ وەڵڵا .. بە گۆڕی شەهیدان من شەیدای عەقڵو فەننەکەتم کە لە هیچ ژنێکدا نەمدیوە.. ئەرێ وەللا.. شێتی ئەوەم.. نەک بەتەنها جوانیت..))

هەر بە ڕاستی ڕەوشتی ڕاوکەرێکی کەللەڕەقی هەبوو کە هەرگیز دەستبەرداری نێچیرەکەی نابێت، ناچار دوای هێنو منهێنێکی زۆر ئەو نهێنییەت درکاند کە لە هەموو ژیانتدا شاردبووتەوە، هەرگیز بڕوات نەدەکرد ئەم ڕازە لەلای نێرینەیەک بدرکێنیت، نهێنییەک کە مەزەندەت دەکرد هۆمەر لەبری دوو پێ، چواری دیکە قەرز بکاتو ئەو ناوە چۆل بکات، ئەو ئێوارەیە بوو کە شەکراوی یەکێک لە خوشکە بچووکەکانت دەخوورایەوە، هەمیشە هەلو بیانوویەکی دەدۆزییەوە کە سەردانت

بكات، دواجار كه له خۆتو هەموو دونیا پەستو نائومێد بوویتو ئەمیش هەراسانی كردبوویت به حەزێك كه گوایه بووەته عەشقێك ئاگری لەسەر سەری كردۆتەوه، گەر مل نەدەیت خۆی دەكوژێو خوێنی ڕژاوی له ئەستۆی تۆیه، بەدەم لەرزه لێوەوه پێتوت..

((بەڵام بەكەڵكی تۆ نایەم .. به هیچ شێوەیەك كەڵكی شووم پێوه نییه ..))

قسەكەت له زار دانەكەوتبوو كه هۆمەر پرسی..

((مەسەلەی خاڵۆزاكەته .. بەهرام .. دەیزانم .. من حسابی فلووسێك بۆ ئەو شتانه ناكەم، ئەڵاهووممه بتەوێت تا قیامەت چاوەڕێی بكەیت؟))

((نا .. زەحمەته بیزانیت!))

بەوپەڕی متمانەوه تێهەڵچۆوه..

((ئەوه چییه ..! نفووسی تۆ لای منه، سەرلەبەری ژیانو ئەحواڵت .. دەتوانم هەناسەكانیشت بژمێرم، ژن بۆ من قاتی نەبووه، بەڵام من شەیدای كەماڵی عەقڵتم بەر له جەماڵت .. هەرچییەكه تكاكارم پێمبڵێ .. خانمەكەم ..))

زۆر نابەدڵو بێباكانه زارت هەڵێنا بەو نیازەی كه نائومێد بێتو بتۆرێت، واز لەو هەوەسو مەیلو ڕۆحی ڕاوكەرئاسایەی بێنێت..

((تۆ پیاو و جوامێر دیاریت، ڕازو نهێنیم بپارێزه كه كەس نایزانێت جگه له خۆم، ئەو گومانەشم هەیه كه دایكم شكی كردبێت من بێ گرفت نیم ..!))

دەستی بۆ سمێڵی بردو سوێندی بە شەرەفو گۆڕی شەهیدان خوارد
کە نهێنیو ڕازەکەت لەگەڵ خۆیدا دەباتە ژێر گڵ..بێ خەیاڵو مردووانە
.. لێوەکانت وەک ئەوەی برینێکی قەڵەشتی بێت لێکدی ترازان ..
ئەو دوو وشەیە وەک دوو دڵۆپ خوێن بن لە زارتەوە تکان، برینێک
کە تەمەنێک بێت قەتماغەیەکی ئەستوور شاردبێتییەوەو هەنووکە
لابچێتو خوێن داچۆڕێنێت، برینێک شاراوەتر لەو برینە بزرەی دامێنت
کە لە ساڵێکی خوێناویو لە مانگێکی بێ مانگو لە ڕۆژێکی ڕەشدا لە
تۆدا پژا .. تەنها دوو وشە وەک دوو تنۆک خوێنی سیا:
((من ...ژنم ..!))

ڕاماو چاوەکانی پڕبوون لە خوێن، دەستەپاچەو داماوانە خۆی
ڕادەژەند، وەک ئەوەی ژانێک لەناو جەستەیدا بە پێچو لوول بگەڕێت،
چنگی توند کرد، بێئاگا لە خۆی دەستی بۆ دەمانچەکەی برد وەک
پیشەی هەمیشەیی کە غەزەبێک لە دڵیدا دەگەڕا، لەبەر خۆیەوە
بەدەم ورتە ورتەوە کە بە ئاستەم گوێت لێبێت دووبارەی دەکردەوە..
((ئەوە چی بوو؟ ئەوە چی بوو؟))
لەبەر خۆیەوە وەک مار دەیفیشکاند، تاوێکو تەوێڵی زەنگۆڵ زەنگۆڵ
ئارەقەی دەتکاند، بە دەنگێک کە لە زرنگانەوەی چەکوشێکی ئاسن
دەچوو لەسەر سندانێکی پۆڵا .. لێتی پرسی..
((لەگەڵ خاڵۆزاکەت؟!))

((خاڵۆزاکەم ..!))
بێئاگاو داخدارانە ددانەکانی بەسەر یەکدیدا قرساند وەک ئەوەی کوڕە خاڵەکەت لەبەردەمیدا وەستابێت..
((هەی نامەرد ..))
بێباکانە دوور لە خۆشەویستی بۆ خاڵۆزاکەت پێتوت..
((جنێو مەدە .. لەسەرو ڕیشی تۆ ناوەشێتەوە.))
دەمارگیرانە تەزبیحەکەی لەناو هەر دوو دەستی هەڵدەگلۆفیو دەنکەکانی بە ئارەقەو چەوری ناو لەپی پتر بریقەیان هەڵدێنا، پێت سەیر بوو کە خێراو ئاسان لەبەرخاتری تۆ خۆی هێور کردەوە وەک ئەکتەرێکی لێزان کە لە چاوتروکانێکدا لەوپەڕی کینەو گومانو تووڕەییەوە باز بداتە ناو هەرێمی پڕ لە میهرو ڕۆحپەروەریو هێوری، سەیرتریش لەوە ئەوەبوو کە دەمی هەڵێنایەوەو وتی..
((عەفوو .. عەفوو .. هەقتە .. خەمی پێ مەخۆ .. ئەی گەر بڵێم هێشتا تۆم مەبەستە .. چی دەفەرمووی؟))
لەنێوان گومانو دڵنیاییدا ڕاما بوویت، گومان لەوەی گەمەیەکی نێرانە بکاتو متمانەت لێ بخوازێت بەڵکو ئەوە خوایە وەڵامێکی ئەرێنی لە زارت داکەوێت، دڵنیابوونێک لەوەی شەیدایی وەها کوێرو کەڕی کردبێت کە نە بیەوێت هیچ ببینێتو نە هیچ ببیستێت، ئاخر ئەم چەندین مانگە لەسەر هەمان هەواو هەوەسی خۆی بەردەوامو سەرمەست بوو، وەک ڕاوچییەکی لێزان کە بزانێت نێچیرەکەی تەنها

لە ماندووکردندا ڕاودەکرێت، تەواو ماندووی کردیت، بێباک لە سەرماو گەرما، لە هەورازو نشێو .. لە هەر کۆسپو تەگەرەو بەربەستێک.. کۆڵی نەدەدا، بۆ ساتەوەختێک خامۆشانە بیرت لەوە کردەوە کە چۆن توانی وا هێمنو جوامێرانە وەڵامت بداتەوە، هەر چۆن لێکت دەدایەوە، خۆت بەو مەلە بریندارو پێکراوە دەهاتە بەرچاو کە ئەم دەتوانێت هەڵتبگرێتەوەو تیمارت بکات، دانو ئاوت بۆ دابنێت، کەمەکێ پەڕو باڵت بکات نەبا بفڕیت، بتخاتە ناو جوانترین قەفەزەوە، کە خامۆشتر بوویتو لە چاوەڕوانیو وەڵام نەدانەوەت بێزار بوو، بە ڕێزو شارەزاییەکی زۆرەوە لە دڵ ڕاگرتنی هەر ژنێک بە گوێرەی عەقڵی خۆی گەمەی زۆری بەڕێوە بردبێتو هەمیشە گەمەکەیشی بردبێتەوە .. پێیوتیت..

((تۆ خانمێکی فەنناني .. زۆر سەلارو سەنگین دەتبینم ..))

قسەکەیت پێبڕیو .. وەک ئەوەی بتەوێت پێی بڵێیت کە ئەم ناحاڵییە..

((من وتم ژنم .. فەننی من چی لەوە دەگۆڕێت؟))

بە متمانەیەکی زۆرەوە کە تەنها لەو پیاوانە دەوەشێتەوە کە سەراوودەراوی دونیایان بینیوە، بۆ گەیشتن بە هەر مەرامێک ڕاستە ڕێ ناگرنە بەر، بە پێچو دەوران لە دە کوێرە ڕێگای دیکەوە دێنەوەو سەری ڕێگەکەت لێدەگرن، لە فڕێدانی قسەی هەلەقو مەلەقو بێ مانا سڵ ناکەنەوە تا دەگا بە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و وتەی

پڕ لە حیکمەتی داناکان و پێغەمبەران و نوکتەی بێ زەوق تەنها بۆ ئەوەی دواجار ئەو ڕازە بدرکێنن..ئەمیش هەر وایکردو ئەوەی درکاند کە هەر لە سەرەتاوە ڕازی دڵی بووەو لەتۆی شاردبۆوە..

((ئێستا پێت دەڵێم .. چاو هەڵبڕەو سەیرم کە .. قسەیەک دەکەمو بە جوامێرم بزانەو قسەکەم وەک خۆی لێ بکرە .. سوێندت دەدەم بە جوانیت وەکو خۆی لێم تێبگە..))

بۆ ئەوەی هەردووکتان لەو شڵەژانو شپرزەبوونە بێنە دەرێ کە دەتانویست بە درۆ خۆتانی لێ بشارنەوە، بە خەندەیەکەوە پێتوت..

((قسەکەت لێ ناکرم .. لێت وەردەگرم ..))

((ئەها .. ئەوەتا .. کە وتم فەننانی .. بە واتا لە من عاقڵتری .. تۆ واز لە مەسەلەی شووکردنەکەت بێنە بە من .. من .. دکتۆرو سستەری چاک دەناسم کە دۆستی منو سرپیان قایمە .. دەتوانیت، کەس نەزانێت، وابکەین ببیتەوە بە کچ .. چونکە ناکرێ وا بمێنیتەوە .. عەفووم کە خودا شاهیدە خۆشەویستی ئەوەم پێدەکات..))

دیسانەوە لەبەردەمی ئەودا خۆت وەک نێچیرێک، کچێکی زەبوونو شکەستەباڵ، هاتەوە بەرچاو، زانی پەستو توورەیتو هەموو گیانت وەک بینی ئاو دەلەرزی، تکای لێکردیت کە وەک پیاوێکی جوامێر ئەم ڕازەی لێ وەربگریتو سوێندی خوارد بە گۆڕی شەهیدان کە تۆی خۆشدەوێتو لە دڵی زۆر گرانە پەپوولەیەکی وەک تۆ لە بەهاری تەمەندا، باڵەکانی هەڵبوەرێو نەتوانێت بفرێت، هەمیشە تۆی بە

پەپوولە دەشووبهاند، نەتتوانی ئەو خەمەت بشاریتەوەو خامۆش بوویت، زۆرت لەخۆت کرد کە دەنگ هەڵنەبڕیت..

((بیستوومە کە ڕاوچی کچە بێکەسو جوانکیلەکان لەدوای ڕاپەڕینەوە زۆرتربوون، هەتا مەسئوولەکان دکتۆری تایبەتیان هەیە، بۆ دوورینەوەی پەردەی کچێنی ..))

زەرد هەڵگەڕاو یەکاندەردوو وەڵامی دایتەوە..

((دەی باشە .. کچەکان بۆ ئەوەندە ساویلەکەن دێنە پای حەزو هەوەسی ئەو زەلامە هیچو هەوەسبازانە .. سک تێرو ناوگەڵ برسییانە؟))

پێت سەیر نەبوو کە دڵگەرمانەو بە داخێکەوە جنێوی دەدا، لەناوئاخنی ئەو داخو هەڵچوونەداو گوناهبارکردنی کچەکان بە ساویلکەیی، جنێوێک بوو کە ناڕاستەوخۆ ناردی بۆ خاڵۆزاکەتو پلارێک بۆ تۆش کە ئەگەر ساویلکە نەبوویتایە .. ئاواهی

خۆت بەدبەختو بەرباد نەدەکرد، نەدەکرا وەڵامی نەدەیتەوە..

((تۆ پیاویت .. چاک دەزانیت سەدەها فریو و درۆو بەڵێنی زەردو سووری هاوتوخمەکەی تۆ هەن کە نە کچ، بەڵکو شەیتانیش لە خشتە دەبات، پێم سەیرە دەوترێت بە فیتی شەیتان دایکە حەوای خۆمان باوکە ئادەمی هەڵخەڵەتاندووە لە سێوەکە بخوات، ئەوەندەی کە لە خوڵقو خدەوخووی پیاو ورد دەبیتەوە .. پێچەوانەکەی ڕاستە.))

دەتویست بابەتەکە بگۆڕیتو لە دڵیشەوە دەجۆشایتو زۆر زەحمەت

بوو لەو ساتەوەختەدا لە خۆتو ئەو تێبگەیت، نەشتدەتوانی بێباک بیتو جوامێریو جۆشو خرۆشی ئەو پیاوە بە فێڵو تەڵەکە بزانیت، تۆڵەی سالآنی چاوەڕوانی لە گۆشەیەکی دڵتدا وەک هەر کچو ژنێکی نائومێد لە گفتو بەڵێنی عیشقو ئەویندارى پتر دەخرۆشاو جۆشی دەسەند، هەر دەتوت تۆفانی «نووح» ئەم شارە نوقم دەکاتو تۆش بە تەنها ئەم فریادڕەسە شک دەبەیت، پێت شەرم بوو نووچ بدەیتو لاواز دەربکەویت، بەڵام دەتزانی هێزو تواناش بۆ ئافرەتێکی تەنیا لە شارێکی وادا چەندە ئەستەمە .. لە دڵی خۆتدا دەتوت چەندە درۆیە کە بەتەنها لەناو چیرۆکو ڕۆمانو فیلمەکاندا نموونەی وا هەن کە بە تەنیاو رووت و قووت سەد جەنگ دەبەنەوە، دەشتزانی ((بەڵێ))ت جۆرێکە لە خۆکوشتن، چونکە هێشتا دەستبەرداری خەونە ڕۆمانسیو خەیاڵە خۆشەکانی خۆت نەببوویت، بە درۆش بێت چاوەڕوانی موعجیزەیەک بوویت، لەوە دەچوو لە دوای ئەو هەموو سالآنە .. ئاکام: سوارچاکی چەلەنگی تۆ پیاوێک بێت کە وەک خۆی دەیوت سالآنێک لەناو ئەو شاخو کێوانەدا سەرگەرمی ڕاوە مرۆڤ بووە کە ناوی دەنا ڕاوەدوژمن، ئێستاش بە تاپڕێکەوە کۆترو کوکوختیو کەو و پۆڕو سوێسکەو کارمامزو کەڵەکێویو بەرازی ناو ئەو دەشتو دەرو شاخو کێو و ئاسمانانە ڕاو دەکات، چەندە تەماشات دەکرد کەیفو هەوای ڕاوکەرێک لە تەوقی سەرییەوە تا کەڵەمووستی پێی هەموو ڕۆحو جەستەی دەتەنییەوە، چاوە هەڵۆئاساکانی، هەنگاوە چوستەکانی،

ڕامانو نیگای وەستاوی لەسەر شتەکانو چاو نەتروکاندنی، دوو چنگی کە لەنێوان کرانەوەو نووقاندندا نەدەسرەوتن، سمێڵی بابرِو دەمو لێوی نەوسنی کە خوێنی نێچیرەکان هەمیشە سووووری کردبێت، هێمنیو پشوو درێژیو سووربوونی لەسەر شتەکانی خۆی، هەر ڕێک لەوە دەچوو لە دوای ئەو هەموو ڕاوە خۆشە، دوا خۆشیو لەزەتی دوا ڕاو لە ژیانیدا تاقی بکاتەوەو بە هەموو تەمەنی خۆی ئامادەیەو بڕیاری داوە بۆ تۆ بچێتە بۆسەوە، بە مەرجی بردنەوەو پاشەکشێ نەکردن، کە زانی زۆر چوویتە ناو خەیاڵێکەوە کە ئەم زەحمەتە ڕاوی بکات، بەدەم سمێڵ کرۆشتنەوە نێرەکەو ئاسا کە بەدەوری ماکەوێکدا بخولێتەوەو شاپەڕ لە زەوی بخشێنێ .. باقبەباق .. باقبە باق ڕازێک بدرکێنێتو تامەزرۆ بە وەڵامێکت کە نییە، گەرەکی بوو پرسیارێکی دیکەت لێبکات، کە ڕازی دڵی ئەوت خوێندەوە سەرسامتر بوو، دەترسا ئافرەتێک لەو زیرەکتر بێتو ڕازی ناو دڵەکان ببینێت، هیچ لەوە کوشندەتر نییە عاشقی ژنێک بیت، بەرلەوەی دەم هەڵبێنیت، ئەم ڕستەکەت بۆ تەواو بکات، یان نهێنیو ڕازێک لەژێر سەد توێی دڵو چینەکانی ناو رۆحدا حەشار بدەیت، کەچی عفریتانە پەردەیان لەسەر هەڵماڵێتو ڕووتو قووت خۆت لەبەردەمیدا ببینیتەوە، یان بەتەنها نیگایەک چاوەکانت وەک کتێبی کراوە بنو بیخوێنێتەوە، بۆیە پێشیکەوتیت و پێتوت:

((نیازت بوو بپرسیت تاکەی چاوەڕێ دەکەم .. ئاخۆ تا ئێستاش خاڵۆزاکەم خۆش دەوێت؟))

نائومێدانە وتی..

( (منیش خوێندەوارم خاتوون .. سیاسەت نەیهێشت زانکۆ تەواو بکەمو مووم لێنەهاتبوو تفەنگم هەڵگرت، بەرلەوەی دایکو باوکم بە نابەدڵی خۆم ژنم بۆ بێنن، لەنێوان ژنو ماڵو شۆڕشدا، شۆڕشم هەڵبژارد، ئەوەش لەچاوی هونەرمەندێکی وەک تۆدا .. هەقە جێگەی شانازی بێت ..))

( (چاک دەزانم .. بەڵام ئەمەیان چ پەیوەندی بەوڕازونیازەی ناو دڵی تۆوە هەیە .. پاشان ئەوەی تۆ تفەنگت بۆ دەتەقاندو ماڵو منداڵت بە قوربانی شۆڕش کرد .. هەست ناکەیت ئەمڕۆ بۆتە بازاڕو دوکانو .. قۆنتەرات؟))

نائومێدانەتر ڕووی وەرگێڕاو نەیهێشت چاوەکانی بخوێنیتەوە، لەسەر مێزەکەی تەنیشتی بە فێڵی وردبوونەوە لە وێنەیەکی تۆ کە لە نەورۆزێکدا گرتبووتو گوڵێکی سوورت دابوو لە قژت، چەندە پتر سەیری دەکرد ئەوەندە گەنجتر دەینواند .. بێئەوەی ڕوو لە وێنەکە وەربگێڕیت، بینیت دەستەکانی دەلەرزینو پیشی دەخواردەوە .. بە قەهرێکەوە وتی..

( (من ڕێزم هەیە بۆ قسەکەت .. هەموومان نین .. هێشتا شەریفمان تیا ماوە .. دەتوانی لە من بپرسیت.))

( (هەست دەکەم تۆش حەزدەکەیت لە من بپرسیت .. من ناتوانم لە تۆ بپرسم .. لەوە ماندووترم .. لە شووکردنی نەنکی نەنکمەوە نەبووە

بە عادەت لە پیاو بپرسیت .. ئێستاش هەر وایە .. من بۆخۆم وەک دەبینی کچێکی دۆڕاوم بە عورفی هەموو کەس ..))

((نا .. نا .. بە عورفی من نا .. تکایە، من ئەوەندە دواکەوتوو نیم لە ڕابردووی کچێک بپرسم، منیش ڕابردووم هەیە خانمەکەم .. جگە لەوە ژنو ماڵم هەیەو .. وەک دەڵێن تەڵاقی ڕۆحیمان لە بەیندایە .. واز لەوە بێنە .. لەم ڕەسمەدا زۆر ئاسوودەو ڕازاوە دیاریت!))

((ئێ خۆ ناکرێت هەموو دەم لە پرسەدا بین!))

گەرەکی بوو باز بەسەر هەموو شتەکاندا بداتو ڕێگاکە کورت بکاتەوە، بۆیە لە پێچێکی دیکە بۆت هاتەوە، بەس زۆر زەبوونانە بوو کە وتی..

((ڕازی دڵم ئەوەیە کە هەق نییە ئەوەندە پیرو پەککەوتە بمبینیت، ڕەنگە دە- پازدە ساڵانێکمان بەین بێت .. تۆ بڵێ بیست.))

ناچاری کردیت ئەو ڕۆژەی بخەیتەوە یاد کە کوکوختییەکەی پێکاو لەو ئاسمانەوە کەوتە بەردەمی تۆ..

((بیرتە یەکەمجار کە تۆم بینی لە باخەکەی خاڵم، نیشانەتان لە مەلەکانی ناو باخەکە دەگرتەوەو ئاسمانتان گڕ دەدا، ئەو کوکوختییەی کە پێکاتو بۆی دەگەڕایت بە دوایدا .. من هەڵمگرتەوەو ناشتم!))

تا کۆتایی گوێی لەتۆ گرت، سوور هەڵگەڕاو شەرم دایگرت، بەڵێنی دا کە لەبەر دڵی تۆ ڕاو لە خۆی حەرام دەکاتو تاپڕو ساچمەزەنەکان دەکات بە دیاری، بە سەرسامییەوە وتی..

((ئەوە یەکەمین جارمە کەسێک ببینم ئەوەندە ڕقی لە ڕاوکردن بێت،

پاشان من بە نیازی کوشتنو گۆشتی مەلو حەیوانە کێوی ناچمە ڕاووشکار، بەزمێکەو بۆ خۆشی سازی دەکەین، وەرزشەو ئارەقە دەردەدەم ..))

( (ڕاوەکەی تۆ بەزمەو خۆشە، بەڵام ئەوان بە ڕاستی دەکوژرێن، ئێوە تەیرو حەیوانە کێویتان لەم وڵاتە قڕکردووە، ئەوەشی ماوە تۆقیوەو هەڵەتەی ئەودیو سنوورەکانیش بوون، ئەوانیش کە زیندوون وەک منو تۆ حەزدەکەن بژین، هێلانەیان هەیە، بێچوویان هەیە، وەک تۆ حەزیان لە سۆزو پەیوەندییە، دەزانی لەو ڕۆژەوەی تۆ کوکوختییەکەت کوشت، تابلۆکانی من پڕبووە لە کوکوختیو کەو و کۆترو کارمامزی کوژراو، لەیادمە هەتا لە ڕەوەکەش ئەو چەک بەدەستانەی هاوسەنگەرت پاشەڵیان لە دوژمن کردبوو، کەچی لەو ڕەشەڕاوە نەدەکەوتنو بەناوی برسییەتییەوە بە سەدەها مەلو گیانداری ئەو دەشتو کێوەیان کوشت، لە سوێسکەوە تا بەراز..))

هەستایەوە سەر پێو دوو دەفتەری گەورۆنەی ڕەسمت بۆ هێنا بەو نیازەی هەست نەکات کە تۆ دوژمنکارانە بەرخوردی لەتەکدا دەکەیتو بشزانێت کە خەمی ئەو ڕاوە لە دڵی تۆدا چەندە گەورەیە، کە بینیت بەدەم هەڵدانەوەی لاپەڕەکان سەرسامو خامۆش تاس دەیباتەوە وەک ئەوەی کە بڕوا بە چاوی خۆی نەکات، تۆ وازت لێهێنا نیگارەکان بیباتەوە ناو خوێنی ڕژاوی گیاندارەکانو گوێی لە چریکەی خوێنینی باڵندەکان

بێت .. نیگاری ئاسمانێکی شینو سەدەها مەلی خوێناوی، درەختێکی بەردار کە لەبری هەرمێو سێو مەلی مردووی گرتبێت، زەوییەکی پڕ لە گۆلاو و لیتەو قوڕ کە پڕن لە مەلی خنکاو و سەرئاوکەوتوو، سەدەها مەلی پێکراو و دەنووک چەقیو لە چڵکاو، ئاسمانێکی بە هەورو هێڵ تاسەر خاکیش شاپەڕی هەڵوەریو و بڵاو لەنێوان بۆشایی عەردو ئاسمان، هێلانەی داڕماو و .. هێلکەی سپیو خاڵداری زۆر و شکاو، دوو کەوی هەڵفڕیو کە هێشتا دوورنەکەوتوونەتەوە لە تەختەی زەوی گرتێبەربوو، نێرو مێ، مێیەکەیان پێکراوەو نێرەکەیان بەرزتر فڕیوە بە ئومێدی قورتاربوون لە ساچمەی وێل، سەبەتەیەک پڕ لە کۆترە شینکەی کوژراو کە مارێکی زەرد لەناوەڕاستەوە وەک تیغ دەنێو کۆترە کوژراوەکاندا چەقیوە، تفەنگێک کە بووەتە جۆلانە بۆ ڕیزێک لە پۆڕ و ڕەنگاڵە، سەدەها فڕندەی تیکەڵو کوێر کە لەبری گەڕانەوە بۆ هێلانەکانیان، سەرلێشێواو پۆل پۆل خۆیان کوتاوە بە دیواردا، چەندین قەفەزی هەڵواسراو و سیخناخ بە شەهێنو قەلەباچکەو سوێسکە، دەیەها کەناری کە لە ترسی چەندین گوللە بە دوایانەوە خۆ هەڵدەکوتنە ناو قەفەزی کراوە، هەر هەمووشی دەنووک شکاو، دە سیسارکە کەچەڵ دەنووکیان بۆ پۆلێک لە پۆڕی پێکراو و پۆلێک لە کەنسمەو پەپووسلێمانکە کرابۆوە کە نزیک بوون لەوەی بکەونە ناو قورگی سیسارکە کەچەڵەکانەوە، دەیەها داڵەکەرخۆر کە هەریەکەو پاسارییەکی کوژراو دەفڕێنێتو بەدەم بای فڕینەوە قووتیان دەدەن

...

تۆ لێی ڕادەمایتو دەتویست بزانێت کە ئەو ئێستاکە جگە لە ڕاوچییەکی دڵڕەق هیچی دیکە نییە، تۆش لەبەردەمیدا نێچیرێکی دوورە دەستیو ئەم حەز دەکات بە ساچمەیەک پەڕوباڵت هەڵوەرێنێت. دەفتەرەکەی داخستو نەوێرا دەفتەری دووەم بکاتەوە، بەناو لەپی ئارەقەی سەر تەوێڵ و کەپووی سڕی..

((ئەم ڕەسمانە ترسناکن .. من زووتر وتم فەننانی .. بەس هەست ناکەیت کە جەنابتان موبالەغتان کرد بێت؟))

وەک ئەوەی قسە بۆ قوتابییەکی هونەر بکەیت پێتوت..

((بێ زیادەڕۆیی هونەر هیچی پێناکرێت، گەر وام نەکردایە تۆ وا غەمگینو گرژ نەدەبوویت، گەمەکەی ئێوە لەوە خوێناویترە، چونکە تۆ خۆت نە کۆتری کوژراو و نە پۆڕی خوراویت..باکت بە چییە، با پێتبڵێم گەر پیاو توانی مەلێک بکوژێت، دواتر کوشتنی ئینسانیشی لەلا ئاسان دەبێت!))

((خودا عافووتکا ..تۆ زۆر ئاڵۆزت کردووە.. ئاخر لەوەتەی دونیا هەبووە .. ڕاویش هەیە ..خانمەکەم.. گەر ڕاوکردن نەبووایە بنیادەم قڕی تێدەکەوت .. خۆ جەنابت خوێندەواریو دەزانی لەوەتەی بنیادەم لە ئەشکەوتەکان ژیاوە .. ئەم بەزمە هەر هەبووە.))

((دروست وایە .. بەڵام لەو سەردەمانەدا کە خەڵکی برسی بووە ..

ڕاوی کردووە ..))
( (دەزانی خەریکە ئەوەم لەبیر ببەیتەوە بۆچی هاتووم، چی ئێمەی هێنایە ناو باس‌و خواسی ڕاووشکار؟))
( (هاتنەکەشت بۆخۆی جۆرێکە لە ڕاو، بەڵام ڕاوێکە کە دایک‌و باوکم‌و هەر هەموو کەس‌و کارو شەرع‌و دادگا وەک ڕاوەکەی تر بە ڕەواو حەڵاڵی دەزانن!))
( (دەزانم چەندە تووڕە‌و برینداری‌و .. هەقتە، بەس من ڕاوت ناکەم‌و ڕێزو خۆشەویستی منی هێناوە، دەشزانم زەحمەتە باوەڕ بە پیاوێکی وەک من بکەیت کە بە خوێنخۆرم دەزانیت .. ئەو قسە زۆر ڕەقانەی لە ڕووی مندا دەیکەی پتر سەرسامم دەکا، کەم ژنم دیوە چاو ببڕێتە ناو چاوی پیاو و قسەی خۆی بکات‌و شەرم نەکاو نەلەرزێ.))
( (نەموتووە خوێنخۆری، ئەو ڕاوەی تۆ ڕاست‌و ڕەوا نییە بۆ من.. گەرچی لای هەمووان تۆ گوناهت نەکردووە، ناوبانگی تۆم بە خراپ بیستووە، گوایە هەفتانە خۆت‌و هاوڕێکانت دەچنە ناو ئەو شاخ‌و کێوە .. دەست ناپارێزن، تۆ لێت پرسیم بۆچی تۆم لا پەسەند نییە، دەفتەرەکەت بینی .. ترسای لەو هەموو مەل و حەیوانە کوژراو و پێکراوە، یەکەمجار تۆم بینی بە تەماعی ڕاوچێتییەکەوە لە منت دەڕوانی .. لە ڕۆژی کوشتنی کوکوختییەکەوە لە تۆ بەدبین بووم، ڕەنگە گوناهی تۆش نەبێ .. خۆم لە گێژاوێکی گەورەدا دەژیم ..))
( (پێمبڵێ چیبکەم ..؟ ڕاوەو سوێند بێ نەچمەوە سەری.))

دواجار .. چارەنووس بوو .. نائومێدی .. تۆڵەو تۆران لە دونیاو درۆکانی ئەوینداری، فریو و خەمێک کە هەموو ڕۆژێک لە ڕۆحتی دەخوارد، ترس لە قەیرەیی‌و تەنیا کەوتن .. پووچی چاوەڕوانی بەڵێنەکان .. قسەو قسەلۆکو ستەمی زاڵو نەبڕاوەی کچ بوون‌و کچ نەبوون، نیگای پڕ لە گومان‌و پرسیاری باوکو دایکو کەس‌و کار یان شاردنەوەی ڕسوایی‌و کڕینەوەی شەرەفی بنەماڵە .. یان مەحاڵی هەڵگرتنەوەو دۆزینەوەی ئەو چەند دڵۆپە خوێنەی ڕووسووریت کە لەو ساوە تا ئێستا ڕووبارێک خوێن‌و فرمێسک بە پەنهانی لە تۆدا دەڕواتو .. دەڕوات ..

((خودا هاوار .. تا کەی ئەم خوێن بەربوونە ..؟))

شەوانە لەتاو تەنیایی‌و بێئۆقرەیی خەوت لێ دەزڕێو پێخەفەکەت بەجێدێڵیت، پێخەفێک دڕکچن‌و ساردو سڕ، دەچیتە بەر ئاوێنەکەو بێئاگا لەخۆت قژی تەواو شێواوت دادەهێنیت، جلێک بە جلێک دەگۆڕیت، کراسەکانی شەوت تاقی دەکەیتەوە، لە ڕووتی خۆت ڕادەمێنیتو جوانییەک کە تەنها چاوەکانی پیاوێکی عاشق وەک ڕەنگێکی گەش دەیپرژێنێتە ژێر پێستتەوە نەماوەو لە تۆدا پەرپوەو هەڵاتووە، دە جاران قژت دەهۆنیتەوە، دەیکەی بە کەزی‌و بسکو پاشان هێواش‌و مردووانە دەیکەیتەوەو بەسەر سینەو مەمکتدا پەخشیان دەکەیت، کە تا سەر مووسڵدان‌و چاڵی سەروو سمتت دەکشێن، پەژارەو مەراقی زۆر خوێنی گەشی سەر کوڵمەکانتی ڕاوناوە، ناچار بە تەنکە ماکیاجێک

ڕەنگەکان قەرز دەکەیتەوە، بەڵام هەرچی دەکەیت بریقەو پڕشنگی پڕ لە تینو تاوی چاوەکانت بۆ ناگەڕێتەوە، لەو شەوانەدا کە شار کپو خامۆشە وەک ئەوە وایە بە دزییەوە بچیتە ژووانی عاشقەکەت، هەر شەوەو جلێک دەپۆشیت، کراسێکی خەوتن جیا لەوەی کە شەوانی پێشتر لەبەرت دەکردن، بێباک لە سەرماو گەرما بەرامبەر بە منارەکەت کە هەمیشە نواڵەیەک دەبووە بازنەی دەوری سەری، کەڵەگەتو هەڵکشاو بەناو تەمو تریفەی زیوینی مانگ یان شاراوە لە ژێر پاڵتۆیەکی ڕەشی قەرز کراو لە شەوە تاریکەکان، لە یادت نەماوە کێ وتوویەتی کە مرۆڤ نەیتوانی دۆستی مرۆڤ بێت، دەکرێت پەیوەندی لەگەڵ ڕەگەزەکانی سروشت و شتەکانی دەورو بەری خۆشتر بکات، جا با درەختێک بێت، جۆگەلەیەک، ئەشکەوتێک، باخێک، هەتا سەگو پشیلەیەک، منارەیەک .. ئەوەندە ئولفەتت بەو منارەیەوە گرتووە کە شەوانە بە کەوتنی خشتێک لە باڵای شەنگی منارەکەت، تۆ لە خەو ڕادەچڵەکیتو ڕادەبیتو یەک دووانێک لە پاسەوانەکان دەکەونە دواتو پێیان سەیرە بەم نیوە شەوە بۆ هەڵگرتنەوەی خشتێک هەنگاوی چوستو خانمانە دەنێیت چ باران بێتو چ سایەقە، وەک ئەوەی دڵنیای بکەیتەوە کە بێداریتو ئاگات لە خەمی ئەو بووە کە خشتێک بەجێیهێشتووە، چەند جارێک دەستی لێدەدەیتو دەمو لێوت لە خشتەکانی نزیک دەخەیتەوە وەک ئەوەی بۆنی بکەیتو ماچی بکەیت، وەک ئەوەی بە گوێیدا بچرپێنیت کە مەحاڵە بە بێ

کەسی فەرامۆشی بکەیت، یان سوپاسی بکەیت کە منارەکە لە سەد عاشقو پیاو و کەسو کارو هاوڕێ بۆ تۆ جوانترە، ئەوەتا لەوێدا هێشتا قیتو قۆز چەقیوەو پای داکوتیوە، وەک ئەوەی ئەمیش دڵی نەیەت تۆ بەجێبێڵێت .. ئاخر کام پیاو هەیە لە تەک دڵدارەکەیدا، ژنەکەی، خوشکەکەی، دایکەکەی، دۆستەکەی ئاواهی بەئەمەک بێتو لە دونیایەکی وا سپڵەدا ئەو هەموو ساڵانە بسرەوێت، وەها شەیدا بووە کە گۆشە نەماوە لە ماڵەکەدا، سەر تاقو پەنجەرە، سەر مێزەکانو ڕەفەی کتێبخانەو کاونتەرو ناو پێشانگا شووشەبەندەکان مینیماڵ و کۆتەڵی منارەی تێدا نەبیت، بە قەوارەو قاڵبی جیاواز، هەندێکیان هەر بەقەد پەنجە تووتە کە لە تەنیشتییانەوە گرێ گرێ منارەی باڵاتر ڕیز دەگرن، یان منارەی یەک بستی سەر سەکۆیەک کە چەندین منارەی باڵاتر گەمارۆیان داوە، هەمیشە دزینی ئەو منارانە لەلایەن منداڵو مەزنەوە کە بە بیانووی جیاوازەوە دەهاتنە ناو ماڵەکە زۆر ئاسان بوو، هەر بۆیە کەم ماڵی کەسو کار، دەرو دراوسێ هەبوون سێ چوارێک لەو منارانەی نەخستبێتە ناو جامخانەو پێشانگاکانی ژووری میوان، ئەوەندە شەیدا کە جاروبار وەک پیاوێکی عاشقو زۆر سەنگین لە خەونەکانتدا دەتبینی چۆن بۆ تۆ دەنوشتێتەوەو لەودیو پەنجەرەکەوە سەرەتاتکێ دەکاتو لە شووشەکە دەداو دەرگای بالکۆنەکە دەکوتێو لە وێنەی شاسوارێکدا دێتە ناو پێخەفەکەتەوە، ڕایدەموسیو ئەوەندە چکۆلە دەبێتەوە کە لەناو ئامێزتدا جێگەی خۆی دەکاتەوە، هەر

هەناسەو نیگاو لەمسەیەکت ئەو پیرە منارەیە لە بناغەوە نۆژەنو زیندوو دەکاتەوە.

شەوی واش هەیە لەتاو پرخە پرخی هۆمەر کە واتدەزانی لە تەکتایە، ڕادەچەنیتو خوداوەندی خەونەکانت بەنەفرەت دەکرد، ناچار ڕادەبوویتو گوڵەکانی ناو ئینجانەکانت ئاو دەداو لە باڵای منارەکەت ڕادەمایت، خەونە ناخۆشەکانت دەیبردیتەوە ڕۆژگارێکی تاڵتری ژێر کەپرەکەو خوێن بەربوونێک کە خۆتو پێخەفەکەت سەر خوێناو دەکەوتن، دەچوویتەوە ئەو ڕۆژگارەی بەهرام دەستی دەگرتیو بەناو باخەکەدا ڕاوەدووی دەنایت، هێشتا تازە بنی مەمکت دانابوو، ئەویش سمێڵی گوگرە ببوو، بەسەر نەرمە شەپۆلی سەما کردووی جۆگەلەکاندا ڕاوەدووی پەپوولەکانی دەنا، یەکەمجار کە لە بەهرام تووڕە بوویت، ئەوکاتە بوو کە بە دزی تۆوە دەیەها پەپوولەی ڕەنگاو ڕەنگی ڕاوکردبوو، لە دەفتەرێکی گەورەی پەڕ ئەستووردا بە دەرزیلەو سیکۆتین پەپوولەکانی بە لاپەڕەکانەوە چەسپ کردبوو، هەندێکیان بەقەد لاشەی بچووکی خۆیان ببوون بە ڕەسمێک بەسەر لاپەڕەکانەوە، هەندێکیان باڵ هەڵوەریو یان سەر قرتاو بە تەنها وەک پەڵەیەک مابوونەوە، بۆ ئەوەی نەبن بە تۆزو ئارد بە کەتیرەیەکی لینج بە مۆمیاکراوی تازە ڕاوکراوەکان بە لاپەڕەکانەوە دەنووسان، بۆ هەر بیست لە پەپوولەکان بیست پەنجەرەی چوارگۆشەی هەڵکۆڵیبوو

کە دەنیشتنە سەر لاپەڕەیەکی دەستکاری نەکراو، کە بینیت مات بوویتو بۆ مەرگی پەپوولەکان هۆن هۆن گرییایت، تاوەکو خۆت کڕ نەبوویتەوە، ئەم نەیتوانی ژێرت بکاتەوە، ئەم بەو نیازە دەفتەرەکەی پیشان دایت تاوەکو بیکات بە دیاری تۆ.

لەو ڕۆژەوە شەوان خەونت بەوەوە دەبینی کە تۆ پەپوولەیەکی ناسکیتو هەموو ڕەنگەکانت لە سروشت خواستووەو بەهرام ڕاوەدووت دەنێتو تا دەتگرێت، دلْڕەقانەو بێباک لە ئازارت دەرزی ئاژنت دەکات بە لاپەڕەیەکی سپییەوە، دەرزییەک بۆ کەللەی سەرت، دوو دەرزی بۆ باڵەکانت، دانەیەک بۆ پاییێنت، پەپوولەیەکی گەورۆنەو لە خاچ دراو، تا ئێستاش جاروبار کە بەدەم خەمو خەیاڵی بەهرام-ەوە دەخەویت، لە خەونەکانتدا ڕاوت دەکاتو هەر جارەو بە دیواری ماڵێکەوە لە خاچت دەدا، جار جار ڕێبوارێکی پیر دێتو ڕاگوزەر بەزەیی بە تۆدا دێتەوەو .. بەزەیی بە باڵەفڕەو نووزەی مەرگی تۆ، باڵ هەڵوەریو لەو دیوارەت دەکاتەوە، دەیەوێت ئازادت بکات، وەلێ تۆ لە فڕین کەوتوویتو دەکەویتە بەر پێیانی، ناچار هەڵتدەگرێتەوەو دەتخاتە ناو گیرفانی گەرمی کە پڕە لە پارەی ئاسن کە کاست دەکات، تۆ دەمریتو جگە لە زرینگانەوەی پارەی ئاسن لە گیرفانی ئەو پیرەمێردەدا هیچ نابیستیت.
جارێکیان کە خەونەکانت بۆ گێڕایەوە، سوێندی بە چاوانت خوارد کە

تا ماوە پەپوولە ڕاو ناكات .. تۆش غەمگینانە پێتوت..
((تازە كێ ئەو پەپوولە مردووانەی پێ زیندوو دەكرێتەوە .. چۆن دڵت هات؟))
داماو تەریق بۆوەو هیچی نەوت. شەرمی هەرە گەورەی ئەو ڕۆژە بوو كە دەفتەری ڕەسمەكەت هێناو پڕبوو لە پەپوولەی باڵ هەڵوەریو، لە هەمووی كوشندەتر ئەو نیگارە بوو كە تۆ بە ڕووخساری خۆتەوە ببووی بە پەپوولەو كوڕێك لە شێوەو بەرگی ئەودا لە خاچی دەدایت، لە خوارەوەش چاڵێك كە ببوو بە زبڵخانەی پەپوولە مردووەكانو لە ژێرەوە نووسرابوو..»زبڵخانەی پەپوولە كوژراوەكان.»سوور هەڵگەڕاو بە داخێكەوە وتی..
((تۆ بۆ ڕقت لە منە .. شادی؟))

وەڵامیت نەدایەوە، كە چاوەكانت هەڵبڕی .. ببوون بە دوو دڵۆپە فرمێسكی درشت، بۆ تۆ خەیاڵەكە تا ئەو شوێنە دەیبردیت: ئاخۆ لە خاچدانی پەپوولەكان چ لەزەتێكی هەیە؟ بڕی ئەو بێباكیو دڵڕەقی ئەو كوڕە تازە هەڵكەوتووە لەكوێوە هاتووە؟ هیچت نەوت، لێ لەنێو ئەو هەموو قەهرو خەمەدا سۆزێكی گەرم لەناوەوەڕا پەراسووەكانتی دەسووتاند، بە هەمان ئیقاعەوە وتی..
((هەر دوو دەفتەرەكەم دەسووتێنم!))
غەمگینانەو بە قورگێكی پڕ لە گریانو بە دەنگێكی نووساوەوە پێتوت..

( (ئەوەیان خراپترە ..))

( (چی بکەم .. خۆم هیچ گەمەیەکی تر نازانم .. دەتەوێت لەجێگەی هەر پەپوولەیەک بمکوژیت، بۆ وام لێدەکەیت هەست بە گوناهێکی وا گەورە بکەم؟ تەواو .. مەگری .. واز لەو گەمەیەش دێنم ..))

هەرگیز وازی نەدەهێنا، چ شەڕ بووبێتو چ ئاشتی، ئێوە دووانەی ڕۆحی یەکدی بوون، کە منداڵ بوون هۆگری یەکدیبوون، ئەوەندەی کە هەراشتر دەبوون پترو پتر بەبێ یەکدی هەڵتان نەدەکرد، تەواو فەراقە ببوون و کەچی لەناو هەمان ئاودەستدا پێکەوە میزتان دەکرد، تاوەکو دواجار خاڵۆژنت لێکی کردن و ..وتی..ئیدی تەواو..پەلامیزەی منداڵی با بەس بێت..! لە یاریو زرمەزلێ نەدەکەوتن، گەمەی کچانەو کوڕانە بۆ هەردووکتان مانایەکی نەبوو، ئەوەی کە لەسەری بەشەڕ دەهاتن ئەوەبوو کە تۆی کچ تا دەهات باڵات دەکرد، بەهرام-یش وەک کەسو کار بە لاقرتێوە دەیانوت کە کوڕیژگەکە تا دێت بەناخی عەرزدا دەچێتە خوارێ، تا تۆ بناغەی مەمکت داناو تا کوڕە سمێڵی گوگرە بوو پێکەوە دەچوونە حەمامی بازاڕ و خۆتان دەشووشت، زرنگانەوەیەک لە دەنگتدا بوو کە لە قەرارێکەوە دەهاتو بە ئاستەم دەگەیشتە گوێ سیحری لە هەموو کەس دەکرد، دەبوو کەسێک ورد گوێ شل بکات دەنا هەندێک لە ڕازو نیازەکانتی لە کیس دەچوون، دەنگێکی منگنو غەمینو کەرخ کە بە تەنها لە کچە نەخۆشەکانو عاشقەکان وەدەردەکەوێت، تۆ شێتی ئەو شیعرانە بووی کە نەتدەزانی

ئەو بیژمۆتە لەکوێوە دەیانهێنێ، سورێ دەتزانی کە هی خۆی نییە، کەچی سوێندی دەخوارد هی خۆیەتی، لە فیلمە هیندییەکانەوە فێری خۆنواندنو ڕۆمانسییەتێکی درۆزنانە ببوو کە هارتری دەکردیت، بێباک لەوەی کە دەهری دەبیت هەر رۆژەو بە بەزمێکی تازەوە دەهاتەوە، پاڵەوانی هەر فیلمێک فێری بەزمێکو وەستانو قژ داهێنانو جلو بەرگێکی دەکرد کە پتر دەیکرد بە قەرەقۆز تاوەکو گەنجێکی شیک، بەو دەنگە گڕەوە کە خۆی خۆشی لێدەبینی بە نەڕەنەڕە ناقۆڵاکەی ماڵەکەی پڕ دەکرد لە غەڵبەغەڵب، وەک ((شامی کابوور)) هەمیشە پەڕۆیەکی سوور.. شین یان سەوزی لە مل دەبەست، هەر جارەو ڕەنگێک، هەر هیچی دەست نەکەوتایە، شاڵێک یان ڕەفتەی یەکێک لە خوشکەکانی لە مل دەئالاند، کە تۆ دەتبینی بەدەم قاقاوە دەخنکایت، بە پێڵاوی پاژنە بەرزو کاکۆڵی هەڵدراوەی بۆ سەرەوە کتومت لە کەڵەشێرێکی پۆپنەدار دەچوو کە هەمیشە حەز بکات لەسەر سەکۆو بارەدارو تەپۆلکە بوەستێتو بقووقێنێ، لە منداڵییەوە زۆرانێ گرتن یەکێک لە بەزمە خۆشەکانی هەر دوو بنەماڵەکە بوو، بەزمەکەش بەوە گەرمتر دەبوو کە مریشکەکە بتوانێت کەڵەشێرەکە ببەزێنێت، هەر واشیان ناوزەد دەکردن، چش لە بەزین مادامەکێ سینەو مەمکی ساوات لە سینەی تەختی ئەم دەخشێت، یان هەناسەی شیرینت بەدەم هانکەهانکەوە، بریقەی چاوە هەنگوینییەکانی تۆ، بۆنی ئارەقەت، چنگ خستنە ناو چنگی یەکدی کە چ تەماسێکی گەرم

لەناو لەپەوە تا موولوولەکانی کەللەسەر دەنێرێ، تا ئەو ڕۆژەی لە ناندینەکەی ماڵی بەهرام-دا کەوتنە زۆرانێ، ئەم جارەیان تۆ کەوتیتە ژێرەوەو دەمو لێوی تەنکو بەرملی زەردت کەوتە بەر هەناسەی ئەو بیژمۆتە، لە خۆ ڕاپسکاندنێکدا دەمو لێوی پتر خزایە سەر لێوانتو چەناگەت، تاوێک وەستان .. تاسانو ترسان، هەر بە سەلیقەو هەستی خۆڕسکی کچانە زانیت ئەمەیان ئاکامی خراپە .. وا چاکترە دوا زۆرانێ بێو .. ئیدی منداڵی ماڵئاوا، تەنها تەماسێک کە کەیفی دەخستە دڵەوە دەنێو زەماوەندو ڕەشبەڵەکێکدا دەرەخسا، ساڵان تێپەڕینو شەرمو ترسێکو حەزێکی خنکاو و شاراوە جێگەی گرتەوە، جووڵەی هێورتر لەبری بزێویو گەمەی هار، ڕەوتێکی پڕ فیزو هەوای درۆزنانە، چاوەکانی تۆ ئەم هەموو گۆڕانەی دەبینیو خۆزگەت بە منداڵی دەخواست، بە سەردەمێک سادەتر لە ئێستا، ترسێک لەوەش لە چاوانی هەردووکتاندا ڕەنگەکانی دەگۆڕان .. ئاخۆ داهاتوو چی بۆ هەڵگرتوون؟ تۆش هەمیشە غەمگینو خامۆشانە دەفتەری ڕەسمەکەت دەهێناو سکێچ لەسەر سکێچت دەکرد، شپرزەو تێکەڵ کە جگە لە خۆت کەس نەیدەتوانی سنووری هێڵەکانو بازنەکانی سکێچەکان لە یەکتری جیا بکاتەوە، دوای سێ ساڵیش لە باڵقبوون تۆ نەتدەتوانی خۆت لەو ڕەسمە باوانەی سەردەمی منداڵی قورتار بکەیت .. نیگاری چەند باڵندەیەک کە بەسەر دەشتێکی سەوزدا دەفڕین، دایکێک بێشکە ڕادەژەنێت، گۆڕێکی تەنیا، چەند کچێک بەدیار حەیوانێکەوە داماون کە

دیار نییە کەروێشکە یان پشیلەیە، سەیرانی خاو و خێزان، تاڤگەیەک کە دەڕژێتەوە ناو گۆلاوێکی بەردین، شاخی سەرکەش‌و ترۆپکی بەفرین، ڕەسمی سادەو بە ڕەنگە زەقەکانەوە کە کچێک چەندە دەستڕەنگین بێت مەحاڵە لەوە جوانتری پێ بکرێت کە ڕێگەی دووری نێوان ماڵ‌و قوتابخانە بێ، بێجگە لە یەک- دوو سەیرانی بەهاران، چەندە پتر ڕەسمت دەکرد ئەوەندە پتر چاوەکانت گەشتر دەبوون، پێستت لە ژێرەوەڕا ڕوونترو پاکترو سپیتر دەدرەوشایەوە وەک ئەوەی ڕەنگە کراوەکان لە ڕۆحی تۆوە هەڵقوڵێت، ڕۆشناییەک لە هەموو گیانتەوە سەربکات‌و لە ڕووخسارتدا پەرش‌و بڵاو پڕشنگ بداتەوە، دەم‌و لێوێکی شەهوانی کە مەحاڵ بوو لەتەک سەلاری‌و سەنگینی خانمە چکۆلەیەکی ئاواهی یەکدی بگرێتەوە کە نوقمی شەرمێکی تازەی دوای باڵقبوون بوو، دەم‌و لێوێک سێبەر کردوو بەسەر چەناگەیەکی خڕو قنجدا کە هەوەسی نێرەوزەکان گەرمتر بکات، ئەوەی بەهرام-ی ترساند نیگای شەیتانانەی کوڕوکاڵ‌و پیاوەکانی بنەماڵەو دەرو دراوسێ بوو، ناچار کوڕانی گەڕەک‌و خزم‌و خوێش بە دزییەوە ناویان دەبرد، کە بەهرام دەربکەوتایە خامۆش دەبوون، زەحمەت بوو بە تەنیا خۆی ئەو هەموو جوانییە ببینێ، لەوەوە پتر گڕی گرت کە وێنەی تۆ لە چاوی پیاوەکانی دیکەدا چ ڕەنگ‌و زەوقێک دەنوێنێ، دەرکەوتنی تۆ لە ئاوێنەی ئەوانی دیکەدا تا دەهات پتر دەیتۆقاند، چ سیحرو جووڵەو زیبابییەکە کە ئەو هەموو نێرەوزە حەیرانی بوون، ئەم چی نابینێ کە ئەوانی دیکە

دەیبینن، پێکەوە گەورەبوون لە تەک کچێکدا وادەکات وەک تەنێک بەدەر لە جوانیو حەزو هەوەس بیبینیت، ناچار لە هەموو ئازای جەستەت ورد دەبۆوە، هەر ڕۆژەو دەگەڕا بۆ سیحرێکی تازە، گەر لای هەمووان گەوهەری یەک دانەیە مەرجە خۆی دەسکەگوڵەکە بباتەوە .. عەجایب .. دەبوو چاپووکانە بەخۆ بکەویٚ، ئەو دەنگە خنکاو و نیانەی کە ئەم گاڵتەی پێدەکرد گوایە لە بنی بیرەوە دێت، لەو دەمو لێوە خوێن بزوێنەوە دادەکەوت وەک ئەوە وابوو لەسەر زەمینێکی دیکەوە بێت کە تەنها لە گێڕانەوەی ئەفسانەکانەوە ڕۆح دەخرۆشێنیٚ بێئەوەی گوێت لە پەریزادەکە بێت لە ژوانێکی پەنهانی خۆیدا لەگەڵ میرزادەی عاشقدا چ ئاوازێکی شیرین لەو زاری پڕ لە ڕازەوە دادەڕژێت، زرنگانەوەی سەدایەک کە لە پەڕەی ڕۆح دەدات، ڕوانینی بیٚ مەبەستو نیاز کە بێئەوەی ئەو بیەوێت بانگت دەکات خۆت لەناویدا بخنکێنیت، ڕەوتو بەڕیٚ ڕۆیینی خانمانەت .. هەنگاوی چوستی دونیایەک مێیینەیی لیٚ دەتکیٚ کە گەسک لە پیسی دونیا بداتو لە پاژنەو پیٚو پووزی پاکی جواناوێک بڕژێت، باڵات بەدەم هەنگاوەکانەوە کە بە حاڵ زەویان دەگرت لە پیاسەی سەروویەک دەچوو یان سوورە چنارێک لە گویٚ چەمێکدا، قژی خورمایی چین چین ڕژاو بەسەر شانو ملو کەمەردا وا دەکات بێباکترین نێر کە خودای فیزو شکۆمەندی بێت.. هیچ ویقارێکی نەمێنیٚو لە کەشکە ئەژنۆی خۆی بداتو سەری زمانی بقرتێنیٚ لەتاو ئەو هەتاوەی بە سەد ڕەنگەوە پڕشنگان داوێت، هیچ

پیاوێکی خوداپەرستیش نەیدەتوانی سەیری بکاتو ڕووتی نەکاتەوە، یان بخوازێت تا ماوە لەسەر بەرماڵەکەی هەڵنەستێت، بەڵکو ئەوە خوایەو میهر بنوێنێ هەر هەفتاو دوو پەرییەکانی ناو بەهەشت لەو خانمە بچن، نەدەکرا لەبەردەم ئەم حەزو هەوەسە گەرمو شەهوەتە سوورەی ئەو هەموو کوڕوکاڵەی گەڕەکێ کە ئامادەبوون بە برژانگ و برۆیان بەرپێیانو بەر دەرگای ماڵەکەت بماڵن .. سەد جاران قوربانت بن، نەدەکرا دەستەوەستان بێتو هیچ نەکات، ماوەیەکو خووی دایە زۆرخانەو فیلمە هیندییەکانی فەرامۆش کرد، کەوتە وەرزشی ئاسن تا ماسوولکەکانی بەهێز بنو وەک لۆمپنەکان خۆ بنوێنێو سەری پاک تاشی تا نێرترو ناشیرینتر دەربکەوێت، هەر بۆ ترساندنی ئەو هەموو عاشقە ڕووتەڵەیە گەمەی بە دامر بۆکسو چەقۆو قۆچەقانی دەکرد، شەللاتیانە شانی لە شانی ڕێبواران دەداو سەرسەرییانە جڕتی بۆ ئەکبەر واحید دەکێشا، دەبوو هەر هەمووان بترسێنێت، بۆکسی لە دیوار دەدا بێئەوەی دەستکێش بکاتە دەستی، هەموو ڕۆژ گوێزانی لە سمێڵو ڕیشی دەدا تاوەکو تووکنتر بنوێنێت، هەرجارەو ملی دەنایە بەر ملی یەکێک لەو کوڕانەی خۆیان بە پاڵەوان دەزانی، داوای زۆرانێی لێدەکرد، وای لێهات هەمووان خۆی لێ لابدەن، لە سێ چوار شەڕو گێچەڵدا زامار بوو، لای دۆستو ئاشنا ڕایگەیاند کە تەواو تۆ هەر لەسەر بێشکەوە مارەبڕی ئەمیت .. ئەوەی لێت نزیک ببێتەوە خوێنی خۆی لە ملی خۆیەتی، کە زانیت خۆی تووشی چورتمو گۆبەندێک

دەکات، هەڕەشەت لێکرد، گەر واز لەم ئەتوارە هیچانە نەهێنێت تا ماوە نایناسیت، چش لەوەی دەتۆرێت، ئاشتبوونەوەت کرد بە مەرج، ئەگینا واهی بڕوات ناشیرینتر دەبێ، سوێندی خوارد کە هێور بێتەوە، بەڵام بە دزییەوە وازی لە ڕاوە پەپوولە نەدەهێنا، گەرچی تۆ نەتدەزانی کوشتنی هەموو گیانلەبەرو زیندەوەرێک تێکدانی ڕەگەزێکی ئەو سروشتەیە کە تۆ لە نیگارەکانتدا ڕاویان دەکەیت، بەڵام خەمت بۆ مەرگی پەپوولەیەک یان کارمامزێک وای دەکرد پیاوە هەرە نێرەکان شەرم لە خۆیان بکەنو لە فرمێسکەکانتەوە تێبگەن کە چ گوناهێکی گەورەیان کردووە، خەمو تۆرانت ناچاری دەکردن کە واز لەو گەمە خوێناوییە بێنن، گەمەیەک کە بۆ نێرەوزەکان خۆشترینە، بەڵام هەرگیز لە خەونەکانتا نەدەبوویتەوە بە پەپوولەیەکی لە باخان هەڵفڕیو، یان کوکوختیو کۆترێکی بەرزەفڕ کە سینەی لە ئاسمان بدات.

ساڵانێکی کەمو هەر وەک بێداربوونەوە لە خەونێکی خۆش لەناکاو کوڕی گەمەو بەزمو خۆشنوودی ناو خەونەکانت بزر بوو، لە هێلانە تەریو نەهاتەوە، دوورتر لەوەی بەم باڵە سووتاوانەوە بۆی هەڵفڕیت، پتر لە وەهم .. سەراب .. خەونێکی کورتو شیرین دەچوو، هەموو جاران لەناو چیرۆکو ڕۆمانو فیلمەکاندا ماڵئاواییو لێکدابڕانی یەکجارەکیت دەبینی، دڵت دادەخورپا، کسپە لە جەرگتەوە دەهات، وەلێ هەرگیز بڕوات نەدەکرد خۆت پاڵەوانی یەکێک لەو داستانانەی جودایی بیت،

لەنێو هەموو ئەو کچانەی کە تۆیان بە شازادەی خۆیان دەزانی .. تۆ لە هەمووان بریندارتر بوویت ...

ئەوکاتەی تەنیا کەوتی .. بۆ سێ مانگیش خەونەکانت پڕبوون لە کۆتری سپی هەڵفڕیو بەسەر ئاسمانی شاردا، لە خۆشی فڕینو چریکە نەدەکەوتی .. ڕۆژو مانگو ساڵان تێپەڕین ئاسمانت پڕکرد لە چریکەی خوێنینو گمە .. گمەی نەبڕاوەی غەریبی..لە منارەکە ڕادەمایتو دەتوت تازە تەواو .. مەحاڵە کۆترەکانم بێنەوە ناو خەونە خۆشەکانم، ئەو فڕندە جوانو هێمنانەش وەک شێت بە یەک شەققەی باڵ لە منارەکەوە بە تاو دێنو کوێرانە خۆیان بە پەنجەرەکاندا دەدەن، وەها کوێرانە و توندو بە زەبر کە دوو جاران شووشەکان هاڕەیان کردووەو شکاون، پەڕوباڵ خوێناوی وەک ئەوەی لە خەونێکی ناخۆشدا بیت مردارەوەبوو دەکەوتنە بەردەمت، کۆترەکان کوێرو پەڕوباڵ هەڵوەریو، بێئۆقرە لە ژێر ئاسمانێکی خوێناویدا دەفتەری ڕەسمەکانت داگیر دەکەن، دەتڕوانیو .. ڕۆژ بە ڕۆژ کۆترەکانت بە دەوری منارەکەدا گیر دەخۆنو سەرمەشقی فڕینو تەقڵەبازیان لەبیر دەچێتەوە. شەوێکیان هێشتا هۆمەر مابوو، نەخۆشو پەککەوتە لەجێدا، ناڵەو هاواری دەردە قورسەکەی دەگەیشتە سەر ترۆپکی منارەکەو گومەزەکانی دەوروبەر، ناڵەو بێدادییەک کە کۆترەکانی بێئۆقرەو هار کرد کە بەو شەوە لە هێلانەکانیان تەرە بن، تاکە پەنجەرەی ڕۆشن هی ئێوە بوو کە تاکو

جووتو پۆل پۆل خۆیان دەکوتا بە پەنجەرەکەو ڕۆناهی ژوورەکان بوو یان سەدای بڵندیناڵەو نرکەی نەخۆشی گێژی دەکردن، لە چەندین لاوە بەدەم هاڕەوە شووشەکان شکان، تا بەیانی کە شووشەتان تێگرتەوە، بایەکی سارد ژوورەکانی پڕکرد لە بۆنی بارانو گەڵای زەردی درەختەکانو ڕیقنەو پەڕوباڵی فڕندەکان، هۆمەر بەیارمەتی دارشەقەکان هەستایەوە، پێکەوە بە مقەباو پەڕۆو پاتاڵ شەبەقەکانتان کونبڕ دەکرد، بەدەم کۆکەوە دووبارەو دە بارەی دەکردەوە کە ڕێک هەر تۆزێک لەمەوبەر خەونی شکانی پەنجەرەکانی بینیوەو بە ترسەوە دەیوت..

( (دکتۆرەکەم لە دوا سەردانماندا پێیوتین کە تەواو .. مەناعەم کەم بۆتەوە، هەر میکرۆبو ڤایرۆسێک ئاسان زەفەرم پێدەبات.))

دیسانەوە دەفتەری ڕەسمەکانت پڕبوونەوە لە باخی پەژمووردەو گەڵاڕێزانو مەلی کوژراو و نووساو بە جامی شکاوی پەنجەرەکان، لە سکێچی پیاوێک لەباری جیاوازدا کە هێشتا لاوە و بەسەر دوندێکەوە وەستاوەو .. تیلاکی لێ خوار کردووەو ڕەختەو فیشەکدان داپپۆشیوە، ڕاوکەرەو پەنچە بەسەر پەلەپیتکەی تفەنگێکەوە نیشانەی لە کارئاسکێک گرتۆتەوە .. لە هەمووشی پتر سکێچی ئەو زەلامە نەخۆشەیە کە بە هێزی دارشەقێکەوە وەستاوە، هێزی داوەتە بەر خۆی سەری ڕابگرێتو نەچەمێتەوەو لەو خانمەی پێش خۆی ڕادەمێنێت کە

سەیری منارەیەکی چەماوە دەکات، ئەوەندە لارە کە هەروەک بڵێیت بە موعجیزەیەک وەستابێت، ها ئێستا نا .. تۆزێکی دیکە دەڕمێو ئەو ماڵانەی دەوربەری خۆی کاول دەکات، خەونی ناخۆشی شەوانی هەردووکتان دزەی دەکردە ناو نیگارەکانت، خشتێکو دووانو سێ دەردەپەڕنو سەر دڵی هۆمەر دەکوتنو دەیکوژن، بەدەم وڕێنەوە دەکەویتە شینو واوەیلا .. پاسەوانەکانو کەسو کارو دراوسێ لێت کۆدەبنەوەو دڵنیات دەکەنەوە کە هۆمەر دەمێکە مردووە، کەسیش باوەڕ ناکات لە ترسی هێرشی کۆترە شێتبووەکان یان بە زەبری خشتێک لە منارەکەوە پەڕی بێتو کوشتبێتی .. کەس بڕوا ناکات .. کەس..

تەواو لاپەڕە سپییەکانو کانڤاسەکانت پڕ بوون لە منارەی کورتو درێژ، ئەستوورو باریک، قیتو لار، دەورە دراو بە گومبەتی نەخشین، هەتیو و تەنیا بێ گومەز، منارەی تەواو ڕووخاو بەسەر خۆیدا، نیوە ڕووخاو، داروپەردووی بەسەر یەکدیدا ڕماو کە لە ژێر ئەو وێرانەیەدا سەدەها کۆترو کوکوختی چۆلەکە مردوون، دەیەها هێلانە دار ماوەو بەدەم باوە دەفرن، منارەیەک چەماوەتەوە کە دەیەها دارشەقی دراوەتە بەر تا نەڕمێت، منارەیەکی سەر بەرەو خوار وەستاوەو لە زارکییەوە مەلە نیوە خنکاوەکان تەقەللا دەدەن بفڕن، بە جۆرەها شێوە ڕەسمەکانت تێکەڵ دەکرد .. بە قەڵەمی ڕەساس، ڕۆنتنگن،

پاستیل، بۆیەی ئاوی، زەیتی، قەڵەمی ڕەنگاو ڕەنگ، پاندانو جاف.. منارە ڕماوەو بە چواردەورییەوە ڕۆژی حەشرەو قیامەت هەڵساوە، دەستە خوشکەکانت کە دێنە لاتو دەفتەرەکانت هەڵدەدەنەوە، کۆنو نوێ، بە حەسرەتێکەوە دەپرسن..
((ئاخر بۆ وا .. شادی؟ ئەو هەموو پەپوولە مردووانە چین، ئەو هەموو وەرزی پایزەو گەڵاڕێزانە، ئەو هەموو منارە لارو داڕووخاوە، گەڕەکی کاولبوو .. کەلاوەی پڕ لە قەلەڕەشو کونەپەپوو؟))

دادەمێنیتو هیچ وەڵامێکت نابێت، چ زەحمەتە سەرلەنوێ کوتانەوەی هەمان ڕێگای مەرگو دۆڕان تاوەکو ناو جەرگەی جەهەننەم، چوونە سەر یەکەم دلۆپە خوێنی تکاو لە دامێنت کە زەریایەکی پڕ لە گێژەنو گەرداوی بۆ خولقاندی، ئەستەمە گێڕانەوەی چیرۆکی پڕ لە کارەساتو هەلاهەلابوونی ڕۆحت .. تۆ بە تەنها ئەم نیگارانەت شک دەبەیت.
تکایان لێ کردیت کە پێشانگایەک بکەیتەوە، لەم قەفەزە بێیتە دەرەوەو هەناسەیەکی پاک هەڵمژیت، وەک جاری جاران کۆڕی دانیشتنەکانی کچانی هاوڕێو کەسو کار گەرم بکەیتەوە، بە خەندەیەکی ساختەوە کە قورس دەکەوتە سەر لێوانت دەتوت..
((منیش حەز دەکەم .. بەڵام تا ئێستا نەمتوانیوە .. بۆ؟ نازانم ..!))
نەتدەتوانی هیچ بڵێیت .. وەک ئەوەی بەندیو نەخۆشێکی سەد ساڵە

بیت، بە دیارتەوە دۆش دادەمان، نەدەکرا بچنە ناو ڕازونیازو نهێنی پەنهانو شاراوە لە دڵی تۆدا، کە بە هەموویان لە خەمی ئەوەدابوون پەشیمانت بکەنەوە واز لە شەڕی منارەکە بهێنیت، تۆ سووکو ئاسان، بەڵام بە قەهرو تووڕەبوونێکی زۆرەوە دەتوت..

((ئەوەیان مەحاڵە .. تاکە شتێکە منی هێشتۆتەوە!))

شەوێک بوو لە شەوانی درێژی زستان کە تینو تاوی دەردەکەی کەمێک خەفەتر ببوو، بە هێوری بانگی کردیت، وەک کەسێک کە هەمیشە لەگەڵ مەرگدا گەمەی زۆری کردبێتو هەرگیز پێویستی بەوە نەبێت بترسێت، یان کە ترسا .. چاوەکانی نەتروکێنێت، وەک جەنگاوەرێک کە دەیەها جار لە بۆسەو تەڵەی مەرگ قورتاری بووبێت، بە خەندەیەکی خوارەوە کە لچو لێوی خۆی پێ ڕاگیر نەدەکرا .. لێی پرسیت..

((خانمی سەلار .. ڕازێکم هەیە .. حەزدەکەم گوێم لێ بگریت!))

تۆش وەک ژنێک کە پەرۆشی هەموو ڕازونیازی مێردە نەخۆشەکەیەتی سەرت لەقاندو .. ئەویش بە زەحمەتێکەوە زاری هەڵدێنا..

((هەرچەندە بۆنی دەرمانم لێدێ .. بەڵام حەزدەکەم بێیتە پێشەوە چونکە دەنگم کزەو ناتگاتێ ..))

بە میهرەوە پێتوت..

((عەیبە .. قەت وا مەڵێ.))

((حەزدەکەم بزانیت کە دەردەکەی من کوشندەیە، ئەمڕۆ نا .. بەیانی هەر دەمکوژێ.))

کە وای وت تۆ داتە پڕمەی گریان، ئەویش هاوزەمان گریاو بە حەسرەتێکەوە بەدەم قوڵپی گریانەوە وتی..

((بەڵام دڵنیات دەکەم کە من فێڵم لێ نەکردووی، من زەمانێکە.. چەندین ساڵا لەمەوبەر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تر دەرمانخوارد کراین، هیچ کام لە دکتۆرەکان، چ کوردو چ بیانی، پێشبینی مەرگی زۆر زووی ئێمەیان نەدەکرد، داو و دەرمانی زۆرمان وەرگرت، من تووکم پێوە نەمابوو، بەڵام دواجار زیندوو بووینەوە، لەوانەشە وەک ئەدەبو حورمەتگرتن لە ئێمەی ئینسانو پێشمەرگە، هیچ کەسێک حەزی نەکردبێت حەقیقەتی وادەی مەرگی درەنگو زووی خۆمان بخاتە ناو چنگمان، خۆ کەسیش نییە لە دونیا حەز بکات بزانێت کەی تەواو دەبێ، ڕاستی بێباک بوومو قەت حەزم نەکردووە بکەومە دوای ئاسەواری کوشندەی ئەو ژەهرە لە خوێنی خۆمدا، دەبوو بژیم .. پتریش ئەوکاتە حەزم لە خۆشیو ژیان کرد کە تۆم ناسی، تۆ وات لە من کرد بۆ جارێکیتر لە دایک ببمەوە، هەمووجار کادرێکی پێشکەوتووی دۆستم کە ئەویش ژەهراوی ببوو .. دەیوت: پیاوێکی عاقڵ وتوویەتی.. کە دەژیم .. دەژیم .. چونکە بوارم نییە بیر لە مەرگ بکەمەوە، چونکە ئەوکاتەی من مردووم .. بوارم نەماوە بیر لە ژیان بکەمەوە! هەر ئەو دۆستەم دەیوت بنیادەم دوو جاران لە

دایک دەبێت: جارێکیان لە دایکی خۆی..جاری دووەم لەو ژنەی کە خۆشیدەوێت..!))

ئەو شەوە نەتدەزانی چۆن دڵی بدەیتەوە، لەناکاو ئەو زەلیلیو فرمێسکانەی وای لێکردیت هاوسۆزی خەمو دەردو ترسی بیت..پاشان تێهەڵچۆوە..

((من ئەوەندە دەزانمو ئەوەندەم پێدەکرێت کە دوای نەمانی خۆم تۆ نەچیتەوە بەرقاپی کەس .. ئەم خانووەی کە تۆ خۆشت دەوێو بە توحفەو ئەسەرێکی جوانی دەزانی لەسەر تۆ تاپۆیان دەکەم .. بێجگە لە هەندێک موڵکو ماڵی ترم کە زۆر نییە!))

تۆ ژیر نەدەبوویتەوە، دایکانە سەریت خستە ناو ئامێزت، ئەویش دووبارەی دەکردەوە کە ئەم هەرگیز نەیزانیوە وا زوو دەفەوتێ، بە گۆڕی دایکیو گۆڕی شەهیدان سوێندی دەخوارد کە قەت قەت فێڵی لێنەکردوویت.بەدەم هەناسەوە پێتوت..

((تەواو .. وازبێنە .. ئەوە ناهێنێ .. ئەوەم لەیاد نەچووە کە تۆش منت هەڵگرتەوە ..منیش کەوتبووم!))

دەستی ڕاستەی، زەردباو و سارد، لەرزۆکانە خستییە سەر دەمتو تکای لێکردیت کە قسەکەت تەواو نەکەیت، سوێندی خوارد بە چاوەکانت کە تاکە خەمو ترسو بیمی ئەو لە مەرگ ئەوەیە کە تۆ بەجێدێڵێت، هەر بە هەمان خەندەی داکەوتوو لە زارییەوە کە گریانو خەمو هەیبەتی مەرگ لە ڕووخساریدا تێکەڵ مەلەیان دەکرد وتی:

( (تۆ منت کرد بە ئینسان، ئەو چەند ساڵە لە تۆوە فێری زۆر شت بووم، خەمی من ئەوەیە کە تۆ منی ڕاوچیو شەڕکەرت کرد بە بەشەر .. کە ئێستا کەمەکێ فام دەکەمەوەو خەریکە ببمە بەشەر .. کەچی ئەوەندەم نەماوەو دەمرم، ئەو ڕۆژەی ڕەسمەکانتم بینی کە پڕبوون لە کەو و کۆترو پۆڕی کوژراو .. ئاسکی پێکراو، زانیم چەندە بەدبینی لە منو دونیا، تا تۆم ناسی نەمزانی کە من جگە لە ڕاوچیو جەنگاوەر هیچی تر نەبووم .. تەواو بوو .. خانمە چکۆلە .. ئەو جەنگاوەرو ڕاوچییە دەمرێ و.. ئەم جەنگەڵا و کوشتارگایە بەجێدێڵێت.. !))

سۆزو میهرێک هەموو ڕۆحتی دەتەنیو لە هەموو دڵتەوە خۆزگەت دەخواست کە نەمرێت، دوا ڕستەی لە دڵی دایت، دەستەکانیت خستە ناو هەر دوو دەستتو دەمارە شینەکانی وەک کرمی باریکو ئەستووری ژێر پێستی پشتی دەستەکانی کە دەرپۆقیبوون ئاماژەبوون بە مەرگو خوێن مەیین، هەوڵیدا بتگرێتە ئامێزو لەو گریانە ژیرت بکاتەوە کە نەیدەهێشت هیچ بدرکێنیت، بەڵام لەوە بێهێزتر بوو بتگرێتە باوەش، باوکانە خواستی سەر بخەیتە سەر ڕانی، وەک کچێکی گوێڕایەڵ بە گوێت کرد، بۆ ساتەوەختێک بیرت لەوە کردەوە کە تۆ بێئاگا لە خۆت ئەو هێزەت لەودا خۆشویستووە، هێزێکی پەنهان لە پیاودا کە کچو ژنەکان هەر بە سەلیقە هەستی پێدەکەن، هێزێک کە هەموو کچێک بە تۆشەوە دوای دەکەوێت، وزەو هێزێکە کە لە ڕۆحێکەوە هەڵدەقوڵێت .. یان هی لەشە .. یان هەردووکیان، هێزێکە لەو پیاوانەدا هەیە کە

دەستو پەنجەیان لەگەڵ مەرگدا نەرم کردووە، ئەو هێزەی هەرچەندە ساختەو درۆ بێت، کەم بێ یان زۆر، وەلێ لەناو ئەو هەموو پیاو و کوڕە بێهێزو ترسنۆکو بێ بەڵێنانەی کە لە دەوری تۆ بوون، لە باوکو براو دۆستو یار، پڕ هەواو فیزێکی بەتاڵ، تەنها نێربوون بەس بوو بۆیان کە خۆیان بە دونیا نەگۆڕنەوە، کەچی هەترەشیان لە خەونو خەیاڵو ختوورەی کچو خوشکو دایکو ژنەکانیان چووە، ئەم پیاوە نەخۆشە لە ساتەوەختێکدا هەر هەموو لاوازیو ڕۆحی بەتاڵی پیاوەکانو تەنیایی خۆتی پیشان دایت، هەر ئەو ساتەوەختەش بوو بێئاگا لە خۆت قایل بوویت هاوسەفەرت بێتو وتت..

((بەڵێ ..!))

ساتەوەختێکە کە خودی ژیان بۆخۆی گەمەیەکی دۆڕاوە، خۆشەویستی جگە لە تراویلکەو وەهمی ناو گۆرانییەکانو خەیاڵێکی شاعیرانە هیچی تر نییە، ئەو چرکەساتەیە کە لەبری ((نەخێر)) ناچاریت بڵێیت ((بەڵێ))، بەڵێ-یەک کە پتر خۆ هاویشتنە ناو چارەنووسێکی نادیارە، بێ ترس لە مەرگو تێداچوون یان شاگەشکەبوون بە خۆشنوودی، کەچی بڕیارو جووڵەیەکە گەورەترە لە وەستانی زیندەگی لە جوغزێکدا، لە ماڵێکدا، لە کەسێکدا، لە تەنها هەقایەتو داستانێکدا .. کە نییەو هەرگیز نایەت، تەواو .. بۆ تۆ وابوو، نەدەکرا تا دوا هەناسە لەو کارەساتەی تەمەنێک بوو تیایدا پرسەدار بوویت هەر چاوەڕێ بیتو لەو گەرمە شینو واوەیلایە سارد نەبیتەوە، چاو لە ڕێو سەر لەسەر

ئەژنۆ، دەبوو خۆت فڕێبدەیتە ناو باوەشی کارەساتێکی دیکە .. با دۆزەخیش بێت، چ بەهەشتو چ دۆزەخ، جێگۆڕکێ گەمەیەکە .. بۆ ئەو گەمەیە خودی زیندەگی مەحاڵە!

لە ئاکامدا بوویت بە پەرستارێکی دڵسۆزو میهرەبان کە بۆ هەر کچێکو ژنێکی دیکە سامناکو غەمناک بوو .. بۆ تۆ؟ .. نا .. هەرگیز ئەوەندە بێئۆقرەو لەرزە لێو نەبوویت ببەزیت، ڕۆژ بە ڕۆژ هەستت دەکرد کە ئەم پیاوە داماو و نەخۆشە وێنەو بەرجەستەی ڕۆحی نەخۆشی ئەم ڕۆژگارە ناشیرینەیە کە هەمووتان تیایدا دەژین، ڕێک وەک ئەو خەونی ڕاپەڕین و هەستانەوەو ڕابوونو سەرفرازییەی کە زوو پیربوو .. لە جێگادا کەوتو .. لەنێوان مەرگو ژیاندا هەناسەیەکی ماوە، چاوەکانی کزو بە دارە دارە بە ڕێدا دەڕواتو ساتمە لە هەموو شتێک دەکات، سەر ڕووتاوە .. دەستو پەنجە لەرزیو، کە هەڵدەستایە سەر پێ دەبوو خۆت بخەیتە بن باڵیو دارشەقەکانی فریا بخەیت تا بەدەم سەرەگێژەوە نەکەوێت، چونکە دوو جاران کەوت و ددانی شکا.. پیاوێک کە وەک پڵنگێکی هارو لە ڕۆژگارێکی زووتردا دەنێو ئەو شاخو کێو و دەشتو هەرد و زورگو تەلانی ئەم وڵاتەدا بە هەڵمەتەوە هێرشی بردۆتە سەر دەیەها سەنگەرو مۆڵگەی دوژمن، چەندەها جار لەگەڵ مەرگدا چاوشارکێی کردبوو، کەچی لە باوەشی تۆدا هەر بەقەد پشیلەیەکی گەڕی لێمابۆوەو نائومێدانە باسی لە مەرگی ناو پێخەف

دەکرد، مەرگێکی گێلو تەمبەڵ، بۆ تۆش ئاسان نەبوو پیاوێک هەر وەک پەیکەرێک لە بەفر لەبەرچاوتا بتوێتەوە، شەوانی ناڵەو خەو زڕانو ئاویلکە، وەک ئەوە وابوو لەتەک گۆڕەکەیدا ڕاکشا بیت، هەر واش بوو .. چەند مانگێک دوای پێشبینی مەرگی خۆی لەسەر گۆڕەکەی دانیشتیت، سەرەتا هەموو هەینییەک وەک وەفایەک بۆ پیاوێک سایلی ئەو خەڵکە خۆتو چەپکێک گوڵی خودایی یان دەستکرد سەردانت دەکرد، پیاوێک کە هەتا ژنو منداڵەکانی گۆڕەکەی ناناسنەوە، هەموو جارێک دەیگوت بێ گوڵم مەکە کە مردم، هەر جارێک کە دەچوویتەوە گوڵەکانی هەفتەی ڕابردوو سیس دەبوونو با پەلکو لاسکەکانی بەناو گۆڕستانەکەدا بڵاودەکردەوە.. هەر وەک پەرتکردنی یادگارەکانی خۆت، پێت سەیر بوو کە ترسو هێزی مەرگو تەنیا کەوتنی پیاوێک لە ژیان و مەرگیدا ئەو هەموو سۆزە لە دڵی تۆدا دابگیرسێنێت، ئەویش تا مرد لە خەمی تۆدا بوو، شەوێکیان وەک ئەوەی خەیاڵی ترسنۆکو بێئۆقرەیی تۆ بخوێنێتەوە .. پێیوتیت..

(( قەت مەترسە .. ڕۆحەکەم، هەر شتێکت ویست، دوو دڵ مەبەو تەنها ڕوو لە سەرۆک بکە، چ بە نامەو چ خۆت چوویت، گەرچی نازانم ئەویش چەندە وەفاو غیرەتی ڕۆژانی شاخی لەیاد ماوە..؟ نامەوێت لە دەرگای هیچ سەرسەرییەک بدەیت .. عەفووم کە وا دەڵێم، هەر شتێک هەراسانت دەکات بێ شەرمو دوو دڵی بینووسە .. بۆ مەکتەبی سەرۆک خۆی .. ناڵێم قەرزارمە .. بەس چەندەها جار لە مەرگ

قورتارم کردووە..بەڵام ئومێد دەکەم حەوجەی کەس نەبیت..!))
دەستت خستە سەر دەمی تاوەکو پتر لەسەری نەڕوات، چونکە ئەوەیان تەواو شەکەتو غەمگینی دەکردیت، بەچرپەو گرینەوە درکاندت..
( (مەترسە.. حەوجەی کەس نابم..!)
ئەم بە بەرچاوتەوە مرد .. ڕۆژ بە ڕۆژ .. هەناسە بە هەناسە، دەمار بە دەمار، خانە بە خانە، زستانێکی دوورو درێژو ساردو تاریک .. کە ئاسمان خۆشی نەدەکردەوە، وەک ئەوەی بۆ مەرگی ئازیزێکی لە گریان ژیر نەبێتەوە، ڕۆژانە .. شەوەهای شەو پیاوێک لە شێوەی مەرگدا، یان مەرگێک لە بەرگی پیاوێکدا بە ژوورەکانو ڕاڕەوەکاندا بە دارشەقێکەوە پیاسەی دەکرد، بە پەنجەکانی کە وەک چڵو چێوی وشکەوەبوو وابوو پەردەکانی لادەدا تاوەکو ئاسمانی پاک یان بە هەورو هێڵا ببینێت.. لاپەڕەی ئەلبوومی رەسمەکانی خۆی و دەفتەری سکێچەکانی تۆی هەڵدەدایەوەو ئاهی ساردی هەڵدەکێشا، مەرگ بە دزی ژیانەوە لە ئینجانەکان نزیک دەکەوتەوەو گوڵەکانی بۆن دەکرد، گوڵەکانیش لە ترساندا سیس دەبوونو لارە مل پەلکیان هەڵدەوەری، بەو هەناسە ژەهراوییە رەنگیان دەپەڕی، مەرگ نەیدەتوانی چا بخواتەوەو پیاڵەکەی لە دەست دەکەوتە خوارەوە، نەیدەتوانی پێکێک شەراب لە لێوانی نزیک بخاتەوەو نەیڕێژێت، مەرگی چاو قایم دوو قومی لە سیغارەکە دەداو دەبوو بە لوولەیەکی ئەستوور لە سووتوو، بەسەر پێخەفەکەیدا دەکەوتو جار جار لێفەو دۆشەکەکەی دەسووتاند، لە ژێر چڵکو

ئارەقەی خەستەبوون بۆگەنی دەكردو نەیدەتوانی بگاتە گەرماوەكەو دووشێك بكات، وای لێهات شۆربایان بە دەمەوە دەكردو هێڵنجی دەداو دەڕشایەوە، لەگەڵ ڕشانەوەدا ژەهری دەهێنایەوە، ژەهری لە خوێندا مەییوی ساڵانێكی زووتر، لە پەلو پۆ كەوتوو .. هێدی هێدی سۆمایی چاوەكانی دادەهات و نەیدەتوانی لە پەنجەرەكەوە سەیری منارە لاربووەكە بكات كە جار جارە لە چاوانی تاریكی ئەودا وەها دەچەمایەوە كە سەری بیدا لە زەوی، ڕەشەبایەك وەك قامیشێك بە ڕاستو چەپدا گەمەی پێدەكرد، بەدەم خەوەوە ڕادەچەنیو كە لە خەو ڕادەبوویت دەتپرسی..

( (خێر .. چی بوو؟))

بە دەنگێك كە لە قووڵایی گۆڕەوە بێت..

( (منارەكە .. منارەكە بەسەرمدا ڕووخاو .. كوشتمی!))

مەرگ بەو هەموو هێزو فیزو مەزنیو هەواو دەبدەبەی خۆیەوە، بێئاگا لە خۆی، خۆی پیس دەكرد، میزی بە خۆیدا دەكرد، بۆنی كەسكوونی گەمارۆی هەموو شتێكی دەداو بۆنی ناخۆشی ئەویان دەگرت، چیتر نەدەكرا گوێ لە مۆسیقاو گۆرانی بگرێت .. دەیوت..

( (گۆرانی قیژەو هاوارێكە خوێن لە گوێچكەكانمەوە دەهێنێ، مۆسیقا گوێزانەو دڵم دەبڕێ ..!))

مەرگ دەترسا سەیری سكێچو تابلۆكانی تۆ بكات كە پڕبوون لە پەپوولەی هەلاهەلا هەڵوەریو و كۆترو كەروێشكی كوژراو، ئاخر لەوە

ناخۆشتر نییە مەرگ لەو تابلۆو نیگارانە بڕوانێت کە هەر هەمووی دەستکردی خۆیەتی، ترسناکە لەبەردەم ئاوێنەکاندا بوەستیٚو لە ڕووخساری زەردو چاوە کوژاوەکانی خۆی ڕابمێنێت، هەر هەموو وشەی ناو کتێبەکانیش دەبن بە مارو مێرووی دەم هەراشو برسی، گەردیلەو خانە بە خانەی دەستو پەنجەو هەر هەموو ئەندامە داڕزیوەکانی دەخۆن، دواجار مەرگ ئەوەندە وشک ببۆوە کە دوو دڵۆپ فرمێسکی پیٚ نەمابوو تاوەکو بۆ خودی فەوتانو سەفەری کۆتایی خۆی کەمەکیٚ بگری ..

دواجار مەرگ هاتو هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا ڕامالٚی، جگە لە بۆنێکی ناخۆش لە دوای خۆیەوە هیچی دیکەی بەجێنەهێشت، بێجگە لە قەڵەبالغی چەند ڕۆژێک، سەرباری چەند پرسیارو گومانو دڵەڕاوکیٚو مەراقو تەماع، واتەواتو چرپەو فسکەفسکی ئەو هەموو مەردوومەی دەرو دراوسیٚ، لە جوانو لە پیر، ئاخۆ بێوەژنێکی جوانو جحێڵ پاش ئەو مەرگە چی لە هەگبەدا بێت؟ ترسو سەرسامیو بەغالەتو بەزەیی لەگەڵ هەواو هەناسەی کەسو کار تێکەڵ دەبوو، نیگاکان پڕبوون لە ڕازو نهێنی بیٚ وەڵام، ئەو خەمە گرانە زیباتری کردبوویت، سەنگینو خامۆشتر لە هەموویانت دەڕوانی، سەیری منارە تەنیاکەت دەکردو لە بێوەمێردێک دەچوو کە تەمی خەمێک دەوری سەرو ڕووخساری گرتبێت، ئەمجارەیان ئەم لە تۆی دەڕوانی، ڕەش پۆشو بیٚ وەڵام

جێپێکانی مەرگ بەسەر دڵتەوە، دڵگرانتر لەوەی وەڵامی هیچ مەراقو ختوورەیەک بدەیتەوە، دواجار هەر زوو لە ڕێگەی تێکەڵکردنی ڕەنگەکانو ڕاوکردنی وێنە جیاوازەکانی مەرگ، دەتویست مەرگێکی ناوەختو درێو و سیا پۆش لە خۆت دووربخەیتەوە، دەتویست لەناو ڕەنگی بێ ڕەنگی خۆیدا بەندی بکەیتو لەوێدا ماتو مەییو تا ئەبەد ئۆقرە بگرێت.

هەر دوای هەفتەیەک لە مەرگی هۆمەر، مارێکی ڕەشت لە ماڵەکەدا بینی، بوو بە هەراو قاو و قیژ، دەرو دراوسێو پاسەوانەکانی مەرحووم کە هێشتا وەک دەرگاوانانی بە ئەمەک دەستەو نەزەر لە خزمەتی تۆدا بوون.. کەوتنە هەلەکە سەما، ڕمانی چەند خانوویەکی ئەو دەوروبەرەو بوونیان بە کەلاوە گومانی ئەوەی لێدەکرا کەلاوەکان کە ببوونە گووفەکی گەڕەکە دوورەکانیش چی مارو مێروو، سەگە بەرەڵڵاو پشیلەی گەڕو مشکو جرج هەن لە شاردا ڕایانبکێشێت، کێ ناڵێ بە دەستی ئەنقەست نییە تاوەکو تۆ هەراسان بکەن، گەر وا نییە بۆچی هەر دوای مەرگی هۆمەر دەرکەوت، درۆ بێت یان ڕاست، هەر هەمووان سوێندیان دەخوارد کە دیویانە، ئاسان خۆی دەردەخاتو ئاسانیش ون دەبێت، هەندێکیان سوێندیان دەخوارد کە ئەمەیان تەنها واهیمەو ترسی دڵی خۆتە..

( (دەڵەقۆڕی وا شێتی ئەوەیە کوڕوکاڵ لە خۆی کۆبکاتەوە، مانگێکی

تر وەک دێڵەسەگ چی گۆلە سەگی ئەو ناوە هەیە بە خۆی فێر دەکات!))

((تۆ ئەو هەموو زەلامە سمێڵ بابڕەت نەدیوە بەناوی پاسەوانەوە ڕایگرتوون؟))

((حەیا نەماوە .. ژنینە ..!))

((خدەو خووی کچانو ژنانی تریش تێکدەدات، قەت بووە لە حەسارێکی وا گەورەدا، چۆلو هۆل، بێوەژنێکی تەنیا تەراتێنی تێدا بکات ..!))

((باوکو برای تووک نەرمن .. دیارە نێرەوزێکیان نییە تەمبێی بکا.))

((خەڵکی هەقییەتی .. حاڵی ئەو ژنە باعسی سەد خەیاڵی خراپەو ختوورەی حەرامە ..))

((منارەی کردووە بە بیانوو .. گوایە چۆلی ناکات، هەقە منارەکەی گردەبڕ تێببڕن!))

ئاخر پەیدابوونی مارێک لە هیکڕاو هەر پاش مەرگی پیاوەکە.. بەزمێکی سەیرو ناجۆرو مایەی گومان بوو، دەرو دراوسێش دەترسان ئەو ڕەشەمارە بپەڕێتەوە ناو حەوشەوماڵەکانی ئەوان، بە گوتەی ئەوانەی دیویانە مار نییەو ئەژدیهایە،مارێک نییەو دەیەهایە.. فیشکاندنی ژنی ئاوس زەندەق بردوو دەکاتو سکەکەی پێ فڕێدەدا، گوایە چەند دەقیقەش دوای خۆ خزاندنو خۆ حەشاردان کلکی درێژی لە دوای خۆیەوە ڕادەکێشێت، ژنەکان لەوە دەترسان مارەکە عاشقی

ئەو بێوەژنە ناسکو نازدارە بێتو هەرگیز لەو ناوە دوورنەکەوێتەوە، کەم نین هەقایەتی نێوان ژنو مار.
بەزمی وەدیارکەوتنو ونبوونی ئەو مارە ببووە بەزمو ڕەزمێکی خۆش بۆ کوڕوکاڵو پیاوانی دەرو دراوسێو پاسەوانەکانی خانم، لەناکاو دەبوو بە قاو و هەر بابا بوو بە خۆییو تێڵاو مەترەقو حەیزەرانو بەردو تاپرەکەی ، دارلاستیکو کلاشینکۆفو جۆرەها چەکو تفاقی تر هەڵکوتنە ناو حەوشەو سەربانو ژوورەکان تا بنەبانێ، شێتو شەیداو عەزرەتی لە بەژنو باڵای خانمە چکۆلەو .. بێوەژنی تەنیاو زێدە نازدار بڕوانن، هەر نێرەوزێک لە دڵی خۆیدا حەسرەتی دەکێشاو .. وەلێ سەد حەیفو مەخابن هەر هەموو شەرمیان لە جوانیو خەمو کۆستی گەورەت دەکرد، لە خۆیانو لە یەکدیان دەپرسی..
((چ نهێنییەکە وایان لێدەکات شەرم لە بێوەژنێکی تەنیا بکەن؟ جوانی، هونەرو خوێندەوارییەکەی، پرسەی تازە هەڵگیراو یان سەلارو سەنگینییەکەی، دەمو لەبزی زێدە شیرینی ئەو وەختەی داواو ڕازێکی دەدرکێنێو گرانو خانمانە زاری بە گوڵ دەپشکوێت، خەمو خامۆشی یان کەمدوییەکەی کە بە جۆرێکە لێوانی بەسەر یەکدا قرساوی ڕەسمێکی سەر کاغەزەو نابزوێت ..!))
هیچ پیاوێک نەبوو .. هیچ کوڕوکاڵو مێردمنداڵێک نەبوو خۆزگە نەخوازێ کە خانم خونچەی دەمی بکاتەوەو فەرمان دەربکاتو .. تاوەکو ئەوانیش بێ یەکودوو ملکەچی بن، هەر هەموو کوڕگەلی

ئەو دەوروبەرە بەغیلیان بە پاسەوانەکان دەبرد کە دەرگاوانی ئەو بەهەشتەن.
هەر هەموو نێرەوزەکان، کەمو زۆر، لە ئاسمان دەپاڕانەوە ئەو مارە ڕەشە ونو تەوەللا نەکات، بۆ هاتنی ئەو مارە کێ زاتی دەکرد پێ بخاتە ناو حەوشەی ئەو باڵەخانەیە؟
کە دەچوونە ژووری، هەر لە حەوشەوە ڕەنگو بۆنی جۆرەها گوڵ سەرمەستی دەکردن، لە ژوورەکانیش نەتدەزانی چاوان لە چی تێربکەیت، لە کام نەخشو نیگار بڕوانیت، تاقو پەنجەرە، دەرگای نەخشین بە وێنەی تاوسو تیترواسکو تووتی، پەردەی گوڵدارو چل چراو کورسی شاهانەو قەنەفەی گرانبەهاو مەخمەلی، مێزی ڕازاوە بە دەیەها توحەفیاتو شتی عەنتیکە کە مەحاڵ بوو لە بازاڕەکانی ئەم مەملەکەتە بیاندۆزیتەوە، شمشێرو دەفو بڕنەوی هەڵواسراو، کەوڵی ئاسکو پڵنگو گورگ ڕاخراو لەبەر پێیاندا کە وەک میراتی مەرحووم زاتی نەدەکرد هەڵیانبگرێت و ونیان بکات، دەیەها باڵندەی مۆمیاکراو و باڵ کراوە کە هی ئەم ئاسمانە نەبوون و میراتی هۆمەر بوون، گەرچی لە دڵی گران بوو کەوڵی حەیوانە کێوی و مەلی مۆمیاکراو بەشێک بن لە جوانی ماڵا.. وەلێ مەرگی هێشتا سەوزی هۆمەر نەیدەهێشت دەستکاری هیچ بکات، چەقۆو چەتاڵی زیوینو کەوچکی زەڕکەفتی کە جاروبار دەدزران، هیچ کامیان سڵیان لەوەش نەدەکردەوە دەسکی دەرگای ژووری خەوتنەکە بابدەن، تەنها ژوورێکی داخراو کە هەر بە

تەنها شەیتان دەیزانی چی تێدا تەقەت کراوە، ژووری پڕ لە بۆنو بەرامە .. ژووری خەونو خەیاڵو ختوورەی زۆر پەنهانو شاراوەی بێوەژنێکی شۆخو تەنیا .. گەنجینەکانی جوانی.

نەدەکرا سەیری ئەو هەموو نیگارو تابلۆیانە بکەیتو خێل نەبیت، هەندێکیان پڕ بە ژوورەکان بانگیان دەکردیت کە شەیدایانە خۆت بخەیتە ناو چوارچێوەکانییەوەو لەوێدا ببیت بە ڕەسمی دیوار، مێردمنداڵەکان بە تاسووقەوە .. بە دزییەوەو بە پەلەپڕوزێ لە سکێچی پڕ پەپوولەی باڵ هەڵوەریو و جۆرەها فڕندەی خوێناوی دەوری منارەی قیتو لارو داڕووخاو ڕادەمان، پیاوەکانیش بە دیار تابلۆکانەوە دۆش دادەمانو لەژێر لافاوی ئەو هەموو ڕەنگانەدا نقووم دەبوون، ئەو پیاوانەی بیریان دەچۆوە بۆ مار کوشتن هاتوون، ئەو پیاوانەی بێجگە لە نیگاری زێدە جوانی کیژی کافرۆشو ڕەسمی پڕ لە ویقاری ئیمامی عەلی کە بە خۆو شمشێری زولفەقارەوەو شێرێکی خەواڵووش لە بەردەمیدا پاڵ کەوتووە.. هیچی دیکەیان نەدیبوو، پاسەوانەکانیش بە دیار وێنەکەی مەرحوومەوە سامگرتوو دەوەستان کە بە دوو چاوی ڕەشو دوو ئەبرۆی پەیوەستو سمێڵێکی پڕەوە دەیڕوانی وەک ئەوەی ئاغایانە لێیان بخوڕێتەوە کە بۆ دەبێ ئەوەندە بێ شەرمو شکۆ بنو لە دەرگای حەوشەکەوە ئاودیو بنو بێ پرسی خانمەکەیان وەژوور کەوتبن، بێئەوەی ڕێ لەو عەزازیلە بگرن کە بە

بیانووی مار کوشتنەوە پێ لە فەرشی کاشان دەنێن، ڕیخو قەرسەقول لەسەر چیمەنەکە جێدەهێڵن، نەک مار .. خودای دەکرد ئەژدیهای حەوت سەر دەبوو، ناچار بە شەرمەوە پاشەکشێیان دەکردو ئەو خەڵکەیان قاو دەدا، نائومێد لە کوشتنی مارە ڕەشەکە، دەخزانەوە ناو حەوشەکەو خەڵکیان دەنگ دەدا کە چۆلی بکەن. دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە..

((بێوەژنی تاین ئاگری تێبەربووەو حەزی لەو بەزمەیە، ئەمەیان فێڵو بیانووە تا پیاوێک ڕاو بکات، بە کراسێکی تەنکو تەسکەوە وەک تاوس بە بەردەمیاندا خۆی بادەداو خۆی دەلەنگێنێت!))

((کچێ چاوی دەربێ .. پیاو ڕاو دەکا .. سەگ بەخۆی فێر دەکا .. کەیفی خۆیەتی دەڵەقۆڕی وا .. هەر مێردەکانی ئێمە لە خشتە نەبات .. خوای دەکرد ئۆردوویەک عەسکەر دەخاتە خۆی ..))

هەمووان دڵیان لە تۆ پیس کردبوو، ژنەکان تەگبیریان کردو هەر جارەو یەکێکیان ببێت بە سیخوڕو تاوەکو بزانن کە چ ئاشناو چ بێگانەو غەیرە .. کێن ئەو پیاوانەی سەراسووت دەکەن. قەیرە کچە تەنیا کەوتووەکان پتریان دەخستە سەرو سەریان لە بن گوێی یەکدی دەناو سەد سوێندیان دەخوارد..

((بە هەر سی جزووەکەی قورئان ئەم عفریتە هەر خۆی مێردەکەی خۆی دەرمان خوارد کرد، دەنا ئەو ژەهرە چی بوو ئەوەندە ساڵە

لە خوێنی ئەو پیاوەدا مەیی بوو، خۆ بەوە نییە سەلارو سەنگینو خامۆش خۆی دەنوێنێ ..))

((کچینە .. چما ئەنگۆ عەقڵی خۆتان لە دەشتێ دیتیتەوە .. عەجەبە هەر دوای ژنهێنانە تازەکەی ئەو ژەهرە کاری خۆی کرد .. چما چ بووە؟))

((دەبینن کە دوو ڕۆژی دیکە هەتیوێک دێتو بە خۆیی‌و ئەو میراتە زۆرەی خەنی دەکاتو خۆی دەخاتە بنی ..!))

((میراتەکەی بردو کوشتی!))

((ژەهر کوشتی ..! با درۆیەک بکات .. بنیادەم بڵێ: ئامەنتوو ..!))

((کەستان ئاگاتان لێ نییە .. دەم لووسێکی خزمی خۆی بە نیازە بێتەوە لە دەرەوە .. بە حاڵو ماڵەوە دەیبات ..))

((من عەقڵم بێ .. چاکتر وایە بۆ ئەو قەحپەیە چۆڵی بکەینو ئێمەش سایلی ئەو خەڵکە بیفرۆشین .. با ئەو دێڵە بەبایە گەڕەکەکە بکاتە تیاترۆخانە ..))

هەر یەکێک لەو کچە عازەبانە بە قەهرێکەوە هەڵیدایە..

((ئێمە دیوارێکمان بەینە .. ئاگام لە هەموو کەینو بەینێکە، پێش ئەوەی مێردە گێژەکەشی بمرێ .. خانمی خرتێ لە ژێرەوە دۆستی گەورەی پاسەوانەکان بوو ..))

((جا توخوا هەقی نییە .. ئەو سەگبابی چاوباشقاڵە خوشکی خۆی حەیرانی دەبێ .. کە سەیرم دەکا خەریکە بەرداوێم ..!))

( (هێشتا ڕەبەنیشە ..))

( (کوێرایی داهاتووە ئەو هەموو کچە نازدارە نابینیٚ؟))

( (بەخوا کەرە کچن .. کیٚ خودا دەیداتیٚ لە گۆشتی تەڕ بداتو لەولاوەش گۆشتی برژاو بخوات .. سەر بە ئەسپیٚو ڕشکینە ..))

( (ئاخر لەکویٚ بیستووتانە ژنینە .. بێوەژنێکی تەنیاو تەڕو دەوڵەمەند کۆمەڵێک پیاوی لۆزەندەرو کێر قەوی ڕابگرێتو .. وەڵڵا ئەوانە چین .. پاسەوانی خانمن .. بە زیادی خێرم نەکردبیٚ ..))

( (دەک حەیات بچیٚ وەکی چووە ..!))

( (وەڵڵا هەتا سەر بمێنیٚ .. قوون عەلامەتان دەبینیٚ!))

ژنانی ژیرو دەم پڕ لە حیکمەتی گەڕەکیٚ دەستیان بەیەکدا دەداو دەیانوت..

( (ئاخر خوداتان هەبیٚ .. ئەوە ناهەقییەو ئەو هەموو قسە هەڵبەستنە بە هەوەنتە گوناهە ..))

( (بووختانو قسەی بێجیٚ بەو ژنە دڵپاکە مەڵێن، ژنی وا دەستو دڵ کراوە کەمە .. بەو ڕۆژگارە چاوی لە هەموومانە، خۆ خودا هەر ئەمی نەکردووە بە بێوەژن .. گۆڕی خۆتان پڕ مەکەن لە مارو دووپشک .. کچینە!))

واتەواتەکە لەوە دەرچوو بوو کە بە تەنها قسەی چەند پتو پیرەژنو سەرەژنو گەورە کچەکان بێت، یان کچە تازە نەباڵقو عازەبەکان، یان

سیاسەتبازە بازاڕیو ژمارەیەک لە پیاو و تۆڵازی عاشق بە چرپەو فسکەفسکی ناو مەیخانەو چایخانەو .. خانەکانی دیکە، کوڕوکاڵو پیاوە خوێندەوارەکانیش پشکی خۆیان لەم هەراو بەزمە هەبوو، یەکێک لەو گەنجانە کە تازە ماستەری لە «دەروونناسی» تەواو کردبوو، لە کۆڕو کۆبوونەوەی نێرەوزە خوێندەوارو نەخوێندەوارەکاندا نەیدەبڕییەوە..

( (ئەم بێوەژنە دیارە چییەتی .. عوقدەی خەساندنی هەیەو هیچی تر .. بێجگە لەو کەپتە زۆرەی کە مێردە پیرەکەی نەیتوانیوە هیچی بۆ بکات، بە کورتیو بە کوردی تێر نەبووە .. مەعلوومە .. ئەم بەزمی مارو منارەیە جگە لەو دەردی بێبەشبوونە لە سۆزو سێکس هیچی تر نییە، ئەو ژنە لەتاو تەماعی شتێکی دیکە خووی داوەتە ئەم منارەیە .. مەعلوومە چییە .. خۆتان پیاونو دەیزانن، جارجاریش چاوی ڕەشکەو پێشکە دەکاتو ماری ڕەشو سوور دەبینێ .. (فرۆید) واتەنی .. مەسەل تەعویزە کە ئەمڕۆکە لە نووسیندا بە قەرەبووکردنەوە ناوی دەبەن ...!))

پیاوەکانیش سەرسامو ئەبڵەق کە زەحمەت بوو لەو هەموو قسانە تێبگەن، سەریان بۆ ئەو گەنجە لەقاندبوو کە چەندین کتێبی قەبەی خستبووە بن باڵی .. نائومێدانە لەو گەوهەرانە ڕامابوون کە لە زاری دەڕژان ..گەوهەر لە دیدی ئەوان.. لە هەمووان قسەزانتر وتبووی ..

( (قسەیەتی .. دەم خۆش .. هەر ئەوەیە .. تەواو .. ڕێی تێ دەچێ

.. ئەو ماستە بێ موو نییە!))

لە هەمووان سەرسەریتر کە رقی دونیای لەو ئەفەندییە لووسکانە دەبۆوە بێشەرمانە وتبووی..

((من هیچ حاڵی نەبووم لەو فلْتە فلْتە..))

ناچار باوکو دایکە، خوشکو براکان، خاڵو مامو پلک، کوڕو کچەکانیان، کەسو کاری دوورو نزیک، تاکو کۆ، بە قسەی خۆشو شیرین، جار جاریش بەدەم هەڕەشەو چاوسوورکردنەوە دەیانترساندیو هەراسانیان دەکردیت کە خەریکە منارەکە بەسەر ماڵەکەی تۆدا بڕمێت، بەزمی ئەم مارو مێرووەش نابڕێتەوە، ئەو شەڕی خۆترێنەش ماڵوێرانی تێدایەو ژنێک بە تەنها لە بەرامبەر ئەو هەموو پیاوە پارەدارو چەک بە دەستو خوێنخۆرەدا چی پێدەکرێت، لە دە لاوە کەوتنە وێزەتەوە ..

((کچەکەم .. ئەوەتا یەکە یەکە خانووەکانیان دەفرۆشنو چۆلی دەکەن .. گوناهت دەگات بۆ دونیامان لێ هار دەکەیت؟!))

(( ڕمانی منارەکە قسەو بیانووی ئەو گەلۆرانەیە .. کوفرە لام بیرپووخێننو بیکەن بە بازاڕو دوکان.))

((لە دەستیان دێ بتکوژن ..!))

((نازانم .. بۆ .. بەڵام پێم شەرمە لەو کەر پیاوانە بترسم، هەتا گەمەی ئەم مارو دووپشکەش بە فیتی ئەوان دەزانم .. ئێستا وای لێهاتووە هەر ماڵێکو مارێکی بەردەکەوێت، کەسی تێدا نەمێنێت چۆلی ناکەم ..!))

((خوشکەکەم .. هەق نییە وا لەخۆت بکەی .. ژنێکی تەنیا بە چ هێزو دەسەڵاتێکەوە ململانێ لەگەڵ ئەوانەدا دەکەیت کە سەرلەبەری ئەم وڵاتەیان بە خاکو خەڵکەوە کڕیوە ..!))

((گەر هەموو دونیایان کڕیبێت .. هەر خشتێکی ئەم خانووەو منارەکە سەری ئەو گەلحۆیانە دەهێنێ، خودا دەزانێ چ وەستایەکی دەست ڕەنگین خشتە بە خشت قوڕەکەی لەگەڵ خوێنو ئارەقەی خۆیدا شێلاوە، من بیر لەو هەموو وەستاو خەلفەو کرێکارانە دەکەمەوە کە ئێستا ئێسکو پرووسکیان نەماوە، کە چەندە عاشقانە لە خۆڵو ئاو منارەیەکی وا دانسقەیان بە ئاسماندا بەرزکردووەتەوە، کە هەر هەمووی هەقایەتی دەست ڕەنگینیو جوانی ئەو کەسانەم بۆ دەگێڕنەوە.))

((خودای تۆش دەرەقەتیان نایە .. دواجار ئەوان دەیبەنەوە .. ئەوانە مافیان ..ئامۆزا.))

((منیش لە ژێرەوە گەمەو جەنگی خۆم بەرپا کردووە، نامەوێ هیچ بدرکێنم، ئێستا پشی پشی بۆ من دەکەن، پارەوپوول هەڵڕشتن .. دۆستە کۆنەکانی هۆمەر کردوویانە بە ڕێگەی کانی ..))

((خاڵۆزا .. بۆ خاتری حورمەتی بنەماڵەو تایەفەکەمان .. ژنو پیاومان ڕوومان نایە بچینە ناو خەڵک .. ئێمە لە دەرەوەین ئەو قسانەی دوای تۆیان خستووە سەگ بۆنی پێوە ناکات ..))

((ئەوەیان ئاسانە بۆ ئەو گەندە پیاوانە .. هەر ئەو نامەردانە پەیامو نامەم بۆ دەنێرن، بەدەستی ئاشناو بێگانەدا، تاوەکو بزانن ئاخۆ شوو

دەکەم بە یەکێک لەوانەی دوو سێ ژنیان بەستۆتەوە وەک دابەستە، زگورتییەکانیش بۆ بەڵێیەکی من خۆ دەخەنە سەر ڕم، هەمووشیان هاوسەنگەری هۆمەر بوون ..))

( (ئێ خۆ هەر دەبێت شوو بکەیتەوە .. خوشکێ ..!))

( (شووم بە منارەکە کردووە ..!))

( (ئاخر ئەوە کەی قسەیە خاڵۆزا .. ئەوەی تۆ دەیڵێی بۆ شانی خاتوونێکی وەک تۆ جوان نییە ..))

( (من کە ئەم پاسەوانانەشم لای خۆم هێشتۆتەوە، بۆ ئەوەم نەبووە ئاگایان لە من بێ لە بەدکاران، ئەوان لەسەر وەسییەتی هۆمەر ماونو کوڕوکاڵی بەوەفان، من پێموتوون ئێوە پاسەوانی من نین لە ترسی بەدکاران .. ئێوە پاسەوانی ئەم منارەیەن .. ناچارم جارجار بۆ دڵنیایی نامەی ڕەزامەندی سەرۆکیان پێ پیشان بدەم ..))

(( ئەوە تۆ تێکچووی کچەتیو .. ئەو هەموو عەشیرەتە لەتۆ دەپاڕێینەوە، خۆ دائیرەی ئاسار نیت .. تۆ شێت بوویت، شووم بە منارە کردووە .. توو شەرەف جەماعەت .. ئەمە قسەی ژنێکە حەیاو حورمەتی خۆی بگرێت؟))

( (سەدان جار من پێموتوون کە من مەرگم پێخۆشترە لەم دۆڕانو بەزینە، من ئەم ماڵو جێگەیەی خۆم خۆش دەوێ، گەر کەسو کاری منن .. ناڵێم پشتگیریم بکەن، بەڵام مەبنە مایەی دۆڕانو دەردە دڵ بۆ من .. هەقتانە گەر حاشام لێبکەن ..!))

((حاشا لەچی بکەین .. کەس حاشای لە ناموسی خۆی کردووە .. هەر ئەوەندەت ماوە دەرپێکەت بکەی بە ئاڵاو لەسەر منارەکە دایکوتیت ..))

((ئەوەش قسەی کوڕە لاوێکی بەحورمەت نییە ئامۆزا .. تۆ خوێندەوارەکەیانی..!))

((ها .. هێشتا تۆ قەرزاربارمان دەکەی .. زۆر کەس بە مەزاقەوە کە دەگەنە لامان پێدەکەنن‌و دەپرسن: ئەرێ ڕاستە کچەکەتان شووی بە منارەکە کردووە؟!))

تاکو جووت، دەستە دەستەی خزم‌و خوێش دەهاتن‌و دەخیلت دەبوون‌و دەپاڕانەوە، بێهوودە بوو، نائومێدانە دەچوونە دەرێ‌و ماڵەکەیان بۆ بێوەژنێکی تەنیاباڵ چۆل دەکرد کە بە سەد دڵەوە دەجەنگای، ئاخۆ جگە لە خۆشەویستی بۆ منارەکە وەک ڕەمزی مێژوویەکی دێرین، چ خولیایەک وا دەکات وەها دلێرانە بەرامبەر ئەو هەموو کەس‌و کارە بوەستیتەوە وەک منارەکە کە بناغەی داکوتاوە، تۆیش پتر پێ دادەکوتی و لە هیچ سڵ ناکەیتەوە، وەها شێتانەو بێدەربەست لە دژی ئەو هەموو قۆنتەراتچی‌و ئەندازیارو سیاسەتبازو دەسەلاتدارانە دەجەنگیت، ئەو پیاوانە بە سەدەها ڕایەڵ‌و داوەوە، بە سەدەها تان‌و پۆی نهێنی‌و نەخشەو پیلانەوە بە یەکدی بەستراونەتەوە، ئەو پیاوانەی وەک ڕەوە نەهەنگێک هەر هەموو شتێک هەڵدەلووشن‌و بە

تۆی ماسیشەوە، دەیەها هەقایەتی ناشیرینو سەیرو سەمەرەت لە هۆمەر-ەوە دەبیست سەبارەت بە ئاغایانی بازاڕی ڕەشو سیاسەتی ڕەش، جگە لەو خۆشەویستییەت بۆ جوانی .. چ ڕقێکی پیرۆز وەها هاری کردوویت، چ کەللەڕەقیو ململانێو چ لەزەتێکی بێ پایانی ژنێکە کە بە تەنیا بە ڕووی ئەو هەموو پیاوە گەلۆرانە دەوەستێتەوەو دەڵێ..

((نا .. نا ..))

لە ڕۆژگارێکی بێ ماناو سووکدا کە هەر هەمووان دەڵێن..

((بەڵێ ..!))

دواجار کە غەمگین دەبوویت .. لێو بەبارو بە کەمێک ترسەوە، ترسی ژنێکی تەنیا، ترسێک لە پای ئەو هەموو هەڕەشەو هاشو هووشەی چواردەورت کە ناچاری دەکردیت لە خۆت بپرسیت..

((تا کوێ .. ئەم شەڕە تا کوێ؟))

بەڵام کە عاشقانە لە منارەکەت ڕادەمایتو سەروخوار پڕ بە هەردوو چاوانت تەماشات دەکردو دەتویست باڵاگەردانی بیتو هەر خۆت وەڵامی خۆت دەدایەوە..

((تا ماوم .. هەتا هەتایە و.. تا دوا نەفەس ..!))

خشت بە خشتت دەژمارد، دووربینە عەسکەرییەکەی هۆمەر-ت لە کیفەکەی دەردەهێناو بێ پسانەوە لە بالکۆنەکە دەوەستایت، ڕیزەکانت دەژماردو لێت تێکدەچوو .. سەرلەنوێ دەتژماردەوە، هەر

جارەو مەوداکەت نزیک دەخستەوە تا لەسەر خشتێکو دوانو سییان دەوەستایتو لە گەردیلەکانیانو ڕەنگو کەلبوون و خورانیان ورد دەبوویتەوە، هەستت دەکرد دووربینەکەو کیفەکەی بۆنی دەستو پەنجەی هۆمەر-یان لێدێت، بۆنی ئارەقەو ماکی چەوریو چڵکو باراناو و خوێنیش، واهـ .. لەو زەمەنە چ تیژ تێپەڕی، چەندە لە خەیاڵێکی کورتو شپرزە دەچێت یان خەونێکی کورت کە نیوەناچڵ بیرت بکەوێتەوە، برژانگەکانت تەڕ دەبوونو پێڵووەکانت قورسو بیناییت لێڵ، بەڕادەیەک کە خشتەکانو ڕیزەکانت لەلا تێکەڵ دەبوون، بێشک هەر فرمێسکێک لە ژێر ئەو پێڵووە قورسانەو دەنێو ئەو برژانگە ئەستورانەدا بێتە دەر وەک دانەی مرواری تێکدەشکێو دەکەوێتە سەر ڕوومەتی زەرد چوون گەڵای پاییز ...

دەرو دراوسێ .. خزمو خوێش سەرسامی ئەوە بوون کە لە نێوان ترسی بوونی مارێکی وەها کوشندە کە ئەگەر بۆ خۆشیو مەزاق بێت یان ترسێکی ڕاستەقینەی هەر هەمووان، یان بۆ تۆقاندنی خانمێکی جەربەزە بێت کە ببووە ئەژدیها، ئاخۆ بە چ ڕۆحێکەوە ژیان بەسەر دەبات.. لەنێوان مارێکی ژەهراوی لە ماڵەکەیداو ترسی ڕمانی منارەیەک بەسەر خۆییو خانووەکەیدا چ زیندەگییەک دەگوزەرێو چۆن هەڵدەکات؟

هەقایەتی مارو منارەکە ببووە سەرباسی ڕەشە خەڵکەکەو

نەجیبزادەکانیش، ناچار براکانت کە هەڵەتەی وڵاتانی دونیا ببوون، هاتنە سەر خەتو هەرجارەی یەکێکیان دەیدواندیت، هەر لە گفتی شیرینو برایانە تا دەگا بە هەڕەشەو گوڕەشەو جنێوبارانو سووکایەتی پێکردن، تۆ ملت نەدەدا، نە تکا نەرمی دەکردیو نە هەڕەشەش دەیترساندی، تا دواجار یەکێکیان شێت و هارئاسا وەها دەینەڕاند کە تەلەفۆنەکە بە دەستتەوە دەلەرزیو لەوەدابوو پەردەی گوێت خوێن داچۆڕێنێ، ناچار لە گوێی خۆتی دووربخەیتەوە، لە ڕاستەوە بۆ چەپ بیگوێزیتەوە .. بەدەم هاوارەوە سوێندی بە خوداو شەرەفی خۆی دەخوارد کە دێتەوەو گۆشاو گۆش سەرت دەبڕێت..

( (دەڵەقۆڕ..تاکەی خۆت سووکو چرووک دەکەی؟ .. هەر خۆت شووت بە یەکێک لەو گەوادانە کرد کە تۆ بە نامەردو ملهوڕو خیانەتکار ناویان دەبەی، گەر تۆ خۆت سەرت لەم واتە واتو ئابڕووچوونە نەخورێت .. پێم ناڵێیت بۆچی عەشیرەتێکت خستۆتە سەر زەلزەلە، چ خۆشییەکی تێدایە؟ ئەوە چ حەیاو ناموسێکە بێوەژنێکو ماڵێکی چۆڵو کۆمەڵێک گورگە پیاوت لە دەوری خۆت ڕاگرتووە .. بەس پێمبڵێ بۆ وا دەکەی .. تۆ کە خۆت بە هونەرمەند دەزانیت کەس نەمابوو لەو شارە شووی پێ بکەی جگە لە هۆمەر تەکتریۆڤ؟))

تەلەفۆنەکە لە دەستت دەکەوتە خواریو دڵت خاو دەبۆوەو نەتدەزانی چی وەڵام بدەیتەوە، کێ لەو خەمو دەردەدڵەت ئاگادارە، لە نهێنی خوێناویت ..!

براکان دەڕۆنو خوشکەکان بەتەنیا بەجێدێڵن، لەودیو کێو و شاخو بیابانو ئاسمانەکانی دیکەوە جنێو و هەڕەشەو دەردو خەم دەنێرنەوە، کوڕەکان کۆچ دەکەنو دایکانی چاو بە فرمێسکو شکستەباڵ بەجێدێڵن .. بۆ دەبێ هەمیشە وابێ؟ یەکەمجاری بوو گوێی لە نازناوی ـ تەکتریۆڤ ـ بێت کە ببێت بە کلک و بە ناوی هۆمەر ـ ەوە بنووسێت، دەیزانی ئەم نازناوە چەکێکی ڕووسییە هەر وەک کلاشینکۆف، دەیزانی هەندێک لەو پێشمەرگە کۆنانەی دۆستی مەرحووم هەڵگری ناوی ئەو چەکو ترو تفاقانە بوون: شەریف دەبابە، عەزەی کلاشینکۆف، قالە مزەڵی، عەبە ئار. بی. جی، بلە بڕنەو، جەلۆ بی کەی سی و خولەی عەدەد ڕەشاش ..

خامۆشانە لەودیو هێڵەکەوە گوێت لە هاتو هاواری براکان دەگرتو مەحاڵ بوو بزانن چ چارەنووسێکی ڕەش بوو خوشکەکەیانی گەیاندە ئێرە، هەموو جار بە هەڵەداوان بانگیان دەکردیت کە کاکەت لەودیو هێڵێکەوە ئاگری گرتووە، براکانت خەریکە باڵ دەگرن، دوای شەڕو گێچەڵەکان بە چواردەورتەوە خولیان دەخوارد دەیانپرسی..

((ها .. چیانوت .. تۆ بەتەمای چیت؟))

دەگریایتو خۆت دەخواردەوە، دڵت نەدەهات بە کەسیان بڵێیت چ کوورەی جەهەننەمێکت بۆ سازو جۆش دەدەن، بە قەهرەوە دەتوت..

((هیچ ناڵێن .. دەڕشێنەوە ..!))

بڵێیت چی؟ کە لە دووری هەزاران میلەوە تەنها داواو نەخێرو مەکەو

مەڕۆو فەرماییشتە زۆرەکانی خۆیان دەنێرنەوە، چ بە تەلەفوونو چ بە نامەو چ ڕاسپاردەی نێردراو بە دۆستو خزمدا، لەبری هەر دۆلارێک دەیەها فەرمانو مەرج، بۆ دەبێ براکان سەفەر بکەنو خوشکەکان دەنێوماڵەکاندا پرچی سپی بهۆننەوە؟!

تا دەهات واتە وات پتر لە دەرگاکانی دەدا، بە سەدەها بڕوبیانووی بەتاڵ ژنانوکچانی دەرو دراوسێ لە دەرگای تۆیان دەدا، ناسیاوەکانت بە بیانووی سەردانی کتوپڕەوە، بێ پرسو ڕا دەهاتنە ژوورێ .. تا بنەبانێ نەدەوەستان، وەک کەسانێک، چوار چاو، بە ژوورەکاندا دەگەڕان وەک ئەوەی ماڵیان دزرابێت، تا بزانن چ دەکەیت، چ دەخۆیتو دەخۆیتەوە؟ کێت لەلایە، چیت لە بەردایەو چ خەیاڵو خەونێک لە دڵتایە؟ چەندەها کەس لە ژێر دەمامکەوە یان بێ دەمامک بەشەو و نیوەشەو و بە ڕۆژیش تەلەفونیان بۆ دەکردیت، نێرو مێ، لەوە دەرچوو بوو سکاڵا تۆمار بکەیت .. دژی کێ؟ لەوە دەچوو شارێک تۆیان کردبێ بە جێ مەراقو خولیای سەرەخۆرەی خۆیان، ئەوانە ژمارەی کەسانێکیش نەبوون سانسۆر بکرێن، گومانی زۆرت هەبوو کە ژمارەکەی تۆش چاودێری لەسەر بێت، لە دۆخێکی وەها نالەبارداو دەنێو تەپو تۆزی وەها جەنگێکدا، گومانی ئەوەت دەکرد کە ئەو گەندەپیاوانە خۆیان لە بۆسەدانو وەک سیخوڕ چاوت لێ ناترووکێنن، گەرەکیانە ڕازو نهێنییەکت بزاننو بە دونیادا بڵاوی بکەنەوە، هەر

نهێنیی‌و خەون‌و خەیاڵێک بێت‌و با زۆر بێ ماناو چکۆلەش بێت، ئەوان دەتوانن سەدەها چیرۆکی ناشیرینی لەسەر دابمەزرێنن، دەنگت تۆمار بکەن، وێنەکانت بدزن، نیگاری حەیابەرە بنەخشێنن‌و ناوی تۆی بخەنە سەر، ئەوەندە دڵکرمێ ببوویت، گومانت لە پاسەوانەکان دەکرد کە بە پارەی زۆر بیانکڕن، جۆرەها نامەی هەڕەشەو هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی سالآنی «پەیمانگای هونەرە جوانەکان».. گەڕان بەدوای سەرە داوێک، گەڕان بەدوای ناوی ئەو کوڕانەی کە لەو پێنج ساڵەی ناو پەیمانگادا هاوپۆل‌و هاوپیشەت بوون، پرسی ئابڕووی تۆ لە مامۆستاکانت، ئەو دوکانانەی تۆ کڕیاریان بوویت .. سالۆنی خۆشەویست لای تۆ، ئاخر چ لەوە ئاسانترە، لەم وڵاتەدا، دە- دوازدە پیاوێک سەر لە بن گوێی یەکدی بنێن‌و پێک هەڵدەن، لە شەوێکی سووری مەستی‌و سووڕداندا، ئەوکاتەی لەناو چڕە دوکەڵی جغارەی گرانبەهادا بە جوانی یەکدی نابینن، بەدەم کۆکەو ڕشانەوە، بەدەم قومارکردن لەسەر دۆڕاندنی خەونی تۆو سەدەها مەردوومی دیکەدا، نامەردانە هەقایەتێکی ڕسوایی‌و داستانێکی ئابڕووبەرە بۆ بێوەژنێکی تەنیا بنووسنەوە و بیدەن بە گوێی ژن و خوشک و کچ و دۆستەکانیان ، چی لە واتەواتو قسە هەڵبەستن ئاسانترە کە وەک ئاگری لە پووش‌و پەڵاش بەربوو بتەنێتەوە، بەناو کوچەو کۆڵان‌و کەلاوەو کۆشکو دڵە گەنیوەکاندا پتر کڵپە بستێنێت، تەشەنە بکات‌و نەوەستێت تا بەرپێی هەمووان، بێ ئەوەی بە چاوانی خۆیان هیچیان دیبێت‌و یان سووسەی هیچ بکەن ..

دەم بخەنە پەناگوێی یەکدی ..

((-خوشکێ بێ مەلامەت نییە .. کێ لە ئێمە دەرەقەت دێ بە تاقی تەنیا ئەو هەموو پیاوە بخاتە کونەوە ..؟

-سەرۆک خۆی پشتو پەنایەتی.

-سووسەی ئەوەش دەکرێت دڵی برد بێت.

-فێر بووە پاسەوانەکان دەخاتە دوای خۆی وەک دێڵەبەبا .. کەس نازانێ بۆ کوێ..

-گوایە بۆ ڕەسمکردن دەچێتە ناو شاخو داخان ..

-لە کونە ئەشکەوتو قەڵاو حەسارە کۆنەکان دەگەڕێت بۆ دوزینەوەی شتی عەنتیکەی زەمانی زوو ..

-بەتەنیا ..؟

-خۆی بە دونیا ناگۆڕێتەوە .. بە خۆیی‌و کامێراکەیەوە ڕەسمی داروبەرد دەگرێت.

-دیویانە سواری جێبی جام تاریک بووەو فڕاندوویانە بۆ ناو ئەو شاخو کونە ئەشکەوتانە.

-بەسەری برایەتیمان فیلمی ڕووتی ئەمیان بینیوە ...))

هیچ نەما نەیڵێن .. هیچ نەما نەیبیستیت، هەموو بەیانییەک بووەتە خولیاو خوو .. بەپێوە یان لەسەر کورسییەک دادەنیشتیت، یان دەنێو جۆلانەکە خۆت ڕادەژەند، دڵپڕ لە کەدەر فرمێسکان دەبارێنی‌و

ناشتوانیت قەت گوێت لەو هەموو واتەواتە دابخەیت کە خوێن لە چاوان دێنن، زۆرجاران خەوەنووچکە دەتباتەوەو لە ڕمانی منارەکەت بێدار دەبیتەوە، ماوەیەکە بە هەموو کوڵی گەرمی دڵتەوە لێی دەپاڕێیتەوە کە ئەوەندە بەسەرتا نەڕووخێتو خەونەکانت پڕ نەکات لە وێرانەو داڕمانی باڵاکەی ..لە تەپو تۆز ..

((هۆ منارە خۆشەویستەکەم فریام کەوە ..!))

دوێنێ شەو و ئەم بەیانییەش کە بەدەم زیندە خەوەوە وەنەوزت دەدا منارەکەت بەسەرتدا نووشتایەوەو ڕازی پڕ ترسی خۆی درکاند..

((من لەداخی تۆ دەڕووخێم بەسەر خۆمدا .. گلەیی ئەوەم لێتە گەر تۆ گەردنی منت مەبەستە، گەرەکتە بەپێوە بوەستم .. چیتر مەگریو ئەوەندەش مەڵێ ..

-خودایە .. بۆ نامکوژی؟))

بەڵێنت دا کە ئەمەیان دواجار بێت، لەخەو ڕابوویتو بە پڕتاو تا پەرژینی بالکۆنەکە ڕات کرد، لەوەدا بوو ساتمە بکەیتو هەرزەلیتو سەرانگریێ بیت، ئەو بوو، بەهرام بوو، دەنێو جەنجاڵی مەردوومەکانو عەرەبانەی وردەواڵە فرۆشو سەوزەو میوە فرۆشو ئەو هەموو دەرۆزەکەرو پیاو و تۆلازە بێ کارو دەست بەتاڵو عەلاگە فرۆشو دەستگێڕەدا بە دەوری منارەکەدا دەخولایەوە، بە تەلەفوون پێی وتی چی لەبەر دەکات تاوەکو بیناسیتەوە، بە ڕەوتی خێراو لەنگینی بەلای ڕاستدا ناسیتەوە، هێشتا هێزو توانای ئەوەت هەبوو تارمایی ئەم لە

تارمایی سەدەها کەس جیابکەیتەوە، لە ژێر سێبەری پانو چڕی منارەکە وردو گرگنو چەماوە دەینواند، لە دوورەوە تا نزیک کەوتەوە هەر بانگت دەکرد تا ڕێک ڕووەوماڵەکەت بێتو ڕێ وێڵ نەکات، دەستێکی هەڵشەقاندو سەری بڵندکردو زەحمەت بوو بزانیت خەندە گرتوویەتی یان غەمینە، سووکە ساتمەی لە دارو بەرد دەکردو دەهات.
وەک بەیداغێک دەستی بڵند .. دەشکایەوە .. یانێ..
((واهاتم .. تۆم دۆزییەوە!))

* * * * * *

* * * * *

*

# نیوەڕۆ-ئێوارە

هەموو شتێک لەوماڵەدا بۆنی ئەوەی لێدەهات کە ژنێکی تەنیاو تۆراو خۆی بەند کردووە، دوور لە خەڵکو کەسو کار، زۆر گران بوو وتنی ڕستەی یەکەم، لە چاوتروکانێکدا هەستی کرد بەوەی کە نەدەبوو خۆی بخاتە وەها دۆخێکەوە کە نەزانێت چۆنو لەکوێوە دەست پێبکات، هەوڵی دەدا گومانو خەمی خۆی بشارێتەوە، لە هەمووشی پتر نهێنی خامۆشی خۆی دوای هەڵەتەبوونو ساڵانی لێکدابڕان، هەرگیز نەدەکرا لەبەردەم بتی تێکشکاوی خانمێکدا عاشقانەو نێرانە سۆزو خۆشەویستیو تاسەی گەرم دەرببڕێت، نەدەکرا لەبەردەم بێوەژنێک کە بێئومێدی لەسەرو سیمای دەباری نمایشێکی درۆزنانە پێشکەش بکات، داکەوتنی شانەکانی بە هەردوو لادا وەک ئەوە وابوو کە بەرگەی قورسایی ئەو شاڵە تەنکو شینە نەگرن کە تا خوار کەمەری بە هەردوولادا شۆڕببوونەوەو لە ئاست هەر دوو مەمکەکانی کەمێک بەرز ببوونەوە، پاشان ڕێک داکەوتبوو تا سەر ڕانەکانی، تەنوورە ڕەشو گەچلاوەکەی، سۆلە کۆنو تۆز لێنیشتووەکانی، ڕەنگی پەڕیوی، ڕوانینی وێڵو نیگای پەرتی، کە لەسەر هیچ شتێکدا نەدەگیرسایەوە، ئاوێنەیەکی تەڵخی بازنەیی کە نەتدەزانی تۆزو چڵک داپیۆشیوە یان تەمێک، جوڵەو هاتو چۆی بێ مەبەستو شپرزەی، هەتا هەوای لەرزیوی دەوری باڵای .. هەر هەمووی شلو شێواویو کەوتنو دەست

لەخۆبەردانی لێدەباری ..

ویستی ئازا بێتو چش لە هەر پێشهاتێکی نابەجێ، ئاخۆ دەکرێت دەستەکانی بگرێو چوستو چاپووکانە بیگرێتە ئامێز؟ بەڵام نەدەکرا .. چونکە کە ئەمی بینی .. خانمی تاین وەک ژیژکێک کە مار ببینێت خۆی گرمۆڵە کردو چۆوە ناو قاوغی خۆیەوە، خۆیشی نەیدەزانی ئەو ترسە لەناکاوە چیبوو دایگرت.. رەنگە لە گۆشەیەکی تاریک و پەنهانی رۆحیدا بێداربوونەوەی ئەو ترسە دێرینە بێت کە لەژێر کەپرەکەدا لە دڵیا چاندی.. کە شادی زانی «بەهرام» شپرزەو شێواو لەناو دەرگاکە وەستاوەو چاوان دەگێڕێت بە دارو دیوارو باڵای ئەودا، فەرمووی هاتنەژوورەوەو دانیشتنی لێکرد، دەستی درێژکرد بۆ تەوقە کردن، گەرچی بەدەم تەوقەکردنەوە لە نیگای یەکدی خۆیان دەدزییەوە، پێکەوە هەردووکیان زانیان کە ئەوەندە نەناسو نامۆن بە یەکدی کە مەحاڵە بتوانن ئەو تەوقی تەریقییە بشکێننو بستێکی دیکە لە یەکدی نزیک ببنەوەو بکەونە ناو باوەشی گەرم یان ساردی یەکدی، شادی گوێی زرنگایەوە بە ((نیوەڕۆ باش ..)) کە بە ئاستەمو شەرمنانە لە ژێر لێوەوە دەرهات، ئەویش کزۆڵەو مردووانە وەڵامی دایەوە، دوای خامۆشیو خۆ دزینەوەی خانمی خانەخوێ لە دیدارێکی وەها ماتەمینو پڕ لە هەوای خنکاو و هەناسەسواری، خۆدزینەوە بە بیانووی هێنانی پەرداخێک ئاو و قاپێک میوە، میوانی دوور وڵاتی ناچار کرد

کەمێک دەنگ هەڵبڕێت کە لەو ماڵە چۆڵەدا سەداو دەنگدانەوەی هەوای خنکاوی خستە سەر لەرزینێک..

– پاسەوانەکانت پرسیارو سۆراغی زۆر وردیان لێکردم .. بڕوایان نەدەکرد خاڵۆزاو پورزا بین ..!

ئەمیش لە موبەقەکەوە دەنگی هەڵبڕی کە شەپۆلێک بۆنو بەرامەی ڕژاندە ژووری میوانەکە کە دیاربوو لەسەر ئاگر چەند مەنجەڵێک پێکەوە دەکوڵێن، کەمەکێ دڵی خۆی بەوە خۆش کرد کە هەر دەبێت خۆ ئامادەکردن بێت بۆ ڕازاندنەوەی خوانێک پێکەوەو دوو بە دوو ..

– ویستوویانە دڵنیابن..ئەگینا دەیانزانی. پێت سەیر نەبێ .. تۆ یەکەمین پیاوی کە بەتەنیا دوای مەرگی مێردەکەم دێیتە ئەم ماڵە ..!

وشەی «مێردەکەم» زرنگانەوەیەکی سەیرو غەمهێنی هەبوو لە گوێی بەهرام-دا .. وەک قورقوشمی تواوە ڕژایە ناو هەناوی، بەجۆرێک تاسا کە ئەو خەندە دەستکردەشی ڕەوییەوە کە بە زۆر لەسەر لێوانی ڕایگرتبوو، کە بە خۆییو سینییەک میوەوە گەڕایەوە بینی چەند پەرێشانە، کە لێی وردبۆوە نەیتوانی لەسەر ئەو ڕووخسارە فلاتو تەخت داتاشراوە ڕەنگی هیچ سۆزو تاسەیەک بدۆزێتەوە، هەر دوو قۆرتی خوار لاجانگی پڕ ببوونەوە، چەند هێڵێکی باریکو قووڵ کە بە سێ ڕیز دەژمێردران کەوتبوونە سەر برۆکانی، ماسولکە بازنەییەکانی هەردوو شانیو هێڵی کراوەو ڕێکی جەستەی لە ژێر

چاکەتێکی عەسکەرییانەو پانتۆڵێکی قەدیفەی سەوزباودا بۆ دەرەوە دەتەقین، چاکەتەکە بە هەوایەکی ئیرۆتیکییانە دوورابوو کە قۆپچە زیوینەکانی دەبریسکانەوە، هەموو جووڵەو نیگایەکی هەوەسێکی نێرانەی دەردەخستو کەچی بە ترسێکەوە دەیشاردەوە، بە ئەنقەست بێت یان بێباکی لۆتیانە دوو قۆپچەی کراسەکەی کرابوونەوە کە لەو سێگۆشەیەوە تووکی بەرملو سەر سینەی وەک تیسکی نێرییەک دەنێو ئارەقەیەکدا ڕەش ڕەش دەبریسکانەوە .. بەهرام ویستی خامۆشیو ترسی ئەو هاتنەی بتەرێنێ، هەردووکیان نیوەناچڵ دەیانزانی ئەم دیدارە بۆچی ساز کراوە، چەندە لە شادی ورد دەبۆوە پتر هەستی دەکرد کە گۆڕاوە، یان بە هەستی کۆنە عاشقێک دەرکی ئەوەی دەکرد کە شتێکی ناسک وەک شکانی مینایەک لەناو ڕۆحیدا ورد و خاش بووە، شکانێک کە هەرگیز ئاسان نییە پارچە وردەکانی کۆبکرێنەوە، دەشیویست ئیرەیی نێرانەی خۆی لەو ژنە بشارێتەوە لە ژوورو ماڵێکدا کە هەر هەمووی بۆنی پیاوێکی غەریبی لێدێت، دەبوو ڕستەیەک فڕێبدات کە گومانی ئەوەی لێنەکات ئەم بۆ سووکە شەڕ یان گلەیی هاتووە، شەڕو گلەیی عاشقێک لە مەعشووقەکەی کە دەبوو پتر چاوەڕێ بکات، دەشیزانی کە تۆرانو دڕدۆنگی مەعشووق هەر وا خۆڕایی نییەو بە هەوەنتە ئاواهی مەلوول نەبووە، بەڵام هەر قورس بوو لە کوێوە سەری قسەوباسێک دابمەزرێنن، لەودیو پەنجەرەکەوە کە بەسەر بالکۆنەکەوە کرابۆوە لە منارەکەی ڕوانی..

- ئەوە منارەکەیە؟

بە غەمێکەوە نیگای کردو دڵساردانە وەڵامی دایەوە..

-ئەوە منارەکەیە .. خۆ یەکەمجارت نییە بیبینیت؟!

- نا .. یەکەمجارم نییە .. ئێستاش وەکو خۆیەتی .. تازە بیرم لەوە دەکردەوە کە چەندەها جار ڕاوەدووی یەکدیمان ناوەو چاوشارکێمان بەدەوریدا کردووەو لەناوەوەیدا خۆمان لێکدی دەشاردەوە .. لەتەک کچو کوڕانی دیکە ..

- ڕاست دەکەی .. کە بیر لەو ڕۆژگارە بکەینەوە .. زۆر پاکترو جوانتر بوو لە ئێستا..

- هەڵبەت .. کێ ماوە لەوانەی دەیانناسین .. غەریبی هەندێکیان دەکەم ..؟

- کەمیان .. زەمانە هەمووانی لە یەکتر دابڕی، ئەوەی مردو ئەوەی سەفەری کردو وەک تۆ هەڵەتەی وڵاتان بوون، لە مێو نێر، ئەوەی شووی کردو ژنی هێناو خەمی ڕۆژگار بردی، ئەوەی لە شەڕەکانی عیراق- ئێرانو عیراق- کوێت گەردەلوولی بیابانو یان دەنێو ئاگری جەهەننەمی حزبەکانی خۆماندا سووتا، چ لە شاخو لە شاردا .. تۆ باشتر دەزانیت لەم وڵاتە چی قەوماو چ دۆزەخێک پاش ئەو هەموو قیامەتە هەڵایساو جۆشی سەند .. لە هەمووشی کوشندەتر ئەوەبوو کە خۆشەویستی تێیدا سووتا ..

- خۆشەویستی منو تۆش؟

- هی منو تۆش، بەڵام زۆر لەسەرخۆو چرکە بە چرکەو ڕۆژ دوای ڕۆژ وەک دارستانێکی بێسنوور کە گەڵا بە گەڵاو .. چرۆ چرۆ .. لق بە لق، قرچە قرچ دەسووتا تاوەکو سەرپاکی بوو بە خۆڵەمێش، خۆڵەمێشێک کە با بیبات، سووتانەکەشی کەوتبووە ناوەڕاستی ئەو هەموو وێرانەیە ..!

- بۆ وا ڕەشبینانە .. وەها هۆنیتەوە کە هەست بکەم باڵندەیەکمو بەسەر سووتانی دارستانێکدا باڵ لێکدەدەم کە چڵێک نادۆزمەوە لەسەری بنیشمەوە .. وەک ئەوەی ڕەسمی جەهەننەمم بۆ بکەیت ..

- بۆ من گەر درۆ نەکەم جەهەننەم بووە .. نازانم بۆ تۆش .. من بۆخۆم ڕێک ئەو مەلەم کە تۆ وتت بەسەر دارستانێکی سووتاودا دەفڕێتو هێلانە سووتاو .. نابینا بەناو دوکەڵێکدا ڕووەو بەرزایی باڵ لێکدەدم .. کەچی هەر دووکەڵە!

- ئەو جەهەننەمە دەستکردی من بوو؟!

- چ کەڵکی هەیە بزانین ئەو جەهەننەمە کێ ئاگرەکەی خۆش کرد، کە هەر یەکەمان بۆخۆی تیایدا دەسووتێت، مانایەکی تێدا نییە بزانین چ خودایەک خاوەنی ئەو زەمهەریرو مەنجەنیقەیە، جەهەننەمەکە هی هەمووانە ..

- بەڵام وانییە .. شادی .. ئەوەتا هاتوومەتەوە لەو جەهەننەمە دەربازت بکەم ..

- دەربازم دەکەی ..؟! بەڵام تۆ لەناو ئەو ئاگرەی ساڵانێک تێیکەوتبووم

چنگێک خۆڵەمێش قورتار دەکەی ..

- بۆچی چاوەڕێت نەکردم .. خۆ من نەمرد بووم..کەس نەبوو لەم شارە بێجگە لەو زەلامە؟!

- ساڵەهای ساڵ چاوەڕێم کردیت، ئەمڕۆ نا .. بەیانی دێیتەوە، ساڵ دوای ساڵو مانگ دوای مانگ نائومێدتر دەبووم، دەردی چاوەڕوانی خستمییە ناو جێگاو نەخۆشی خستم، تووشی کولبوونی گەدەو ناو هەناوی کردم، لە هۆشخۆچوونی لەناکاو، چاوەڕێ بووم بێیتەوە بەرلەوەی گەردەلوولی زەمانە وەک پووشو پەڵاشێک هەڵمبگرێت، منیش کچ بووم وەک هەر کچێکی تر کە خەونو خولیاو حەزی هەیە، عەزرەتی بوومو دەمویست چاوم پێت بکەوێتەوە، گوێم لە دەنگت بێ، دەستەکانم بخەیتەوە ناو دەستت، یادت نەچێ چەند بێ سۆزێکی ڕاستەقینە دەژیام، لە سۆزی پیاوێک با کەمێک درۆو فریویشی تێدا بێ .. هەڵمبگرێتەوە، تۆ دوور بوویت وەک دووری ئەستێرەیەکی کز لەودیو هەورەکانەوە، وەک مەحاڵی خەونێک کە هەموو تەمەن چاوەڕوانی دەبیتو هەرگیز نایە، من بە دڵێکی کوژراو و ڕۆحێکی زەبوونەوە دژ دەوەستامو دەجەنگام، بەزینی خۆم لە ژیاندا لەناو ئەو شەڕانەدا دەشاردەوە کە لە بەرامبەر ئەو بۆرە پیاوانەدا بەرپام کردبوو، مەبەستم ژیانێکی ژنانەیە کە ملیۆنەها ژن هەیانە، بێباک لە بردنەوەو دۆڕان، سەدەها جار لە خەونەکانمدا لە باخەکەی خۆتان یان لەناو پێدەشتێکی سەوزدا وەک دوو باڵندە چڵاو چڵ دەفڕین،

یان تۆ دەبووی بە کەڵەکێوی‌و ڕاوەدووی منی ئاسکت دەنا، کەچی کە چاوەکانم دەکردەوە دەمبینی پیاوێکی نەخۆش کە بۆنی دەیەها دەرمانی لێدێ‌و هەوای چواردەوری ژەهراوی بووە وا لە تەنیشتم خەوتووە، دەمدایە پڕمەی گریان دەم‌و لووتم دەچەقاندە نەرمایی سەرینەکە تا کابرای دەردەدار هەستی پێنەکات، دەیزانی‌و نەبا تەریق ببمەوە خۆی گێل دەکرد، چونکە سوڕ دەیزانی چەندە دڵم بداتەوە .. ئەوەندە زیاتر وێران دەبم .. هەر باوکو براو خوشکەکانی خۆم‌و خۆت هەراسانیان کردم، هەر هەموو کەس‌و کار بە چاوی گومانەوە، بەدەم پرتەو بۆڵەو تانەو تەشەرەوە، قسەی وایان فڕێدەدا کە ڕۆحی دەردێنام، من نەچووم شوو بە کوڕە لاوێکی قۆزو دەوڵەمەند بکەم، پاشان کێ هەیە قایل بێت کچێکی «بێ بن» بخوازێت، تۆ چاک نێرینەی ئەم وڵاتە دەناسیت، من وشک هەڵاتم وەک پیرەدرەختێک کە لە ڕەگەوە کرم لێیدابێت‌و زۆر چاوەڕێم کردیت، شکستەباڵ‌و تەنیاو ئافەرۆز، من شووم بە پیاوێک کرد کە دوو تەمەن‌و نیوی منی هەبوو .. پیاوێکی ژەهراوی‌و نزیک بە مەرگ تا بە ژیان، کەس هەیە ڕوو لە مەرگ بکات، گەر ژیان چاوەڕێی بێت؟ کۆکەکۆکی ئەم بەسەر هەموو دەنگێکی دیکە لە گوێمدا زاڵ بوو، سەرەتا بەڵغی سینەی داڕزاوی تف دەکردەوە ناو پەڕۆکو دەستەسڕە بۆرەکانی، دواتر هێزو شەنگی نەماو دەستەکانی بە خۆیدا شۆڕ دەکردەوە، ناچار خۆم یارمەتیم دەدا، دوو سێ جار ویستی خۆی بکوژێ، هەمیشە دەمانچەکەی لە

ژێر سەریدا بوو، دەیوت لەم وڵاتە ناتوانیت بزانیت کێ دوژمنتە، ناچار لێم دەشاردەوە .. بمبوورە کە تۆ وام لێدەکەیت وردو درشتی هەقایەتەکەت بۆ بگێڕمەوە، تا شادومان بیت کە کۆنە یارەکەت قەد ئاسوودە نەبووە، دەیوت تۆ گوناهت چییە خزمەتم دەکەیت؟ دەموت عەیبە .. خۆ شێریش نەخۆش دەکەوێ، دەیوت ڕاستە دەڵێن نەهەنگەکان کە پیر دەبن دێنە قەراغ زەریاکان تا بخنکێن، پێیدەوتم :من خۆم دەکوشت، بەڵام شەقژنی گوللەو گەوزینی من لەناو خوێندا تۆ دەتۆقێنێ، هەتا دوای مەرگیشم لەناو گۆڕەکەم ناسرەوم کە تۆ بترسێنم، زۆر بە دەگمەن هاوڕێکانی سەردەمی شاخ سەردانیان دەکرد، ئەو دوو سمێڵ بابڕەی جاروبار دەهاتنە لای وەها سەیری منیان دەکرد وەک ئەوەی ڕووت بم، دڵم نەدەهات پێی بڵێم هاتنی ئەو دوو زەلامە وەڕسم دەکات، هەستم دەکرد پەلەیان بوو بمرێت تاوەکو بێوەژنێکی تەنیاو جحێڵ وەک سێوێک یان خۆخێکی گەییو دەکەوێتە ناو کۆشی کامەیان، بەرلەوەی بمرێت حەزی دەکرد بمبات بۆ ئاورووپاو کاروباری مانەوەم بۆ تەواو بکات، پێمدەوت کە تازە هیچ شتێک دادم نادات ..من ڕەسم دەکەم پتر حەزم لە هەتاو و ڕەنگەکانە، بەرگەی هەورو هێڵ ناگرم، کە بەدەم ئازارەوە دەتلایەوە ناچار دەرزییەکم بۆ دەکرد تا بخەوێت، کە خەم وەک بەرداش دەیهاڕی، فێڵم لێدەکرد تا لەبیری بەرمەوە دەمپرسی چۆن دەچوویتە ڕاو؟ چیت دەبرد بۆ ڕاووشکار، قەت شەو دەمایتەوە لەو شاخانە؟ دڕندە زەفەری پێ

نەدەبردی؟ کامیان بۆ تۆ خۆشتر بوو .. ڕاوە بەراز یان ئاسک یان مەلی کێوی؟ ئازاری خۆی لە یاد دەکردو جار هەبوو تەکانی دەداو دەیویست هەستێتە سەرپێ وەک ئەوەی ڕابکات بەدوای نێچیرێکدا، بە سەعات سەرمەستی گێڕانەوەی ڕاوێک دەبوو ..ئەلبوومەکەی پێ دەهێنام تاوەکو لەو ڕەسمە زەردو کۆنانەی خۆی بڕوانێت کە تیایدا لاوچاکو چەلەنگ دەردەکەوت، ڕێکپۆش‌و بە تڕوتۆپ وەک ((سمکۆی شکاک)).. ڕەسمەکان چڵکن‌و شۆراو بە دڵۆپەو چڵکن بە جێ پەنجەی چەور کە دەیبردینەوە ڕۆژگارێکی کێوی‌و جوانتر لە ئێستا لە چاوی ئەودا .. پڕ شکۆمەندی، ڕۆژگارێک لەناو گەرمەی شەڕەکانیشدا مەحاڵە پیاوەکان بواری ئەوەیان هەبووبێت نەخۆش بکەون یان بیر لە مەرگ بکەنەوە، شێت‌و شەیدا بە ڕاوکردنی مرۆڤ‌و مەل‌و ماسی‌و دڕندەی ناو شاخ‌و پێدەشتەکان، هەمیشە لە وێنەکاندا سەر بڵند لەسەر کەرتە شاخێک یان گوێ چەمێک وەستابوو نوقمی ژێر ڕەختەو فیشەکدان .. بە خەندەیەکی داکەوتوو لە ژێر سمێڵان‌و لە کامێرای ڕوانیوە، هەمیشە چنگێک کاکۆڵی ڕەش لە ژێر جەمەدانییەوە نێوچەوانی تاریک کردووە، هەمیشە بە فیزێکەوە تیلاکی لێ خوار کردبۆوە ..بێئاگا لە خۆی لە ڕاوی مامزەوە بازی دەداو تێکەڵی دەکرد بە شەڕەکانی هەندرێن‌و زۆزگەوە، بیری دەچۆوە کە دەیەها جار بۆی گێڕاومەتەوە، ناچار بە سەرسامی دەمم دادەپچڕی هەتا ئەو هەست بکات نەبەردییەکی گەورەی نواندووە، سەرەتا ڕووخساری بەدەم گێڕانەوەی هەقایەتەکان

دەگەشایەوە، بەڵام هێدی هێدی دەمو چاوێکی مۆم ئاسا کە هیچ هەستێکی تێدا نەدۆزمەوەو بڕوانیتە بۆشایی، پڕ چرچو ڕێ ڕێو ماکی ڕەش داگەڕاو، پێستیشی تەواو ڕەنگی گۆڕا بەو هەموو پەڵەو ماکەوە لە هی مارمێلکە دەچوو کە تەواو غەمگینی دەکردم، من لەوە غەمگینو ماندووترم بڕو بیانووت بۆ بدۆزمەوە کە بۆچی شووم بەو زەلامە کرد، بەڵام تۆ لە هەر کەس چاکتر دەزانیت چ چارەنووسێکی ڕەش منی گەیاندە ئێرە .. خالۆزا .. تۆ دەتەوێت چاڵێک هەڵبکەنیت کە گەنجینەی شاراوەی تیا بدۆزیتەوە، چاڵەکە هەڵکۆڵە .. پترو پتر .. دواجار لاشەی مردوویەک وا لەناو ئەو گۆڕەدا ..!

بە قەهرو دۆڕانێکی گەورەوە پرسی..

-تۆ زۆر گۆڕاوی .. بۆ بەم زمانە تاڵەوە دەمدوێنی .. بۆچی هەموو دەرگاکانت داخستووەو هەموو ڕێگاکانت بە قوڕ گرتووە، ئێمە سەدەها یادگاری جوانمان پێکەوە بوو، هەموو مناڵیمان، گەنجییەتی ..

-من بۆ خۆم هیچیانم لە بیر نەچووە، دەست بەرە بۆ ئەو ئەلبوومو دەفتەری ڕەسمو سکێچەکانم، هەر هەموو ئەو تەمەنە بە خۆشیو ناخۆشییەوە وا لەوێدا نووستوون، بەڵام لێت ناشارمەوە کە هەر هەمووی بەسەر یەکەوە ئازاربەخشە، گەرچی بۆ دەربازبوون لەو جەهەننەمە هەر ئەو سەردەمە دوورو دێرینە شک دەبەم .. من زۆرجاران دەپرسم چ حیکمەتێکی تێدا بوو کە گەورە بووین .. هیچ .. هیچ ..

دەتزانی گەر تاوێک بدەیتە پڕمەی گریان.. خراپ دەکەیت، چونکە ئەوسا «بەهرام» بیانووویەک دەدۆزیتەوە تاوەکو بتلاوێنیو دەست لە ملت بکات، بۆ خۆدزینەوە لەو دۆخە ناجۆرە ڕووەو کۆمێدییەکە ملت نا بەو بیانووەی دەفتەرەکانتی بۆ بێنیو لە ڕەسمەکانەوە ئەو مێژووە بخوێنێتەوە، مێژوویەکی ڕەشی تەنیاکەوتن، توانیت فرمێسکەکانت بشاریتەوەو بە ئەلبوومو دەفتەری ڕەسمەکانتەوە ڕووت تێکرد، ناچار ڕوو قایمانەو بە نەغمەیەکی زاڵەوە وتت..

- هیچ تامو جوانییەکی تێدا نییە ئەم پرسیارانە .. گفتوگۆی بێ سەمەر، سینو جیمی زۆر پتر ئازاری ڕۆحم دەدات.

لە بەرامبەری ڕوونیشت بەو نیازەی لەبری قسەکردنو پرسیاری غەمهێن، سەیری ڕەسمەکان بکات، لەناکاو نێرانەو شپرزەو پەرێشان هەستایە سەرپێو نیازی بوو لە تەنیشتییەوە دابنیشێت، ئەمیش وەک ئەوەی کچێکی تازە باڵق بوو بێت سوور هەڵگەڕاو لێوەکانی تەتەڵەیان دەکردو دەستەکانی دەلەرزین، بە ترسێکی زۆری مێیینەیێکەوە کە پێشبینی هەوەسێکی پیاوانە بکات .. پێیوت..

-چاکترە .. لەو شوێنەی خۆت دابنیشیتەوە ..!

-ئاخر بۆ؟

-لەخۆت بپرسە .. تۆ خۆت واتکرد تا ئەبەد بە یەکدی نامۆ بین، من بە هەردووکیان قەڵسم .. چ بەرامبەرت دابنیشمو سەیری چاوەکانت بکەمو چ بێیتە تەنیشتم ..قەت نەمدەزانی ئەوەندە دەشێوێم...

-هیچ نەبێت خزمینو لە هەمان خوێنەوە هاتووین .. من و تۆ دڵدارو دڵخواز بووین.. بۆ وا ئاسان مردم لە دڵی تۆدا.. ؟

-کە خۆم مردبم .. دەتەوێت چی لەناو مندا زیندوو بمێنێت؟

-من لە تۆرانو زویریت تێدەگەم .. بەس لە ڕقو کینە دەترسم .. شادی گیان.

-ڕق نا .. باسی ڕق مەکە .. چونکە تۆ چاک من دەناسیت .. دەزانیت کە ڕق پتر لە خۆم دەخوات تاوەکو لە تۆ ..

خامۆشییەک ژوورەکەی پڕکرد لە دڕدۆنگیو ڕەنجان، خامۆشییەک کە بۆنی مەرگو دابڕانی لێبێت، هیچ مانایەک نەمابوو بۆ قسەکردن لەسەر ڕابردوویەک کە لە شوێنێکو زەمەنێکدا جێما، تازە مەحاڵ بوو بگەڕێنەوە سەر جوانییەکان، هەڵەمووتێک بوو کە تیایدا چ گەڕانەوە بۆ دواوەو چ هەنگاونان بۆ پێشەوە هەڵدێرانێکو هەپروون بە هەپرونبوون بوو، بێجگە لە ڕۆندک ڕژانو دەردو دۆڕان، بۆ شادی، دوای ساڵانێکی زۆری دابڕان هیچ هێزو سیحرێک نەیدەبردەوە سەر یادە شیرینەکان، لەناکاو بەدەم قوڵپی گریانەوە کە زۆری لەخۆی دەکرد نەبێت بە داڕژانی فرمێسکو لە چاوەکانییەوە جۆگەلە بکات ..

-منو تۆ وەک دوو منداڵی ناو قەڵەباڵغیو هەرای ناو وێستگەیەک دڵمان بە هەموو جوڵەو قسەیەک خۆش بوو، ماوەیەکی کورت سەرسام بە گەمەو خۆشیو زرمەزلێ، کەچی لەناکاو گەورە بووین، تەواو وادەی

سەفەرو ماڵئاوایی هات، کەچی سواری هەمان شەمەندەفەر نەبووین، هەر یەکەمان پێچەوانەی ئەوی دیکەمان سەفەری کرد، سەفەری من ..سەفەری مەرگو دابڕان بوو .. نازانم هی تۆ ..؟
بەهرام بە دەنگێکی کەرخو غەمگینو تەواو داکەوتوو، لەناو قەرارێکەوە سەر کردوو وتی..
-تۆ بڵێیت سەفەری من ڕووەو بەهەشت بووبێت؟
کە ئەم ڕازەی درکاند ڕێک سەیری ناو هەر دوو چاوە تەڕو گەشەکانی دەکرد کە پڕبوو لە شەبەنگی ڕۆشنایی، پرسیارێک کە پڕبوو لە مەزاقو تاڵیو خۆ لە گوناهـ پاک کردنەوە کە مەحاڵ بوو بۆ ئەم هیچ مانایەکی هەبێت. شادی نەیدەزانی چۆن لەم دانیشتنە بێتە دەرێ، چرکە چرکی سەعاتەکەی دیوار پتر لە داکوتانی بزمار دەچوو لەسەر سینەی کە تا ناو هەناوی ڕۆ بچێت، زەنگێکی ناقۆڵا بێ سرەوتن لەناو کەللەیدا لێیدەداو دەنگی دەدایەوە، گومانی ئەوەی هەبوو کە بەهرام مەستە، هەمیشە جارانیش وابوو .. کە ژوانێکیان ببووایە دەیخواردەوە، دەیوت ئەم شیری شێرە مرۆڤ ئازا دەکاتو شەرم شکێنە، لە دوورەوە بۆنی دەکرد، دەشیزانی کە مەست بێت پێشبینی ناکرێت چی دەکاتو چی دەڵێت، تۆ بڵێیت ئەوساش سێ مانگ بەر لەو کۆچو سەرهەڵگرتنەکەی، گەر مەست نەبووایە..ئاخۆ ئەو خەمو کارەساتەی بۆ بەجێدەهێشت، ترسو گومانێک کە هی ڕۆژگارێکی دوورو دێرین بوو لە دڵیدا نیشت، هەر وەک ئەوەی لەناکاو گرێک لەو

ژووره بەر بێت بە ترسێکەوە وتی..
-با بچینە بالکۆنەکە .. بەر هەتاوەکەم پێخۆشترە، ئەلبووم و دەفتەرەکانیش بێنە.

دوو کورسیو مێزێکی خڕو چکۆلانەی پلاستیک لەو ناوەڕاستە بوو، هەردووکیان وەک دوو کەسی ئازیزمردە، پشت شکاو و ئەژنۆ لەرزیو، هەستانە سەرپێ، بۆ تاوێک بەهرام قورسایی خۆی خستە سەر هەردوو دەستی کە بەسەر پەرژینی بالکۆنەدا خۆی نەوی کرد، کەمەکێ وەستاو لە منارەکەی ڕوانی، ئاوڕێکی لە شادی دایەوەو لاو و نیو تەماشای کرد وەک ئەوەی بە چاو پێی بڵێت:
-ئەو منارەیە ئەو هەموو شەڕو هەرایە دەهێنێت؟
کەچی ئەم پرسیارەی لە دڵدا شاردەوەو بە حەسرەتێکەوە درکاندی..
-کە لە ژوورەوەش دانیشتبووین تۆ لە من بێئاگا بووی، چاوت لە منارەکە نەدەتروکاند، ئەم قسەیە چەندە ڕاستە کە تۆ وتووتە هەر بە بێوەژنی دەمێنمەوەو شوو بەم منارەیە دەکەم؟
-ئەوەندە ئەم پرسیارەم لێکراوە کە خۆم لێم بووە بەڕاست .. تۆ خۆت چۆن چۆنی تێیدەگەی؟
-من لەوە تێدەگەم کە تۆ وەک هونەرمەندێک عاشقی هەموو شتێکی عەنتیکەیت، هەر شتێک هونەرو مێژوو بەیەکەوە گرێ بدات ..
کەمەکێ خامۆش بوو ..پاشان بە مەزاقێکەوە تێهەڵچۆوە..

-هەر شتێک کە زۆر کۆنو دێرین بێت!
ئەم بە هەستی ژنانەی خۆی گومانێکی لەو ڕازە کرد کە بەهرام درکاندی کە پتر لە توانج و پلارێک دەچوو، هەر بۆیە قسەکەی قۆستەوەو بە تەوسەوە پێی وت..
-تا ئەو شوێنەی کە حەزم کردووە شوو بە پێشمەرگەیەکی دێرین بکەم .. پیرەپیاوێک کە لە شۆڕشی ئەیلوولەوە جەنگاوەر بووەو بە کۆنترین تفەنگی ڕەشکەو حوسکە شەڕی کردووە .. وانییە؟
بە تەریقییەوە وەک ئەوەی بە خۆیدا بشکێتەوەو نەوێرێت سەیری ناو چاوەکانی بکات..
-نا .. من وا ناڵێم .. من قسەی کەسو کارو خەڵکێکی نزیک بە هەردووکمان دەگێڕمەوە.
-من زۆر لەوە ماندووترم .. باکم بەوە بێت چیم پێدەوترێت.

وەک کەسێک بەدوای شتێکی ونبوودا بگەڕێت بە چواردەوری خۆیدا دەخولایەوەو پاشان بە ئەدەبەوە تێکەڵ بە شەرمێکەوە داوای پێکێک شەرابی کرد گەر هەبێت، ئەویش خانمانەو بێ خۆ تێکدانو شڵەژان وەڵامی دایەوە..
-بمبوورە .. من خۆم هەمیشە مەستم .. لەوە مەستتر کە پێویستم بەوە بێت کحوول بچێتە خوێنمەوە!
-ئەی مەرحووم دەیخواردەوە؟

-دەیخواردەوە ..
-داواکەم ڕەوا نەبوو بەلاتەوە؟
-بۆ ڕەوا نییە؟ من وەڵامم دایەوە .. گەر دەتەوێ بشزانیت دەخۆمەوە یان نا .. هیچ لەو خەمە ناگۆڕێت کە منو تۆی لێرە کۆکردۆتەوە .. وابزانم تۆش ئەوە بە حەرام نازانیت ؟
-هەرگیز ..
-تۆ کە ئەمڕۆ هاتیت .. پتر بە نیازی چی بوویت؟
-وابزانم بەر لەم دیدارە پێیان وتوویت کە من لەبەر تۆ هاتوومەتەوە، دەمەوێت لەم زەلکاوە دەرتبێنمو بڕۆین ..!
-تۆ بیرت چووە کە بەسەر لاشەو ڕۆحێکی مردوودا هاتیتەوە، بێجگە لەوەش کە من ئەم شەڕەی خۆم لەلا بووە بە شەرەفێکو ئەو زەلکاوەی تۆش باسی دەکەیت کۆنە هاوڕێکانی تۆ دروستیان کردووە کە بە کامی دڵ ئێستاکە مەلەی تێدا دەکەن، ناشمەوێت لەم شەڕە پاشەکشێ بکەم.
-تا کەی بەتەنها ئاواهی بەردەوام دەبیت؟
-نازانم .. پرسیارێکی واشم لە خۆم نەکردووە..!
-واتا داواکەم ڕەت دەکەیتەوە؟
-خاڵۆزا .. تۆ زۆر درەنگ هاتیتەوە .. ڕەنگە تۆش بتەوێت شەرەفی بنەماڵەکە بپارێزیت؟
-ڕاستی .. هەموو ئەوانەی تەماعیان لەوەیە ئەم خانووانە تێکبدەن،

گوناهی ملنەدانو هاندانی خەڵکەکەی دەخەنە ئەستۆی تۆ، دەشزانیت پیرە دایکو باوکو خزمان نائومێد بوونو مێردی خوشکەکانتو هەتا من لە دەرەوە .. هەرهەمووومان شەرمەزاری دۆستو دوژمن بووین، هەموو ژنو پیاوەکانی تایەفەکە .. ڕەنگە براکانت دوای نائومێدبوونی من بگەڕێنەوە تا بەخۆشی بێت یان زۆردارەکی وا بکەن لە کەلی شەیتان بێیتە خوارێ ..

-ئەوان دەیانەوێ ئەم منارەیەش بڕووخێنن .. نیوەی گەڕەکەکە لە ژێر هەڕەشەو گوڕەشە چۆلی کرد یان لە برساناو بە تەماعی پارەی زۆر فریویان دان .. من نازانم چوومەتە سەر کەلی شەیتان یان رەحمان .. بەڵام دەزانم کە هەقمە لەمماڵە بمێنمەوە، پێم ئەستەمە کۆنترین گەڕەکی ئەم شارە بکەن بە وێرانە .. منارەیەک کە ئەم شارەی پێ دەناسرێتەوە.

-بەتەنیا .. بێ پشتو پەنا؟

-لەو وڵاتەی تۆ تیایدا دەژیت ئاخۆ چەندەها ئافرەتی تەنیای تێدایەو چەندەها بەتەنیا لە کۆنەوە تا ئێستا لەسەر بابەتی بچووکو گەورە ملی نەداوە تاوەکو کوژراوە؟

-لەوە ناچێت هیچ سۆزێکت بۆ من مابێت .. لە میوانێکی ئێسک گران دەچم!

شادی سەری هەڵبڕیو پڕ بە هەردوو چاوان لە منارەی هەڵچوو بە

ئاسماندا ورد دەبۆوە. شەبەنگی هەتاوێک دەڕژایە سەر ڕووخساری تەڕی، چ زوو فرمێسکەکان داباریﻥ ..
-من لە دۆڕانی خۆمەوە شووم بەو پیاوە کرد .. کە ڕۆیشتیت زۆر چاوەڕێم کرد .. ساڵانێکی زۆر .. تۆ بە نامەیەکیش منت بەسەر نەکردەوە!
وەک کەسێک کە تاوانبار بێتو بیەوێت زوو گوناهێک لە خۆی بسڕێتەوە وتی..
-ئاخر من نەمدەتوانیو نامەم بۆ کەس نەناردووە .. تا ڕاپەڕین ئەمەیان مەحاڵ بوو.
-ناردنی هەواڵێک، لەتە کاغەزێک مەحاڵ نەبوو، خەڵکێک هەبوو کە خۆی دەگەیاندە ئێران تا چاوی بە کەسو کاری خۆی بکەوێ.
-بۆ شووت بە گەنجێک نەکرد .. بۆ نەوەستایت؟
-من تەواو لە تۆ نائومێد بووم .. هەر گەنجێکی وەک تۆش کە لێم دەهاتە پێش سوێندی دەدام کە ئاخۆ حەزم لە کەس نەکردووە.. کەس ماچی نەکرددوم..نامەی دڵداریم بۆ هەتیوێک نووسیوە ..گەر پیاوی ئەم وڵاتە بە حەزلێکردن قەڵس بن، خۆ نەدەکرا بڵێم قوربان من کچ نیمو ژنم، ئەو پیاوە منی لە ڕسواییو سەرشۆڕیی قورتار کرد، خۆت ئەم خێڵی مەیموونە ناناسیت؟ شێتیان کردم کە چاوەڕێی چی دەکەمو وا خەریکە قەیرە دەبم .. ڕۆژ نەبوو ئەو ترسەم نەخەنە بەر دڵ .. ئەفەندی .. تۆ دەزانیت کچ بوونو مانگرتن لە شووکردن لێرە

چ مانایەکی هەیە؟ ئەو پیاوە منی هەڵگرتەوە .. تێدەگەی ئەوەیان مانای چییە؟

-منیش وەک هێستر خۆم دەڕەتاند تا شتێک پێکەوە بنێمو بێمەوەو تۆ ببەم، من لە بەهەشت نەبووم ..

-تۆ ڕاست ناکەی ..ماڵی خۆتان تا دوو ساڵ دوای سەفەرەکەشت ماتەمی دایگرتبوونو لە تازیەدار دەچوون، لەناکاو دوای ئەو دوو ساڵە گەشانەوەو کەیفخۆش بوون .. گەرچی لە منو کەسو کاری هەردوو لامانیان دەشاردەوە .. بەڵام ئەوەیان ئاسان بوو تێبگەم کە تۆ ساغیتو دیارە گومانت لەوە نییە کە منیش حەزم کردووە لە مەرگ بە دوور بیت ..

-کەواتە بۆ لێرەم؟ بۆ هاتوومەتەوە؟ ئەی گەر بیسەلمێنم کە هێشتا ئەو کەسەی جارانم؟

-بەڵام من ئەو کەسەی جاران نەماوم .. وا مەزانە شتێک کە ناوی سۆزە یان خۆشەویستی لە مندا مردووە .. گرفتەکە لەوەدایە کە من خۆم مردووم .. زەحمەتە لە من تێبگەی کە من تا ماوم کەوتمە ناو گومانێکەوە کە نەک تۆ .. بەڵکو خودای خۆشەویستیش ناتوانێت دەرمبێنێت ..

-دیسانەوە .. بۆ دووەمین جار تۆ من دەر دەکەی!

-تۆ ئەوەت لەیاد چووە کە من ئەم شەڕەی خۆم لەلا پیرۆز بووەو تاکە شتێکە وام لێدەکات هەست بکەم زیندووم ..

-خەیاڵت خاوە گەر وابزانیت بەرگەیان دەگری، هەریەکەیان ئیمپڕاتۆرێکە بۆ خۆی..
-دەزانم .. ئەو سمێڵ بابڕو پارەدارو سیاسەتبازو قاچاغچیو ژنبازو قوماربازی هەمەچیزەن .. بەڵام حەزدەکەم خۆم تاقی بکەمەوە، ئەوە دوو ساڵە هەوڵدەدەن ئەم گەڕەکە لە منو ئەو چەند ماڵە کەمەی ماوینەتەوە.. پاک بکەنەوە ..بەس تەواو پێمان داکوتیوە .. هیچ بەلامەوە گرنگ نەماوە چارەنووسم لەگەڵ ئەو دەعبایانە دەگات بە کوێ!
-تۆ ئێستا دەنگت دلێرەو زۆرزان بووی.
-هەقە پێت خۆش بێت کە کچە سادەو گێلو لاوازەکەی جاران نیم .. تۆ نازانی ئەو دۆڕانو خەمەی پاش ئەتک کردنمو کۆچی ناوادەت فێری چی کردم ..
-بەڵام من ئەتکم نەکردیت .. هەق نییە وا بە سەرسەریم تێبگەی ..
-گەر دەنگ هەڵبڕیتو خۆت تووڕە بکەی .. قسەیەکمان نامێنێ ..
-تۆ نیازتە تاکەی پاسەوانی ئەم منارەیە بیت کە زۆری نەماوە بیڕووخێنن.
-پێم خۆشە کە منت کرد بە پاسەوانی منارە، چونکە پێشتر کەس وای پێنەوتووم، کەواتە بێ زەوقیو بێ ڕەوشتییە وەک پاسەوان بە ئەرکی خۆم هەڵنەستم، لە پێناو پاراستنی ئەم منارەیە نامەیەکم بۆ سەرۆک نووسی کە تیایدا داوام کردبوو کە هەقە وازم لێ بێنن

لێرە بمێنمەوەو ئەم خانووە کۆنانەو منارەکە مێژووی ئێمەنو گوناهە بکرێن بە بازاڕو دوکان، گوایە نامەکەم غەمگینی کردووە .. ئەمەیان درۆ بێت یان ڕاست گرنگ نییە، ئەوەندە باسی خۆم نەکردبوو، تەنها ئەوەشم بیرهێنابۆوە کە من ژنی پیاوێک بووم کە یەکەمین مێردمندالٌ بووە لەناو شۆڕشداو قەت سەنگەریشی چۆل نەکردووە، بەوە باش بوو منارەکە ناگوێزرێتەوە، ئەگینا ئەو کۆنە پالٌەوانانەی دوێنێ کە قاچاغچی ئەمڕۆکەن وەک هەر ئاسن و پاسنێک و داروبەردێک.. یان هەر شتێکی گرانبەهای ئەم وڵاتە ئاودیویان دەکرد!

-بیستم سەردانی کردوویت تا دلٌنیات بکاتەوە؟

-نا راست نییە ..توانیم تەلیفۆن بکەم و پێموت کە ڕووخانی منارەکە وا بە ئاسانی درۆیەکی گەورەیەو ئەو گەلۆرانە دەیانەوێت بیکەن بە سوپەرمارکێتو هۆلٌو مۆلٌ ...

-چییە .. شانازی پێوە دەکەی؟

-هەرگیز .. تەنها شانازیم ئەوەیە پاسەوانی منارەکە بکەمو ئەم شەڕو گرەوە ببەمەوە .. گەر دۆڕاشم شەرەفی بنەمالٌە خۆش ..

-سەیرە .. لەم مالٌەدا دەگەڕێم بۆ شتێک کە بۆنی منی پێوە بێ .. یادگارییەک .. هەر شتێک کە بەلٌگە بێت من لای تۆ نەمرد بووم .. نایدۆزمەوە، کەچی ڕەسمەکەی مەرحوومت لانەبردووە .. هەتا بڕنەو و گۆچانو خەنجەرێکی دەبان بە دیوارەکەوە هەلٌواسراون ..!

-وانییە زۆر شتی تۆم لەلا ماوە .. بەلٌام وەک نهێنی «بێ-بێ-بوونم»

تەقەت پاراستوومن .. نهێنییەک کە پێویست ناکات کەس بیزانێت ..
-وەکو چی؟
-ئەلبوومی پەپوولە کوژراوەکانت .. نامەکانت .. هەتا شووشەی ئەو بۆنەی بۆت هێنام‌و تەنها سێ جار بە خۆمدا پژاندم‌و تۆ سەفەرت کردو ئەوەندە مایەوە لام عەترەکەی بوو بەهەڵم، بەڵام قەت دڵم نەهات شووشەکەی فڕێ بدەم، توێکڵی ئەو فستقانەش کە لە ژێر کەپرەکەدا دەتشکاندو کاکڵەکانیت دەدامێ‌و دەتوت تووتی بەخێو دەکەم، هەتا ئەو لبادەشم هەڵگرتووە کە خوێنی کچێنی منی بەسەردا ڕژا لە ژێر کەپرەکەدا .. چووزانم .. زۆر شتی تر کە هەردووکمان بیرمان چۆتەوە ..!
-هەموو ئەو شتانەت هەڵگرتووە کە بۆنی خەم‌و خوێنی لێدێ!
-ئەوەیان چارەنووسی من‌و تۆ بوو ..
-هی من ئەلبوومی پەپوولەی کوژراو و لبادی خوێناوی‌و شووشەی بەتاڵی عەترو توێکڵە فستق .. کەچی هی مەرحووم بڕنەو و گۆچان‌و خەنجەر ..!
-بۆ من بڕنەو و گۆچان‌و خەنجەرەکەی جگە لە توحفەو شتی کۆن کە وەک خۆت درکاندت ئەو شتە عەنتیکانەن کە حەزیان پێدەکەم هیچ مانایەکی تریان نییە!
-کەچی بۆ من مانای لاوازی‌و خیانەتە لە بەرامبەر هێزی پیاوەتی‌و جوامێری مەرحووم.. وانییە؟ تۆ هەتا نەتهێشت ماڵەکەت بە تێری

ببینم ..
-وانییە .. پاشان دەبێ ماڵی بێوەژنێکی تەنیا چی تێدابێ؟

هەردووکیان پێکەوە هەستیان کرد کە ئەو گفتوگۆیە بێهودەیەو لە ئاکامدا دەگات بە بنبەست، لە پشت هەر ڕستەیەکەوە کە دەیدرکێنن ڕازونیازێکی نەوتراو هەیە کە هیچ کامیان ناوێرن خۆیان لە قەرەی بدەن، نهێنییەکی گەورە کە لەو چەند دڵۆپە خوێنەی سەر لبادەکە گەورەترە کە هەنووکە ئاسەواریشی نەماوە، تەنها دڵۆپێکەو کەچی لە خەیاڵو ناو خەونەکاندا، دوای زەمانێک، دەبێ بە زەریاو خۆیان تێیدا دەخنکێن، ئەم هەر بە سەلیقە هەستی کرد کە بەهرام حەزدەکات نهێنیو ڕازێکی دیکە بدرکێنێ، چ ڕاست بێ یان درۆ، گومانێکەو ڕووەو دڵ ڕێ خۆش بکات، هیچ نەبێ وای بسەلمێنێ کە ڕاستە هەزار میل لە نیشتمان دوور بووە، کەچی ئاگاداری هەموو کەینو بەینێکی ناو وڵاتە، دەیزانی کە بەهرام بۆ شەڕێکی دۆڕاو گەڕاوەتەوەو نایەوێ هەموو چەکە دیارو نادیارەکانی دەنێو گۆڕەپانی جەنگەکە فڕێ بداتو ملکەچی قاندڕەکەی بێ، دەیزانی پەڵپو بیانوو .. گوناهبارکردن .. قسە هەڵبەستن لەم ساتەوەختەدا زۆر ئاسانەو گەمەیەکە بۆ دەرچوون لە گێژەنێک کە تێیکەوتووە، زۆریش زەحمەت بوو بۆ هەردووکیان لە پاش سەفەرو دابڕانی ساڵانێکو مەرگی کەسێکدا کە ڕەنگە هێشتا هەناسەکانی لە کونو کەلەبەری ماڵەکەدا مابنەوە، جێدەستی،

یادگارەکانی، کەلو پەلو تفاقەکانی، زۆر گرانتر بوو بگەڕێنەوە بۆ ڕابردوویەک کە مەحاڵ بوو بەم درەنگ وەختە چرکەو خولەکو سەعاتو ڕۆژو مانگو ساڵەکانی کە دەیەها شتی جوانی لەگەڵ خۆیدا بردو کوشت.. وەها ئاسان زیندوو بکرێنەوە، بۆ سەردەمێک کە هەموو شتێکی خستە ژێر تەپو تۆز، تازە مەحاڵە بێ ترسو دڕۆو دوودڵیو ڕقو گومان باس لەو ڕابردووە بکرێ، لە ئایندەیەک کە لە کۆشی غەیبدایە، لەناکاو بە قەهرێکەوە داوای لە بەهرام کرد..

-شەرمی ناوێ .. گەر شتێک لەسەر ئەو پیاوە دەزانی، چەندە ناشیرین بێ .. بیڵێ .. دواجار هەرچی بێ .. لەو بارە ناهەموارەی من ناگۆڕێ ..

-نا .. وا جوانترە خراپ لەسەر مردووەکانمان قسە نەکەین!

-خەندەو ئەم قسەیەت کەمتر نییە لە چیرۆکێکی ناشیرین سەبارەت بە هۆمەر .. هەڵیبگرە بۆ خۆت ..

-گوناهت دەگات .. من هیچم نەوتووە.

-تۆ هەموو شتێکت وت..من و تۆ لە یەکدی تێدەگەین .. پاشان کە تۆ دەتزانی من شوو بە پیاوێکی ناچیزە دەکەم .. چۆن بوو خۆشەویستیو سۆز یان پەرۆشی خزمایەتی وای نەکرد ڕێگام لێ بگریت .. چ مانایەکی هەیە ئێستاکە دادگاییم بکەی؟

-درەنگ زانیم .. وێران بوومو لەوەدابووم خۆم بخنکێنم!

-چەندە عاشقیت!

-لەوە ماندووترم بە گاڵتەو لاقرتێوە بمدوێنی .. ئەی تۆ بۆ زەحمەتت نەکێشاو لەگەڵ خزمو خوێش بێیتە فڕۆکەخانە؟
-منیش لەوە ماندووتربووم بە چەپکێک گوڵەوەو بە درۆ بێمو پێشوازیت لێبکەم!

ئیتر تەواو .. بەهرام لەوە پتر نەیدەتوانی بەسەر پێوە بوەستێت، هەستی کرد سەری گێژ دەخواتو دڵی خاو دەبێتەوە، گرێک لە هەناویدا هێدی هێدی کڵپە دەستێنێ، زانی بەو قسانەو خەندە خوارەی بە تەواوی شادی غەمگین کردو دڵنیا بوو لەوەی کە لەوە زیاتر تەمای قسەی نییە، خۆی هاویشتە ناو کورسییەکەو سەری خستە ناو هەردوو چنگی، هیچ شتێک لەوە قورستر نییە هەر هەموو نهێنییەکانی ناو سەفەرەکەو هەڵەتەبوونی خۆی بگێڕێتەوە، هەرگیز نەدەکرا .. هەرگیز، تازە مەحاڵ بوو بسرەوێت، هەرچی ڕوویدا مەحاڵتر بوو لەوەی مایەی بەخشندەیی بێ، لەناوئاخنی چیرۆکێکدا یان فیلمێکدا دیمەنێکی وا ترسناکو کوشندەی دیبوو، بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن چۆنی وا بکات خانمی دڵڕەنجاو ئەم ماڵە بەجێبێڵێت، لەوە زەحمەتتر ئەوەبوو کە نەیدەزانی گەر لەم دیدارە نائومێد بێت.. چۆنو کەی ئەم شوێنە بەجێبێڵێتو .. دوا ڕستەی چی بێتو ئاخۆ چۆنو کەی بۆ جارێکی دیکە داوای دیدارێکی لێبکاتەوە، لەکوێوە دەست پێبکاتەوە؟ ئەی بۆ هەر ئێستاکە بەبێ ماڵئاوایی نەڕوات؟ چاوەڕێی چی دەکات؟ کۆی

دیدارەکە پڕ بوو لە گومانو پرسیارو دڵشکانو دڵکرمێ بوون .. مەراقو هەراسانکردنو مەزاقو .. زیزبوون، بێهیوا لەوەی وەڵامێکی بۆ پرسیارە مردووەکەی دەست بکەوێت..

-کەواتە تۆ ئامادە نیت لەگەڵما بێیت؟

چەند جارێک سەیری سەعاتەکەی کرد بێئەوەی بزانێت کاتژمێر چەندە، هەستی دەکرد کە خانمی پاسەوان، پاسەوانی منارەکە، تەواو دابڕاوەو لەناو خەیاڵێکی دیکەدایە کە لێوانلێوە لە خەمو دڵەراوکێو تەنیایی، بە هەموو بوونیو رۆحی ژنانەو عەشقێکەوە لە منارەکە دەڕوانێت کە لە ژێر هەتاوێکی شینباودا قیتو قۆز بەناو ئاسماندا هەڵکشاوەو خۆرەکەش بە بەری خۆرئاوادا بووەتە کڵاوی سەری، پتر لە نیگارێک دەچوو کە لە خەونی خۆیدا ڕەسمی کردبێت، چەندەها بازنەی پڕشنگی ڕەنگاو ڕەنگ نواڵەی دەوری ترۆپکی بوون، هەتا خشتە خووراو و کۆنو داڕزیوەکانیش لەو خشتە تازەو بریقەدارانە دەچوون کە هەر ئێستا لەناو کوورەیەکەوە دەرهاتبن.

بەهرام بە خەمێکەوە لە منارەکەی دەڕوانی وەک ئەوەی قاندڕو دوژمنی باوک کوشتەی بێت، بە قەهری دۆڕانێکی گەورەوە دەنگی هەڵبڕیو تێ هەڵچۆوە..

-ئەمەیان درۆیەکی گەورەیە کە ئەم منارەیە پاشماوەی دێرینی باو و باپیران بێت، قابیلە بورجی «ئیڤڵ» بێت؟

-گەر واش نەبێ، هەتا گەر تەمەنی تەنها سەدەیەک بێ، کە منو تۆ لەدایک بووین ئەم منارەیە هەر هەبووە .. سەیرە تۆ وا قسە بکەیت !..

-منیش پێم سەیرە کە ئەو هەموو فەزاحەتەی لەسەر دوا پیشانگات نووسرا کە هەر هەموو رەخنەگرەکان باسیان لە مەیلی «فالووسی» تۆ کردبوو کە گوایە تابلۆکانت پڕ کردووە لە منارەی قیتو قۆزو ڕەپ تا ناو کۆشو باوەشی هەورەکان، لە ئینتەرنێت هەر هەموو تابلۆکانتم بینی کە زۆریان لە شێوەی پیاوی ڕووت دەردەکەوتن ..

-بەقەد ئەوەش لە شێوەی ئافرەتی کەڵەگەتو قژ درێژو نیمچە ڕووت دەرمخستوون کە چەندەها پیاوی بەربەری بە تەورەوە گەمارۆی ژنە-منارەکان دەدەن بەو نیازەی بیبڕنەوە .. ئەوە ڕەخنەگرانی هاوتووخمی تۆن کە دەیانەوێت لە مندا ژنێکی فالووسیو چووکپەرست ببینن، ئەوە چاوی ئەوانە و پەیوەندی بە هونەرەکەی منەوە نییە، لە سەدسالّی ڕابردوودا «تەلارسازی فالووسی» قوتابخانەیەکی میلليو هەم پیشەگەرانەی لێدروست بووە، کە پڕبووە لە مەزاقو مەیلێکی شێتانە کە هەرچی درێژو قیت بوو شتێکە نزیک لە چووکی ڕەپی پیاو، ئەمەیان بۆ منارەکانی مزگەوتو گومەزەکانیش مەمک بن بەڕاست دەگەڕێت، سەنعەتەکە وەها سووکو ڕەزیل بووە بەناوی شیکاری دەروونییەوە کە ئەگەر ئافرەتێک دەست بگرێت بە سۆندەیەکەوە بەو نیازەی باخچەکەی خۆیان ئاو بدات.. ئەوە بەغالەت بردنە بە پیاو،

چونکە ژنەکە ناتوانێت بە پێوە میز بکات، بۆیە سۆندەی بەدەستەوە گرتووەو ئاوڕشێنی باخەکەو حەوشەکە دەکات. ئەو شیکارانەی بەناوی ڕەخنەوە نووسران من نابەزێنن، من هونەرێکم بووەو ڕێزم گرتووەو نەمویستووە بترسم، گەرچی دەمزانی وەک بێوەژنێکی تامەزرۆو شێتی پیاو دەمخوێننەوە، ئەوەی من کردم حەزێک بوو بۆ داهێنانی شتێک دوور لە ئامانجێکی دیاریکراو، من تەنها خەمم بەرجەستەکردنی جوانی بوو .. جوانییەک کە خۆشنوودی لەنێو دڵەکان بەرپا بکات .. تێدەگەم لەتۆش کە وەک نێرینەیەکی بنەماڵەکە ..ئەوەی بوو تۆی هارتر کردبێت ..!

-نەدەکرا لە دە لاوە خۆت لەم شەڕە هەڵنەقورتێنی؟

-نا .. نەدەکرا .. هەتا ئەو پیشانگایەم تۆمارێکی خۆمو منارەکەم بوو لە ترسی نەمانو فەوتان.

-لەبەرچی ناتەوێ بزانیت من خەمخۆرتم .. بۆچی ئەو هەموو سۆزەی منت بەلاوە هیچ نییە؟

-بیرم نەبوو بڵێم دیارییەکانت جوان بوون .. دەست خۆش، بەڵام بێ درۆ خۆشیو سۆزێکی عاشقانە لە ئێستادا بۆ من بووەتە شتێک لە ڕابردوو، خەونێکی ئەوەندە خۆش بوو کە هەموو تەمەن بەتەمای بووم، وەک بووکێک بەر لە یەکەم شەوی چوونە پەردەوە خۆم بۆ دەڕازاندەوە، کەچی دەمێکە .. ئۆهۆو .. ساڵانێکە هەوەسی چوونە بەر ئاوێنەشم نەماوە، هەموو شتێک لە مندا مرد .. کوژرا .. خەونو

خەیاڵو ئارەزوو .. هەتا بەر لەوەی شوو بەو کابرایەش بکەم، تۆ وەک پیاوێک، لە دونیاو ژن تێگەیشتوو، دەتوانی ڕێزی ئەو خەمو دەردەم بگری؟ ناخۆشترین شت لە دونیادا ئەوەیە کە پاڵەوانی هەقایەتێکی عیشقەکەت خۆی بتکوژێو کەچی دوای ساڵانێک لە دابڕان بێتەوەو لە دەرگای دڵت بداو بڵێ: دەی هەر ئێستا زیندوو بەرەوە .. زیندووبەرەوە، بێئەوەی ئەوەندە جوامێر بێو ئەو گۆڕە ببینێ کە تۆ تێیدا نێژراوی، ئەوکاتەیە کە نە دڵ ماوەو نە کلیلێک بۆ ئەو دەرگایەی بەسەر وێرانەدا دەکرێتەوە.

-خەمەکە بە تەنها حەزو ئەوین نییە، ڕابردوو یان داهاتووی منو تۆش نییە، تۆش تەنها خۆت نیت دابڕاو لە دونیا، هەموو بنەماڵەکە .. لە منەوە بیگرە تا براکانتو هەر هەموو کەسو کار بەدەست ئەم جەنگەی تۆوە ماندوون، بیرت نەچێ شەرەفو ئابڕووت هی خۆت نییە، چارەنووسی ئەوان بە خۆشیو ناخۆشی تۆوە بەندە .. بۆ تۆش ئاسانە لەوە تێبگەیت!

-تا ئێستا هێزێکی گەورە لە خۆمدا شک دەبەم ئەو جەنگە نەمترسێنێ، پێم سەیرە دوای ئەو هەمووساڵەی مانەوەت لە دەرەوە باسی شەرەفو نامووسی بنەماڵە دەکەی کە تۆ خۆت لە ساتەوەختێکی کورتدا وەک پەڕەی گوڵ هەڵتپچڕیو پێت لێنا، تۆش وەک پیاوێکی نامووسپەرست خەفەت بۆ تەنیایی بێوەژنێک دەخۆی کە ڕەنگە ئابڕووی بنەماڵەکەی

بتكێنیْ؟
-قەت لە خەیاڵی ئەوەدا نەبووم لەكەدارت بكەم .. هەرگیز، چارەنووسێك وەك تاعوونی ڕەش بە هەزارەها گەنجی وەك منی بە كوشتن دا .. شەڕێكی هەشت ساڵە كە وای كرد بە هەزارەها گەنج لە ترسی مەرگ قەلفڕی لێبكەن .. هەر من نەبووم بە تەنیا ..
-تەواوە .. دەبوو ئێوە قەلفڕی لێبكەنو كچەكانو خوشكەكانو دایكەكانو دەستگیرانەكانو دڵدارەكانتان لە بەرامبەر تارماییو ترسو دێو و عەزازیلی زەمانەدا بەتەنیا بجەنگن، هیچ سەیر نییە .. لەوەتەی پیاو هەیە لەسەردەمی ئەشكەوتو چاخی بەردینەوە سەرگەرمی جەنگ بووە یان ڕاوكردن، لەوەتەی ژنیش هەیە سەر بە هەشو چاوەڕێو دەست بە دوعاوە نزاو نوشتەی دونیا دەكات كوڕو براو مێردو نێرینەكانی تیرەو هۆزو بنەماڵەكەی بە سەلامەتی بگەڕێنەوە، پیاوە ئازاو ترسنۆكەكان ئاگری شەڕەكان جۆش دەدەنو ژنەكانیش خۆیان لە خوم و هەش دەنێنو ڕەش دەپۆشن، چ چارەنووسێكی ڕەشو ناشیرینە، بۆ من تاكە لەزەتێك ئەوەیە بەرامبەر ئەو چەكبەدەستو ڕاوچیو جەنگاوەرە دێرینانە بجەنگم كە ئێستا بوونەتە قۆنتەراتچیو قومارچی، كە قومار لەسەر دۆڕانی هەموو تەمەنو خەونو جوانیمان دەكەن .. نەك بردنەوەی هیچ، كەللەپوتو نەوسنو چڵێس كە بۆ من پتر لەو گایە ئیسپانیانە دەچن كە چاوسوورنو پەڕۆیەكی سوور تا ئەوپەڕی دونیایان دەباتو شەڕە شۆق لەگەڵ دارو بەردو دونیادا

دەکەن، تۆ دەزانی من چاوەڕێم دەکرد لەجیاتی ئەو هەموو داواو فەرمانو ئامۆژگاریو مەکەو بڤەیەت .. بە منت بوتبایە لەگەڵتامو ئەم شەڕە ڕەوایە .. نەک پەشیمانم بکەیتەوە، من تێناگەم دوای ڕاپەڕین ئەو هەموو مارکسیو چەپخوازو نەتەوەپەرستو ئەی ڕەقیب بێژو چوارپارچە پەرستە چی لێهات؟ بۆچی هەر هەمووان تووکیان وا نەرم بووە؟ زۆرجاران سوپاسی ڕاپەڕین دەکەم لەبەر یەک شت کە ڕەنگە نەیزانی.. ئەویش لەبەرئەوەی بۆ من ساغ بۆوە کە مەعدەنی زۆرێک لە پیاوەکانی ئەم وڵاتە..مەعدەنێکی خراپە، بە ژمارەیەکی زۆر.. بە شۆڕشگێڕەکانیشییەوە لە کانزایەکی دەگمەنەوە نەهاتووە، زۆر کەمن ئەوانەی شەرم لە خۆیانو خەڵکی بکەن، عەمبارەپۆ دەرچوون، تۆ چەند جارە باسی شەرەفو ئابڕووم لەگەڵدا دەکەی، پێمناڵێیت شەرەفو ناموسی ئەو پیاوانەی منو تۆ دەیانناسین کە خەڵکو خاکیان بەیەکەوە فرۆشت لەکوێدایە؟ ئەوانەی پەنجەیان لە خوێنی ڕژاوی براکانی خۆیان وەردەدا چۆن زات دەکەن باس لە شەرەفی من بکەن .. ئەوانە کێنو چین؟ بۆ من مردووترن لە داهۆڵە داچەقیوەکانی ناو کێڵگەکان، تۆ دەزانی من لەبەرچی نامەوێ شوو بکەمەوە .. نەک بە تۆ .. بەڵکو بە هیچ پیاوێک، چونکە پیاوبوون تەنها کەڵەکەبوونی سەرمایەیەو توانای پەڕینو زەڕینە، لەسەر ئەم عەقڵو خووە بم نایکەم، دەکرێ بە نەخۆشم بزانیت .. بەڵام من تەڵاقێکی ڕۆحیم لەگەڵ هاوتوخمەکەی تۆدا هەیە، تۆ چاک دەمناسی

.. ئەوساش کە منداڵکار بووم .. ئەوەی وای لێکردم تۆم خۆش بووێت بیرو باوەڕو خەیاڵەکانت بوو، ئەو ڕۆژگارەی منداڵێکی هەتیوت دەبینی، بێوەژنێکی ڕووتو ڕەجاڵ، پیرەمێردێکی سواڵکەر .. هەر لانەوازو بێبەرگو نانێکت دەبینی، بە قەهرەوە دەهاتیتەوە لامو کوفری زەوی ئاسمانت دەکرد، لە من تووڕە دەبوویتو دەتوت واز لە ڕەسمی باخچەو شاخو ڕووبار بێنەو وەرەو ئەم ژنو پیاوە زەبوونانە ڕەسم بکە، گیرفانی خۆت بەتاڵ دەکردو ناو جانتاکەی منیش دەگەڕای، دەتوت: چیت لایە بمدەرێو دەیبەم بۆ ئەو کوڕیژگەی لە بەیانییەوە جووتێک پێڵاوی بۆیاغ نەکردووەو بە دیار سندووقی بۆیاغەکەی خەوەنووچکە دەیباتەوە، ئەو پیرەمێردەت لەیاد ماوە کە هەندێک نیوەڕۆ پێکەوە لە سفرتاسێکدا چێشتمان بۆ دەبرد کە لەبەردەم بانقەکەدا چنگێک نوقڵی لەسەر سینییەکی مسین دانابوو بێەوەی بزانێت لەودیو ئەو دیوارەی ئەم پشتی پێداداوە ملیۆنەها دینار و دۆلار سەفتە کراون، ئێستا هەمان پیرەمێرد لەوێدا نەماوە کە چاوێکی کوێر بوو، بەڵام لەبەردەم زۆر لە بانقو دەزگاو باڵەخانە بڵندەکاندا دەیەها پیرەژنو پیرەمێردی بێ لانە دەبینی، چی لێهات حیکمەتی زۆری ناو نامیلکەی زەردو کتێبە قاچاغەکان؟ سەری زمانو بنی زمانتان پڕۆلیتاریاو ڕەنجدەرانو هەژاران بوو .. هەڵۆی سووری سەر ترۆپکی شاخەکان ..بمبوورە .. ساڵانێکی دیکە وا بڕوات دەبێ بە ڕووناکی نیوەڕۆ بە چرایەکەوە بگەڕێین تاوەکو جوامێرێک بدۆزینەوە کە ڕەوشتی ڕۆژانی

شاخو حیکمەتی ناو کتێبەکانی پێ مابێت، حەیف .. هەزار حەیفو مەخابن، من لە داخی ئەو هەموو پیاوە پووچو پواوانە، ئەو هەموو مەیموونەی لەبەردەم سەردارەکانیاندا سەما دەکەنو بۆن بە پاشەڵی گەورەکانیانەوە دەکەنو کلکە لەقێیان بۆ دەکەن، لە تۆڵەی دۆڕانی سەدەها کچو خوشکو دایکی ڕەشپۆشو هەناسە ساردی ئەم وڵاتە لەزەت لەو شەڕە بچکۆلەیەی خۆم دەکەم، هیچ شتێک نییە جگە لە مەرگ کە ناچارم بکات ئەم ماڵە چۆل بکەم .. ئەوەیان مەحاڵە..!

-ئەوان گرەوەکە دەبەنەوە، من هەمان ڕەوشتو بەهاکانی جارانم ماوە .. خانم .. بەڵام ئەم شەڕەی کە تۆ دەتەوێ لەگەڵتا خۆمی تێفڕێ بدەم و خۆم خوێناوی بکەم .. شەڕکردنە لەگەڵ دێو و درنج .. وەک- دۆن کیخۆتە- مان لێدێت کە شەڕەکانی لەگەڵ پەروانەکانی «ئاشی-با» دا دەکرد ..!

-جارێ من وشەی «خانم» بەجنێو تێدەگەم، پاشان کەس ناچارت ناکات لە بەرامبەر دێو و درنجو پەروانەکانی ئاشی با دا بجەنگین.

-تۆ بۆ وا دڵڕەق خۆتم پیشان دەدەی .. کەی وا بووی؟ کە پیاوەکان ئەوەندە بەتاڵو دۆڕاو بن وەک تۆ دەیڵێیت .. بۆچی دەبێ ئافرەتەکانیش وەها دڵڕەقو شەڕانگێزو کینەفرۆش بن؟

-ئەمەیان هەرگیز ڕاست نییە، ئەوەی کە لە پیاوەکان وەشایەوە دوای ڕاپەڕین، مەحاڵە ژنەکان، بە خانمو ناخانمەوە پەیەی پێ ببەن ..بەتایبەتی شۆڕشگێڕەکان، هەر هەموو دروشمەکان بەتاڵ بوونەوە،

هەر هەموو نەخشەکانتان گۆڕیو ئێمەی ئافرەت هەر ناشزانین لە چ کونو قوژبنێکی ژووره تەقەتەکانو ناو قاسە قایمەکانی ناو کۆشکەکانتاندا دەیشارنەوە، ئەو دونیایەی ئێوە دروستتان کرد بەناوی ئازادییەوە زۆر لەوە ناشیرینترە کە خەیاڵی ئەهریمەنیش بتوانێت ڕەسمی بکات!

–ئاخر گوناهە بە هەمان چاو سەیری منیش دەکەی .. من دەرچووم .. سەری خۆم هەڵگرت، وازم هێناو تۆراوم .. چەندەها جار پەیوەندییان پێوەکردووم.. ملم نەداوە.

–بەسەری باوکی هەردووکمان ئاشتت دەکەنەوە، لە تۆ نێرترو تۆراوتریان ئاشت کردەوە، ئێستا وای لێهاتووە ئەندامە هەرە گەورەو پایەدارەکانو چکۆلەکانی ناو حیزبەکان دەستەو دوعا دەپاڕێنەوە سەرکردەکان لێیان توورەبنو بتۆرێن، چەندە زیزبوونو تڕۆکردنەکە قورسو درێژخایەن بێت، ئەوەندە پتر پلەو پایەو پارەو پۆستی بەخشراو بە بەندەی تۆراو و تڕۆکراو گەورەترو چەورتر دەبێت، لەم چەند ساڵەی دواییدا خۆشترین گەمەو هونەر، هونەرو گەمەی تۆرانو ئاشتبوونەوەو بازبازێنو سەنگەر گواستنەوە بووە، هەر هەموو فڕوفێڵو بەندو باوێک بۆ ئاخوڕێکی پڕ ئالیک بووە .. خوانێکی چەورتر.. لەوەڕگایەکی بە بژوێن..خودی نیشتمانیان کرد بە لەوەڕگا.. دەزانی

من خەفەت بۆ هاوتوخمەکانی خۆم دەخۆم کە ژنی ئەو جۆرە پیاوانەن کە هەمیشە حەزیان لەوەیە لەبەر دەرگاکانیاندا چەندین سمێڵ بابڕ بەناوی پاسەوانو تفەنگچییەوە ڕابگرنو بۆ کوێ بچن بکەونە دوای قوونیان، گەر ئەوەش نەبێ بە هەزاران لە هاوتوخمەکەی تۆ شێتی ئەوەن پیاوی خەڵکی بن، دواجار پیاوێک نییە پیاوی بەردەرگای پیاوێکی دیکە نەبێ ..!

–ئەوەندەش بەستەزمان نین هاوتوخمەکانی تۆ .. بۆیان مەپاڕێوە .. ئەوەتا سێ سێو چوار شوو بەو پیاوانە دەکەن کە تۆ بە داهۆڵو بەتاڵ ناویان دەبەی ..

–ئەوەش هەر گەمەو بەزمی خۆشو تازەو پڕ لەزەتو حەیابەرەی هەندێک لە هاوڕێکانی تۆیە کە ڕۆژگارێک پێکەوە تێکۆشانی ژێرزەمینیتان هەبوو، ئێستاکە شکوور لە تاریکی ژێرزەمینەکانو کونە ئەشکەوتەکان هاتوونەتە دەرێو هەوای ئازادی هەڵدەمژن، ئیتر عەیبە بە فاتمو عەتییەو بەسێو بەگیسیو فەهیمو مەلیحو خەجە خێل رازی ببن، ناکرێ لە ئاهەنگو بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەو ژنانە لەگەڵ خۆیاندا ببەن کە هەتاو و بەفروبارانو ڕەشەباو سەراو و دەراوی دونیا جوانی لێ سەندوون، ناکرێ لە یانەکانو هۆڵەکانی شاییدا پێکەوە لەگەڵ مێردە چەلەنگەکانیان لەسەر هەمان مێز دابنیشن، وا جوانترە ژنەکانیان بەنازو پەریزادەو شەهێنو هەتاو و تریفەو فریشتە

و هەڵاڵە گوڵاڵە ناو بن .. وانییە؟ تۆ گلەیی لە کچەکان دەکەی کە هاورێکانت راویان دەکەن، ئەو پیاوانەی هەتا لە ژێرزەمینەکانو ناو کونە ئەشکەوتەکان بوون، کۆنە ژنەکانیان خانمانی جەربەزەو شێرە ژنی شاخو شۆرش بوون، هەنووکە شار خۆشەو کۆشکو تەلاری تازەو باخچە هەڵواسراوەکانی- بابل- و فیرعەونەکانی دوا ساڵانی سەدەی بیست، لەسەر زەمین، هەر دەبێ بووکو پەریزادەی بەر سێبەرو دەستو پێ ناسک بەسەر چیمەنو فەرشی کاشاندا لەنجە بکەن .. وانییە؟

-ئەنجام .. دەتەوێت بگەیتە کوێو تا کەی لەسەر ئەم ئاوازە دەخوێنیت؟

-ئەمەیان ئاواز نییە .. خوێن بەربوونێکە لە برینێکەوە کە سارێژ نابێو قەت قەتماغە ناگرێ، تۆ حەزت دەکرد کەرو لاڵ بم خاڵۆزا .. دیسانەوە ناکرێ لە نووکەوە بۆت بگێرمەوە چیم دەوێ، کە بنیادەم کەوتە ناو شەرێکەوە .. هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە دەگاتە کوێ، شەرەکە بوار نادات بزانیت چۆن کۆتاییت دێ، شەر ناچارت دەکات کە هەر دەستو پیل بوەشێنیتو نەسرەویت .. تەنها ئەوەندە دەزانم کە ئەگەر ئەو نامەردانە واز لەم گەرەکو منارەیە نەهێنن، تۆ لێرە بیت یان لەودیو زەریاو کێوەکانەوە، هەواڵت پێدەگات کە من لەسەر

منارەکە مانم گرتووە ..!

-ئەوەیان ئەوپەڕی شێتییە، ئومێد دەکەم هەر خەیاڵێکی ناو ئەم گەردەلوول و گێژەنەیە بێت کە تۆ بە حەزی خۆت چوویتەتە ناوییەوە.

-هەرچەندە خەیاڵێکی ڕەش بێت .. بەڵام زوو زوو سەرم لێدەدات ..

-ئاگات لێبێت کەس بە پاڵەوانبازی بۆت حیساب ناکات، دوای مەرگت سەد هەقایەتی ناشیرینو ڕسوابوونت بۆ دەژمێرن ..

-ئێستاش تۆ خۆت وتت کە دەیەها ناو و ناتۆرەیان لێناوم‌و بە زیندوویێتی چاوان چیرۆکی وام بۆ دروست دەکەن کە تەنها لە خەیاڵی بۆگەنی خۆیاندا هەیە ..!

-تۆ کە خۆت لەم ماڵەو بەرامبەر ئەم منارەیە بەند کردووە هەر دەبێ خەیاڵی ڕەش‌و خراپ بێتە ناو دڵو دەروونتەوە .. بڕۆ دەرێ‌و کارێک بدۆزەرەوە ئەگینا وەک شێتی ناو قەفەزەکانت لێدێ ..

-من مامۆستا بووم .. ناچاربووم واز لەوەش بێنم .

-بۆ ناچاربوویت ..؟

-من ناچاربووم واز لە مامۆستایەتی بێنم، چونکە هەرچیم بۆ منداڵەکان دروست دەکرد بێئاگا لە خۆم ڕەسمی پەپوولەی باڵ هەڵوەریو و پەروانەی سووتاوی دەوری شەمعم دەکرد، هێلانەی داڕووخاو کە بەدەم باوە پووش‌و پەڵاشەکانی کاغەزەکانی پڕدەکرد لە چیلکەو هێلکەی شکاو، کۆترو کوکوختی‌و کەوی مردوو دەنێو قەفەزەکاندا یان پێکراو بە ئاسمانەوە، یان دەنووک شکاو و کوێر ئەوەندەی خۆ بە قەفەزەکاندا بدەن، ڕەسمەکانم پڕبوون لە ڕەنگی تاریک .. کەلاوەی پەپوو نشین، ئاسمانێکی پڕ لە قەلەڕەش‌و قاژوو، بێئاگا لە خۆم لە پۆلەکاندا دەمدایە پڕمەی گریان، هەمیشە سۆزێکی گەرم‌و کوژراو قوڵپی گریانی سەردەخست تا بەربینم، هیچ شکۆیەکی مامۆستایانەو حەیایەکی خانمانەم نەمابوو، چونکە جگە لە من کەس نەبوو لە پۆلەکاندا بداتە پڕمەی گریان‌و قوتابییەکانی فرمێسکی بۆ بسڕن، ئەوەندە شەرمیان لەو فرمێسکانەم دەکردو ئەوەندە سکیان پێم دەسووتا، ئەو کچ‌و کوڕانەی هەمیشە هارو بزێو بوون‌و بە سەرسامی‌و ترسەوە لە چاوە سوورەکان‌و لووتی ئاوساوم ڕادەمان‌و هەناسەیان نەدەدا، مامۆستاکان بە مێ‌و نێرەوە بەزەییان بە حاڵمدا دەهاتەوە، ئاخر نەدەکرا ڕازو نیازەکانم .. نهێنی گەورەی خۆم بۆ کەسیان بدرکێنم، تەنها شتێک‌و هۆکارێک نەبوو کە شووم بەو کابرایە کرد،

جگە لە گۆڕنانی ئابڕووی تکاوم، ئەو شووە ئازادی کردم لەبەردەم کەس‌و کاردا وازبێنم‌و مێردەکەم ڕاپی بکەم کە درۆ بکات‌و بڵێ حەزدەکەم کەیبانووی ماڵ بێت، کە نەخۆشییەکەش بڕستی لێ بڕی ناچار بووم بە سستەری ئەو پیاوە، بۆ من زەحمەت بوو وەک ژنێکی ئاوس بە خەمێکی گران چوار- پێنج سەعات لە پۆلەکاندا ڕەسمی بولبولی ناو قەفەزو کەناری دەنووک خوێناوی‌و هێلانەی داڕووخاو بکەم‌و ترس لە چاوی کوڕو کچەکاندا بەدی بکەم، بەر لەوەی شووش بکەم لەوە دەرچووبوو چاوەکانم هەڵبڕم‌و پیاوێک سەرنجم ڕابکێشێ، هیچ هێزو دڵێکی خۆشەویستیم نەمابوو، لەوە چاو شکاوتربووم، تۆ لە مندا خولیاو خەیاڵ‌و حەزێکت کوشت کە مەحاڵ بوو بتوانم لە خۆمدا زیندووی بکەمەوە، هەتا نەمهێشت ئاهەنگی زەماوەند ساز بکەن، وێنەی بووکێنیم بە کراسی سپی‌و تاراوە نییە، وەک کچی خەڵکی چەپکێک گوڵ بەدەستەوە، لەسەر ئەوەش دونیاو کەس‌و کار ڕسوایان کردم، تەنها کەسێک زاوا بوو کە پیرو حەکیمانە وتی بۆ من ئەوەیان مەسەلەیەک نییە، بەردەوامیش ئەوە بۆ من گرنگ بوو کە ئەو پیاوە ڕێزی لە «نەخێر»ەکانم دەگرت، هەمیشە ئەلبوومی نیگارکێشە ناودارەکانی دونیای بۆ دەهێنامەوە، لە پاڵ دەیەها ڕۆمان‌و کۆمەڵە چیرۆک کە دوو باڵی دەدامێ‌و سەفەرم بە دونیادا دەکرد، پاڵەوانەکانی سەر کاغەزەکان بۆ من گەرمترو زیندووتربوون لەو کەسانەی چواردەورم، ڕەسمکردن‌و خوێندنەوە نەبووایە خەم‌و دۆڕان‌و دابڕان لە هەموو دونیا

دەیکوشتم، بۆ من چوونە سەیرانو شاییو پرسە وەک یەک بوون، خۆم لە هەموو بەزمو بۆنەکان دەدزییەوە، چوونە بازاڕ بۆ پێویستییەکی ژنانە ئەرکێکی قورس بوو، دەمزانی ژمارەیەک لە کەسانی دوورو نزیک سووکو چروک دەمبینن، دەمزانی لە دڵی خۆیاندا دەڵێن گەر تەماعی دونیاو چاو بڕینە میراتی ئەو پیاوە نەبێ بۆچی شووی پێکردووە کە لە تەمەنی باوکییەتی، دەستە خوشکەکانم لێم تەکینەوەو تۆران، یان زەمانە هەر یەکەیانی خستە قوژبنێکەوە، زەمەنێکە کە هەر کەسێک وا هەست دەکات بوومەلەرزەیەک لێیداوەو بەتەنیا هەوڵدەدات فریای ڕۆحی خۆی بکەوێو لەو وێرانەیە دووربکەوێتەوە، ئازادی-یش خۆمان خۆش ..

ئەو کابرایە وێنەی ئەو باوکە بوو کە لە هەموو ژیانمدا بۆی دەگەڕامو نەمبوو، باوکێک کە لەسەر سفرەش لەگەڵ ئێمە نانی نەدەخوارد، وەک ئەوەی نانخواردنەکانی ژنو کچەکانی عەیبەیەکی گەورە بێ، گەر لەبەر خاتری میوانێک دانیشتبایە هەرگیز لەسەر ئەو خوانە نەبوو، هەمیشە باوکمان کە تۆ چاک دەیناسی لە شوێنێکی دیکە بوو .. هەتا گەر لە ماڵیش بووایە، بەڵام ئەو شوێنە کوێ بوو، ڕاستەقینە بوو یان خەیاڵی نەمانزانی .. تاوەکو ئێستاش نەمانزانی، براکانیش گێژو وێژ بەدەم هاتو هاوارەوە بەو ماڵەدا دەسووڕانەوە، ئەوانیش هەر هەمان خدەو خووی باوکەیان هەبوو، تا گەورەتر بووم هەستم کرد منو دایکمو

خوشکەکانم کارەکەرین، زۆرجاران کارەکەرەکان لە ئێمە پتر ڕێزیان پێبەخشراوە، ماڵیش جگە لە زیندانی خۆشەویستی هیچی دیکە نەبوو بۆ من، باوکو براکانمانو کۆی پیاوانو کوڕانی بنەماڵە وەک بەڵایەک لە ئێمەیان دەڕوانی، باڵقبوونی کچەکان ..بۆ ئەوان گەورەبوونی خەمو بەڵاکان بوو، سەیرە .. بە هەموو ژیانم باوکم یان یەکێک لە براکانم نەیانپرسی ئەرێ خوشکێ چ بەڵاتە؟ چ خەمێکت هەیە کچم؟ دەبوو فرمێسکەکانم بشارمەوە، لە پۆلەکان لەبەر چاوی ئەو کچو کوڕە منداڵانە دەگریام .. شەرمم نەدەکرد، کەچی لە ماڵەکەی خۆماندا هیچ کام لە خوشکەکانم .. نە من .. نە دایکە .. نەدەبوو فنگە فنگ بگرین، دەبێ کچێکی بە حەیاو حورمەت لە ماڵی باوکی خۆییو لەناو ئەو هەموو کەسو کارە چاکەدا..تێر نان و ئاو بۆچی دەگریێ؟ هەر دەبێ گریانەکە بۆ گرێو دەردێک بێ کە حەرامە پیاوەکان بیزانن .. جا چی حەرام نەبوو، هەرگیز بەختی ئەوەم نەبوو بۆ یەکجاریش شەوێک قەدەر بە هەڵەدا بچێو باوکم یان یەکێک لە براکانم ئەو ئەرکە قورسە بکێشێو ماچم بکاتو بڵێت..

((شەوشاد .. کچە شیرینەکەم!))

((خەوێکی خۆش .. خوشکە نازدارەکەم!))

نەشمدەزانی بۆ یەکێکیان وای نەوت، کەس ئەو زەحمەتە زۆرەی نەدایە بەرخۆی.. باوکە مردو ئەو شەوشادەی هەر نەکرد، براکان ژنیان هێناو سەفەریان کرد .. هەڵەتەی شارانو وڵاتان بوونو ئەو شەوشادەیان

هەر نەکرد، دوو وشەیەو بەس .. بەڵام چ حەسرەتێکە کە ببێ بە مەحاڵ، نەمدەزانی بۆچی براکانم ئەوەندە پەلەیان بوو من لەو ماڵە دەرچم، هەتا دایکم کزۆڵەو نیگەران ڕۆژو شەو لێم ورد دەبۆوە، دەمزانی بەو چاوە پڕ لە ترسو گومانەوە دەڵێ کەی دەچیتە ناو ماڵو مێردی خۆت ..کچەکەم؟ چ وڵاتێکە کە کچەکان جگە لە عەورەتو بەڵای نامووس هیچی دیکە نەبن، ئێستاش کە بێوەژنێکی تەنیام پتر هەترەشیان چووە، ئەوان هەرگیز نەیانزانی من برینێکم شاردەوە کە سەدەها کچو ژنی لەسەر کوژراوە، برینێکی ئەبەدی کە دوو- سێ تنۆک خوێنی لێدێتو بەڵام هەرگیز سارێژ نابێتەوە، گەر کەسو کارم بیانزانیایە لە حەژمەتو ترسانا دەمردن، بە ژنو پیاوەوە، بە باوکو براکانمەوە، بە دایکو خوشکەکانمەوە کە ئیتر بەختی ئەوەیان نەدەما شوو بکەن، خوێن لە دەمارەکانیاندا دەوەستا، من ناچاربووم نهێنی تۆش لەناو خۆمو برینە ئەبەدییەکەمدا بشارمەوە، تۆش بە مەزاقەوە دەپرسی بۆ شووم کردووە؟ من لە مێشێکی تەنیا لە زستاندا کە سەری لێدەشێوێو کونێک نادۆزێتەوە خۆی تێدا بشارێتەوە .. ماندووترم، دەبوو وەک مەلێکی تەرەو تینوو لە شوێنێکدا بنیشمەوە، هەتا گەر هێلانەی بەر ڕەشەبای سەر بەردێک بێ، ئەم پیاوەی کە تەنها چەند ساڵێکی کەم لەگەڵما ژیاو مرد کردبووی بە خوو کە هەموو شەوێک باوکانە یان مێردانە سەری ماچ دەکردمو دەیوت..

((شەوشاد .. خانمەکەم ..!))

کە دیارە قەت شەوێکی شادم نەبینی، تۆ دەزانی شەوشادێک چەندە پێویستە بۆ کەسێک بیەوێت بخەوێت، هەتا گەر بە درۆش بێت، سەیرە .. لە ماڵێکدا بژیتو بە هەموو تەمەنت حەز بکەیت یەکێکیان بەسەرتدا بنووشتێتەوەو بڵێت..

((شەوشاد!))

((خەوی خێرت بێ ..!))

کارەسات ئەوەبوو کە شەوێک سەرمی ماچ کردو دوای «شەوشاد»ەکە وتی زۆر زەحمەتە بە کەسێک بڵێیت- شەو شاد- کە خۆشت نەوێت، یان لێی بترسیت، یاخود شەرمی لێبکەیت، وەک نهێنییەکی گەورەی درکاند بێت چرپاندی بە گوێمدا کە من یەکەم کەسم شەوشادیم لێدەکات، ئەو شەوە زۆر گریام، چونکە لە دڵی دام کە من کچێکی خۆشەویست نەبوویمە.. نە باوکو نە براکانمو نە خاڵو مامو تەنانەت تۆش .. هەرگیز .. هیچ کامێکتان «شەوشاد»ێکتان بۆ من خەسار نەکردووە، ترساون یان شەرمتان کردووە .. یان چی ..؟ یا ئەوەتا کەس منی خۆشنەویستووە؟ کەوتمە گومانێکی گەورەوە کە ئەو پیاوە میهرەبانە بۆچی لەگەڵ کۆنە ژنەکەی و کچەکانی خۆی شەوشادێکی نەبووە، بۆچی ئەو میهرو سۆزەی بەسەر مندا ڕشتوویەتی تەنها بەر لە ژەهراوی بوونو نزیکبوونەوەی مەرگدا وەها پڕو کوشندەیە؟ ئاخۆ پیربوون شتێکی گەورە لە مرۆڤ دەگۆڕێت کە من دەرکم پێنەکردبێت .. نهێنییەک کە وەک تەلیسم ناکرێتەوە، ئەمەیان چ گرێ کوێرەیەکە

کە بە دەستتەوە عاسیّ دەبیّ کە تا خۆت پیر نەبیتو نەمریت بۆت ناکرێتەوە، شەوشادێک کە قەد نەمدیبوو، درکاندنی وەها ڕازو نهێنییەک کە مێردەکەم لەمەڕ وتنی شەوشادێکو ماچێکدا بە گوێمدا چرپاندی هەر هەموو دونیای بەسەر مندا خاپوور کرد، خاڵۆزا جار هەیە نیگایەک، قسەیەک، درکاندنی ڕازێکی پەنهان، نهێنییەکی خنکاو لە دڵدا کە سەر خوێن دەکەویّو وەک کەفێک دەکەوێتە سەر لێوانو دەیبینی، ڕستەیەک وەک قورقوشم دەڕژێتە گوێچکەتەوە، وەک تەقینەوەی بروسکێک هەموو دونیات لەبەرچاو ڕۆشن دەکاتو تەواو خۆت بە ڕووتی لەبەرامبەر ئاوێنەیەکدا دەبینی، وەک ئەوەی یەکەمجار بێت خۆت ئاوا بە ڕووتو قووتی ببینی، نەک بە تەنها خاڵو پەڵەو ماکی سەر جەستەت جوان دەبینی، بەڵکو تاوەکو ناو کرۆکی ڕۆحت خۆت دەبینی، هیچ شتێکی شاراوە نامێنیّ، ئەو شەوە کەوتنەخوارەوەی ئەو چەند ڕازو نیازە لە زاری ئەو پیاوە بۆی سەلماندم کە من نەژیاوم .. تازە زۆر درەنگەو ئیتر ناتوانم بۆ خۆم بژیم، کە زانی شپرزە بوومو بەسەر خۆمداو لەناو خۆمدا کاول دەبووم.. دەپاڕایەوە لێم کە ئەم چی وت تا ئاواهی من خانەخراپ بم، ئەم شیوەنە لە پای چی؟ تا خەوم لێکەوت یان بوورامەوە .. نازانم .. وەک مێردمنداڵێکی گرینۆکو گوناهبار بە دیارمەوە دەگریاو نەیدەزانی چ کەتنێکی کردووە .. دەپاڕایەوەو دەیوت ئاخر دە تۆ بڵیّ من چیم وتووە .. چی بووە؟ ئەوەندە پەرێشان بوو ناچار خۆم خستە ناو جێگاو بە درۆ خۆم وا

نواند کە خەوتووم، هەنسکەکانم پێ ڕانەدەگیران، تا درەنگی شەو پاسەوانم بوو، پێم سەیر بوو کۆنە جەنگاوەرو ڕاوچییەکی وەک ئەم کە سەدەها باڵندەو حەیوانە کێوی ڕاوکردووەو کوشتووە .. سەدەها کەس کە ئەم ناوی دەنا ڕاوە دوژمن، زەلامێک کە سەرو سەکوتی لە جەنگاوەرێکی کێوی ناو جەنگەڵو ئەشکەوتەکان دەچوو، کەچی چاوەڕێ بکات تاوەکو لە گریان ژێردەبمەوەو هەنسکەکان بەرم دەدەن، چاو پڕو پووشاوی لشمە لشم بە دیارمەوە بگری، هەمیشە دەیوت خانمە چکۆلە من دڕندە بووم .. دڕندەو کێوی .. تۆ منت کەوی کرد .. تۆ .. ئا .. تۆ توانیت ماڵیم بکەیت..!

هەمووجار لەودیو کتێبە کراوەکانەوە کە دەمو چاوی خۆم تێدا دەشاردەوە، لە تەک پاڵەوانەکانی چیرۆکو ڕۆمانەکاندا تێر بە دڵی خۆم دەگریام، خەونم بەوەوە دەبینی ژیانی من .. هەقایەتی ڕۆح داڕزانو دۆڕانی من بکرێت بە چیرۆکێک، هەرگیز زاتی ئەوەم نەدەکردو نەمدەوێرا خەمو دەردە دڵەکانی خۆم بۆ کەس هەڵبڕێژم، نووسەر بوو بێت یان نانووسەر، مێ بێ یان نێر، نووسینەوەی ئەو هەموو فرمێسکو خوێنو خەو زڕانو ترسو شەرمە لەسەر لاپەڕە سپییەکان زۆر زەحمەتە، ئاخر کاغەزەکان نە بە فرمێسکەکان تەڕ دەبن، نە سوور دەبن بەو خوێنەی لە من ڕژا، نە زەرد دەبن لەتاو ئەو ترسو تۆقینە، ژینی من دوای سەفەری تۆ وەک ئەوە وابوو بە درێژایی ئەو ساڵانە کەسێک بەناو دڕکو داڵو چڵکاودا ڕامبکێشێتو منیش ڕووت

بەو ئاودامان خوێنو چڵپاو بەرگم بێت، سووری مانگانەم دەکرد بە بیانوویەکی گەورەو سکم دەگوشیو دەمکرد بە شیوەنو واوەیلا، گوایە ئازار کوشتوومی، هەموو مانگێک بۆ هەفتەیەک کوڵی دڵی خۆم هەڵدەڕشت، دایکم لەسەری خۆی دەداو دەیگوت کچەکەم بێ نوێژی ئەو هەموو شینو شەپۆڕەی دەوێ، بەوە چاک بوو کە سکم نەکرد، دەنا ئەو کۆرپەیەی ناو هەناوم هەر بە فرمێسکو زووخاوی دڵم دەخنکا، بیستبووم فرمێسکیش ژەهراوییە، بۆیە هەر هەموویم دەخواردەوەو لەزەتم لێ دەکرد، یەک- دوو جار ویستی بزانێت کە بۆ حەزم لە مناڵ نییە، کە زانی تەواو سەغڵەت دەبم، ئیدی ئەم بابەتەی کوێر کردەوە، کە ئەو مرد تەنیاتر بووم، دەزانی ڕاهاتبووم وەک پەرستارێک لە بەیانییەوە تا شەو خەمی داو و دەرمانەکانی بخۆم، بەدەم خوێندنەوەی کتێبو ڕەسمکردنو سەیری فیلمو زنجیرە تەلەفزیۆنەکانەوە خۆم سەرقاڵ دەکرد، لەو خەڵوەتەی خۆمدا وەک سۆفییەکان لە خۆمو دونیا ڕادەمامو هۆشو گۆشێکی دیکەم بوو، هەر وەک مارم لێهات کە زوو زوو کاژ فڕێ بداو کاژێکی نوێ بکاتە بەرگی، بە ناو خۆمدا شۆڕبوومەوە ..وەک ئەوەی بچمە ناو بنی بیرێک یان ئەشکەوتێک کە بە چرایەک هەموو کونو کەلەبەرو گۆشەیەکی تاریک بپشکنم ..

-گەیشتی بە کوێ .. بەم شەڕو هەرایەی ئێستا تێیکەوتی ..؟

- گەیشتمەوە بە خۆم .. بە ڕۆحو گەوهەری زاتی خۆم .. گەیشتمەوە بە سەرچاوەی هێزێک کە نەمدەزانی لە خۆمدا هەیەو کوشتوویانە، ئەم شەڕەش بە جوان دەبینم چونکە دژ بە ناشیرینییەکانی هاوڕێو هاوتوخمەکانی تۆیە.

-کەواتە نیعمەتی تێدابووە شووت بەم زەلامە کردووە .. تۆی کرد بە قارەمانو خاوەن هێزو سۆفیو خەڵوەتکێش .. ئەوەتا بە تەنیا دژی ئۆمەتێک وەستایتەوە .!

-تۆ خۆت فێرت کردم، ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر بوو ..لە یادم ماوە وتت بەهێزترین مرۆڤ ئەوەیە کە بەتەنیا دەوەستێو دەجەنگێت، قسەکەی دکتۆر ستۆکمان-ە لە «دوژمنی گەل»ی- ئیپسن- دا، ئێستا بڕوام وایە کە ئەو تەنیاکەوتنەی من لەو هێزەوەیە، ئەو کابرایە ناچاری نەکردم کە خزمەتی بکەم، دەزانم وەک پیاوێک شووکردنی منت لەلا بووە بە گرێ کوێرە، وەک نێرێکی بنەماڵەکەمان، نەک وەک ئەوەی منت خۆشویستبێت، ڕەنگە پێت ڕەوا بووبێت چاوەڕێت بکەم تا تەپڵی قیامەت، من ببوومە پەرستاری مەرگ، چونکە دوای ئەو دۆڕانو دابڕانە کە تۆ پاڵەوانەکەی بوویت من بۆنی مەرگم لە خۆم دەکرد، من خزمەتیم دەکرد، چونکە بۆنی مەرگی لێدەهات، بۆنێک

کە بەر لەوەی شووی پێ بکەم لە خۆم دەهات، تۆ وا مەزانە من لە تەنیاییو بەتاڵی ئەم شەڕە دەکەم، من پێموتی ئەم منارەیەم خۆش دەوێت، ئەم خانووەی تێیدام بۆنی مێژوویەکی دێرینی لێدێت، بۆنی سەردەمێکی جوانتر لە ئێستا، هەر نەخشو نیگارێکی دەگمەنی خۆشەویستیو دەستڕەنگینی ئەو وەستایەم بۆ دەگێڕێتەوە کە بە عەشقەوە، تاقو دیوارو پەنجەرەکانو دەرگاکانی ڕازاندۆتەوە، من دەمێکە مردووم خاڵۆزا .. تەنها ئەوکاتە دەزانم زیندووم کە شەڕ دەکەم دژی ئەو کەللەپوتانەی دەیانەوێت ئەو خانووانەی کە من بە پاشماوەیەکی دێرینیان دەزانم.. ئەوان وەک دیناسۆر پێی پێدابنێن، من هەرگیز نەمویستووە خۆم بکەم بە پاڵەوانو ناو دەربکەم، ئاسان نییە لە ماڵێکدا بە دیار پیاوێکی نەخۆشو لە جێگادا کەوتوو کە تا ئێستاش بۆنی ناخۆشی بە تاقو دیوارو پەنجەرەو پەردەکانەوەیە، پیاوێکی ژەهراوی کراو .. هەموو تەمەنی جوانیت دابنێیتو بیکەیت بە قوربانی، جوانی ئەو پیاوە لەوەدابوو کە ئەم شەڕەی منی پێ ڕەوا بوو، بە پێچەوانەی هەموو ئەو گاگەلەی کە ناویان لە خۆیان ناوە خزمی خەمخۆر، بۆ من نەخۆشیو مەرگی ئەو پیاوە کتومت لە نەخۆشیو پیربوونو مەرگی ئەو شۆڕشە دەچوو کە هەموومان خەونمان پێوە بینی، وەک دۆڕانی خەونی ڕۆژانی ملنەدانیو بەرگری شاخ هەر ڕۆژەو هەناسەیەکی دەمرد، خانەیەک لە لەشی بێهێزی کوێر

دەبۆوە، گەردیلەیەکی لێ دەگۆڕا .. تا دواجار داڕزا .. وەک پەیکەری مرۆڤێک مایەوە کە مانەندی مەرگ بوو .. ئەو پیاوە موو بە موو .. خانە بە خانە لەبەرچاومدا دەمرد، ئێمە هەردووکمان جگە لە دوو لاشە .. دوو کەلاک هیچی دیکە نەبووین، لاشەکان نەتوانای بیرکردنەوەیان هەیە، نە لە مەرگ دەترسن، گەورەترین دەسکەوتم لە شووکردن بەو پیاوە ئەوەبوو کە لە بینینی مەرگ بێباکی کردم، لە تامکردنو بۆنکردنی مەرگ، گەرچی لە منداڵیمەوە بە مەرگ دەیانترساندم، ئەو ترسو تۆقینەی باوکمو دایکمو مەلای گەڕەکو مامۆستاکانی ئایینو پتو پیرەژنەکان لە ڕۆحی مندا چاندیان، مەرگی ئەو پیاوە هەمووی بیرهێنامەوەو دواجار هەر هەمووشی لەبیر بردمەوە، دوای کۆستی ئەو کۆچەی تۆ کە بەسەر مندا هات.. هەر هەموو ژیانی لە مندا کوشت، چیتر پێویستم بە ئاوێنەو داو و دەرمانی خۆجوانکردن نەبوو .. بە زۆر دەچووم بۆ حەمام ..

کچێک کە کەس نەیدەزانی بۆتە ژن دەبێت چی بکات ..؟ چی بکات دوای سەفەری خامۆشیو بێ گەڕانەوەی دڵدارە بە وەفاکەی لەودیو کێوەکانو زەریاکانەوە؟ چی بکات کە پیاوەکان جگە لە کچی جوانکیلەو مناڵکارو سەر مۆر ئامادە نەبن قەیرە کچێکی وەک من کە بێ بنە بیخوازن؟ کێ لێرە کچێکی دۆڕاو و کەوتوو هەڵدەگرێتەوە؟ منێکی نیوەمردوو هەر دەبوو چاوەڕێ بکەم تا ئەو پیاوە دەگەڕێتەوە کە پەردەیەکی تەنکی لابردو ڕۆیشت، پەردەیەکی تەنک وەک پەڕی

تەنکی سییر، بێئەوەی بزانێت کە پەڕەی ڕۆحمی هەلا هەلا کرد، وەک هەڵۆیەک کە ڕاوەدووی چۆلەکەیەک بنێتو بە زەبری دوو دەنووک هەر دوو چاوانی کوێر بکاتو پاشان بڵێت: بۆ نافڕیت؟ من بۆ کەس نەبوومو بە کەڵکی کەسیش نەدەهاتم، ڕۆحێکی وێڵو تەنیاو جەستەیەکی بێبەری لە خۆشی، گومانم هەبوو خەڵکی بمبینن‌و پتر وەک سێبەری کەسێک یان تارماییەک دەهاتمو دەچووم، زۆر شەرمن‌و ترسنۆکو کزۆڵە بووم، لە حەمام یان لە ئاودەستخانەکە سەدەها جار لە خەمی ئەو نهێنییەی لە خۆمی دەخوارد دەگریام، سەدەها شەو تا خەو دەیبردمەوە.. هەنسکم هەڵداوە .. تفم لە چارەنووسی خۆم کردووە، تۆ پێمبڵێ ئەو ڕازو نهێنییەم لای کێ بدرکاندبایە؟ باوک یان براکانم .. دایک یان خوشکەکانم .. کە دیارە پیاوەکان تۆ چاکتر دەیانناسی چییان دەکرد؟ لە من بگەڕێ کە دەیانکوشتم .. ئەی چۆن سەیری کوڕێکی وەک تۆ جوامێریان دەکرد کە نان‌و نمەکو خوێن‌و خزمایەتی ناناسێت؟ ژنەکانیش گەر لەتاو ئەو کارەساتە نەمردبان، وەک پەیکەری بەردین بەدیارمەوە دۆش دادەمان، من کە مامەوەو نەموێرا شوو بە کوڕێک بکەم بە تەنها پاراستنی ئەو دڵۆپە خوێنە نەبوو کە لە من تکاو شەرەفی هەموو تایەفەکە بوو، بەڵکو پاراستنی نهێنی تۆش بوو لەناو مندا، کەسیان، نە نێرو نە مێ، لە هەردوو بنەماڵەکە بەرگەی ئابڕووتکانێکی وای نەدەکرد .. خاڵۆزا .. من خۆم کرد بە قوربانیو کەچی هێشتا تۆی ئەفەندیو شیک وەک دادوەرێکی

خاوێن‌و بێ خەم هاتوویتەوە دادگاییم دەکەی، هێشتا بە خیانەتکارم دەزانی، بە خۆفرۆش‌و لەش فرۆش، گەر بموتبا ئەوە بەهرام بوو ئەتکی کردم‌و بێ هەستو خوست سەفەری کرد، تۆ دەتوێرا ئاواهی خۆشەویستو سەر بڵند بێیتەوە ناو کەس‌و کار، ئینجا جوامێرانە وای بنوێنێ کە خەمخۆرانە لەو بەهەشتی ئاوروپایە گەڕاوەتەوە تا پوورزا بێوەژنەکەی هەڵبگریتەوە. گوایە تۆ لە ترسی جەنگو مەرگ سەری خۆت هەڵگرت، من هەموو ڕۆژێکم جەنگ بوو .. هەموو شەوێکم مەرگەمووش بوو .. تا ئێستاش ئەو دڵۆپە خوێنەی لە مندا تکاندت برینێکەو هەرگیز سارێژ نەبووەو هەر خوێنی لەبەر دەڕوا ..

من ناچار شووم کرد بە پیاوێک کە بایی ئەوەندە جوامێر بوو کە بەقەهرێکەوە وتی: تێدەگەم‌و ئەو نهێنییەت دەپارێزم .. نازانم وەک گەوهەرێکی ناو زبڵ منی هەڵگرتەوە یان وەک چی .. نازانم .. ئەوەندەم دەزانی کە شەیدام بووە، لەوەدەچوو بۆ جوانییەک بگەڕێ لە مندا کە لە زەمانێکی زووتردا لە دەستی چووە، یان وەک نێچیرێکی شکەستەباڵ دڵنیا بوو لەوەی کە ئەگەر بمخاتە قەفەزێکەوە یان بەرەڵلاشم بکات مەحاڵە بفرم، کتومت خۆم وەک تابلۆیەک دەهاتە بەر چاو کە عاشقێکی هونەرو نیگارناسێک بیەوێت بمکڕێت بە هەر نرخێک بێت، گەرچی تابلۆکە بەر چەقۆی شێتێک کەوتووەو ڕێک ناوەڕاستەکەی شەبەقێکی تێبووە، کە من وتم: بەلام من کچ نیم‌و ژنم، بە خەم‌و ترسێکەوە درکاندی .. منیش ژەهراوی کراوم لەگەڵ چەند

کەسێکی دیکە لە شاخ .. ئاسەواری ئەو ژەهرە لە خوێنما مەییوەو .. نەخۆشم خاتوون .. ئەو کابرایە یەکەم کەس بوو پیمبڵێ خاتوون .. هەر واش بانگی دەکردم، ئەو پیاوە زۆر بێباکانە تێی گەیاندم کە حەز دەکات بەرلەوەی بمرێت تام لە جوانی بکات .. دووبارەو دە بارەی دەکردەوە کە هەرگیز نەژیاوە .. گوایە بە تەواوی مووی لێنەهاتووە کە لەو شاخانە دژی دوژمنانی کورد تفەنگی تەقاندووە، ئەو زەلامە بۆ من خۆ دزینەوەو خۆ شاردنەوە بوو لە خودی ژیانێک کە هەرگیز نەمبووەو نیمەو تازە لەوە درەنگتریشە قەت هەمبێت .. نە ئەوساو نە ئێستا .. هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو تا کوێ نەخۆشەو چەندساڵی دیکە دەژی .. هەرگیز لێم نەپرسی تەمەنت چەندە .. لەوە دۆڕاوترو ماندووتربووم ڕۆژو مانگو ساڵەکانم بەلاوە گرنگ بێت، پێیدەوتم .. خاتوون .. قەت هەست ناکەم لە من منداڵتریت .. گوایە لەچاو تەمەنی خۆم .. عاقڵترم .. نەیدەزانی کە من ڕۆحێکی پیرم .. ئەوەندە پیر کە هەستم دەکرد ژیانێکی دیکەم هەبووەو مردووم‌و ئەوەی ئێستا زیندەگی دووەممەو تا پیربوون هێناومە، دەمزانی کە ئەو ئەوەندە دێوانە بووە مەحاڵە ئەو مردنەم ببینێ، شیعرو شانامەی بەسەرمدا هەڵدەگوت، کەچی نەیدەزانی ئافرەتێک لەناو خۆیدا لەو پتر ژەهراوی بووە، لەو پتر بۆنی مەرگ لە خۆی دەکات، کە منی خواست جگە لە لاشەیەکی بێ گیان هیچی دیکە نەبووم، پتر لە حەیوانێک دەچووم کە جیاوازی لەنێوان چوون بۆ مێرگێکو قەسابخانەیەک نەکات، تۆ دەتەوێ بگەیتە

چی کە من بۆخۆم هەیکەلی مەرگێک بووم لە شێوەی ئافرەت؟ بێجگە لە میراتگری یادەوەرییەکی تاڵو خوێناوی هیچ شتێکی دیکە نەبووم، ئەویش کە منی بینی دەیویست هەموو یادەوەرییەکی ناخۆشی خۆی تەلاق بداتو من مارە بکات، تۆ لە دووری هەزاران هەزار میلەوە بۆ من تەواو .. ببووی بە مەحاڵ .. ئەو پیاوەش مەحاڵێکی دیکە بوو کە دەمزانی تەمەنو ژەهراوی بوون چەند ساڵێکی کەمی بە قەرز داوەتێ .. ئەو لە دوا ساڵەکانی تەمەنی وەک توحفەیەکی دەگمەنو شاراوەی دۆزیبێتەوە وابوو، منیش ئەو خانووەی کە دەیبینی بۆ من توحفەیەک بوو لە هونەری پڕ لە سەلیقەی تەلارسازیو جوانی، هەر بۆیە پێم حەیفە ئەو ملهوڕانە بیرمێنن کە تۆ پێت سەیرە ئەو جەنگەم لەسەر بەرپا کردووە، بۆ من هەر هەڵکۆڵینێکی نەخشینی سەر دەرگایەکی هی ئەوەیە خوێنی خۆمی لەسەر بڕێژم .. ئیتر تەواو .. من پێم سەیرە کە هێزی ئەوەم ماوە باس لەو هەموو دەرد و خەمو ڕسواییە بکەم.. تۆ هاتیتەوە تا سەر لە نوێ قەتماغەی برینەکەم هەڵدەیتەوە، بۆ من کە نە یادەوەریو نە چاوەڕوانیو نە بەڵێنو نە لەزەتەکانی دونیاو نەهاتنەوەی تۆو نە هیچ هەوەسێکی ژنانەو نە هیچ خەونێک .. هیچ .. هیچیان نەماونو هیچیان دادم نادەن .. تەواو .. هیچ کەسو هیچ شتێک ناتوانێت پێم بڵێت چاوەڕێ بکەو هێشتا ئایندەت لەپێشەو ژیان دەستی لێ بەرنەداویت، تۆ دەزانی من چەند ساڵە پێنەکەنیوم، مەگەر خەندەی زەردو مردووانەم بە درۆ خستبێتە سەر لێوم، تەنها

خۆشییەک بۆ من کە مانای مانو نەمانم دەداتێ: بردنەوەو دۆڕاندنی ئەم شەڕەیە کە مانەوەو وەستانی ئەو منارەیە بەپێوەو لەتەک ئەو چەند خانووانەی کە بە ڕۆحی ئەم شارەی تێدەگەم .. سەیری ئەم نیگارە بکەو ئەو ژنەی لێوانی بە خەندەیەک کراوەتەوە «مۆنالیزا» نییە، سەیری بکە بە چ زەحمەتێکەوە دەیەوێت پێبکەنێتو دەمو لێوی بە ئاستەم کراوەی لە برینێک دەچێت کە خوێنی لێ دەتکێ، ئەوەیان یەکێکە لە پۆرترێتەکانی خۆم بەناوی ((خەندەیەکی خوێناوی)).

لای من مەرگی هێواشی ئەو پیاوە فێری کردم کە ئاخۆ دەتوانم ببم بەو ژنە بەئەمەکو دڵسۆزەی ڕێز لە پیاوێک بگرم کە قەدەر هەڵیداوەتە بەردەمی من وەک هەڵدانی نیوە خنکاوێک بۆ سەر کەناری ڕووبارێک کە ماسیگرێکی مایەپووچ دەیبینێ کە منم، بەوەفا بۆ لاشەیەک کە خوێنێکی ساردو ژەهراوی بەناو دەمارەکانیدا دەگەڕێ، پیاوێک کە ناتوانێت پێخەفی ژنێکی غەمبارو دڵساردو ڕۆح مردوو گەرم بکاتەوە، ئیدی ڕاهاتم چاو بە چاو لە مەرگ بڕوانمو خزمەتی بکەم تا بیسەلمێنم هێشتا مرۆڤمو زیندووم، چەندە دەستەونەزەر لە خزمەتی مەرگدا دەوەستام، ئەوەندە پتر دەست و پەنجەم لە گەڵیدا نەرم دەکرد و ترسم دەڕەوییەوە، دەبوو بە دەستێکی لەرزۆکەوە چای گەرمی بۆ دابنێم، مێزی خواردنەوەی بۆ بڕازێنمەوە بێئەوەی بزانێت ئەو تامە سوێرەی ناو قاپی مەزەکانی فرمێسکەکانی منن نەک خوێ کە بەدەم

ئامادەکردنی زەڵاتەو جاجیکو تەپولەوە دەڕژانە ناو قاپەکان، بۆ ئەوەی مەرگ هەست بە تەنیاییو ناشیرینی خۆی نەکات ناچار پێک بە پێک لەگەڵیا دەڕۆیشتم، ناچار بەڕوویدا پێدەکەنیمو لە ناوەوەشدا بەدەم قوڵپی گریانەوە دەکولام، چونکە نەدەکرا .. نەدەکرا .. مەرگەو بەدەم خواردنەوە لەتەک ژنێکی هێشتا جوانو زیندوودا لە خەیاڵی خۆی بترسێت، هیچم شک نەدەبرد لەو ئێوارانەدا کە بیسەلمێنم زیندووم جگە لە خزمەتکردنی مەرگ، سکێچی بەپەلەم بۆ دەنەخشاندو سەر مێزی خواردنەوەو سەر کۆشی پڕدەبوون لەو سکێچانە کە ئەمی ڕاوکەر چۆن چۆنی سەد باڵندە بە ئاسمانەوە بە تەقاندنی تاپڕەکەی دەپێکێ، کە خۆی لەو نیگارانەدا دەبینی شاگەشکە دەبوو و بەدەم پێک هەڵبڕینەوە دەیوت: هەڵیدە .. بەخۆشی ئەم ئێوارانە کە جوانی لەبەردەممدایەو بۆ سەفەرێکی ئەبەدی لەگەڵ خۆمدا دەیبەم .. ئەمەی دەوتو دەیدایە پڕمەی گریان .. دەبوو هەر خۆم فرمێسکەکانی مەرگ بسڕمەوەو ژێری بکەمەوە، کە مردن بۆ خۆی نەتوانێت لە دەرگای حەوشە بەودیودا پیاسەیەک بکات، لەسەر کورسی ناو باخچەیەک دابنیشێت لە گوڵو درەختەکانو سەوزایی ڕابمێنێت، ناچار لە نیگارەکانمدا سەوزایی دەشتو دەرو ساماڵو ڕووبارو تاڤگەو دۆڵو شاخی بەفرینو سەر بە تەمم بۆ دەهێنایە ژوورەوە، کەچی بە دزییەوە بێئەوەی پێبزانێت ئەو تابلۆیانەم دەنەخشاند کە مەرگی پەپوولەکانی تۆیان دەگێڕایەوە، ئەو ئەلبوومەی بەر دەستت بکەرەوە دەیەها

نیگاری تێدایە کە هەقایەتی سووتانی پەروانەو هەڵوەرینی گوڵەکان دەگێڕنەوە، سووتانی گەمییەک لە ناوەڕاستی زەریایەکو خنکانی کچێک بە تەنیا بەدەم شەپۆلی سەرشێتی مەرگەوە کە دەیباتو لە کەنار دووری خستۆتەوە، دەیەها نیگار کە نوقمن لە ڕەنگی بێڕەنگی تەنیایی.. لە دەنگی بێدەنگی رۆحی خۆم ..فێری ئەوە بووم کە چۆن بتوانم دوو ژیانم هەبێ ..لە مەرگ بڕوانمو ڕەسمی ژیانێکی کێوی پڕ لە جووڵەو تەماع بکەم، چۆن بە دزییەوە کە زیندەگی لە مندا دەکوژایەوە .. خۆم لەسەر ئەوپەڕی نائومێدی ڕابهێنمو چاوەڕێی موعجیزەیەک نەکەمو بە هیچ هیوایەکی درۆ کە نایەت فریو نەخۆم، ناکرێت ئەوە ڕێکەوت بێت کە من هیچ منداڵێکم لەو پیاوە نەبێت کە ئەو بۆ خۆی حەزی دەکرد، من لەو ئافرەتانەم کە فڕێدانی منداڵێک بۆ ناو دونیایەکی وەها ناشیرین بە گەورەترین مەترسیو سەرکێشی دەزانم، خودی منداڵ واتا بڕوا هێنان بە سبەی .. بە بوونو ژیانێک کە تەواو پڕت دەکاتەوە، کە من ئەو ژیانەم نەمبوو .. هەرگیزاو هەرگیز .. من پاسەوانی پیاوێک بووم لە بەرگی مەرگدا، چ کوشندەیە مەرگێک لە مندا پاسەوانی مەرگی کەسێکی دیکەی دەکرد، سەیرە مەرگ بۆ خۆی هێزی ئەوەی هەبێت ژیان بپۆشێتو خۆی بڕازێنێتەوە تاوەکو مردوویەکی دیکە شادومان بکات، ڕەنگە هەر ئەوە وایکردبێت کە من لێرەمو هێشتا ماومو شەڕ دەکەم دژی ئەو گەلۆرانە، ڕەنگە لە خۆت بپرسیت ئەم ئافرەتە بۆچی حەپولکی من نادات دوو قسان

بکەم؟ کەی ئاواهی دەمهەراش‌و چەنەباز بووە؟ بۆ هەر من دەدوێم‌و تۆ ناچاریت گوێ بگریت؟ خۆ لەوانەشە حەز بکەیت قسان بکەم‌و .. ورێنەکانم هەڵڕێژم بەڵکو تۆ بکەویت بەسەر ئەو راز و نهێنییەی کە بۆی هاتوویتەوەو لەلای تۆ هێشتا گرێ کوێرەیە، چاوەڕێ بەوەی لاوازی و کەوتنی ژنێک ببینیت کە دوای سەرهەڵگرتنی تۆ چەندە بێکەس و سەرگەردان بووە، بەڵکو ئەوە خوایە هەواڵێکی خۆش بۆ کەس‌و کارو دایک‌و خوشک‌و براکان‌و گشت مێ‌و نێری هەردوو بنەماڵەکە ببەیتەوە کە خەون بەوەوە دەبینن حەیاو شەرەفی خۆم خۆشبوویت‌و ملم لە کێردو خەنجەری ئەو پیاوە بەسام‌و هەیبەتانە نەسووم، پێت سەیر نەبێ ناهێڵم زار بکەیتەوە خاڵۆزا .. نا .. پێت سەیر نەبێ .. هەزاران شەو و ڕۆژ خەیاڵ‌و ختوورەی خراپ خنکاندوومی‌و سەدەها ڕازو نیازو گلەیی‌و خەم‌و دۆڕان بەسەر پەڕەی ڕۆح‌و دڵ‌و مێشکمدا تێپەڕیون، لەگەڵ دارو دیوار دواوم، لەگەڵ سێبەری خۆم بەشەڕ هاتووم، ویستوومە ئەو هەموو دەردەدڵە بۆ کەسێک هەڵڕێژم‌و کەمێک خۆم بەتاڵ بکەم .. کەس نەبوو .. هیچ کەس .. سەیرە .. لە شارێکی گەورەدا بژیت‌و کەس نەدۆزیتەوە دوو قسەی دڵی خۆتی بۆ بکەیت، ڕازو نهێنییەک بدرکێنیت کە شاردنەوەی لە ڕۆحت دەخوات‌و بوێریت بیڵێیت‌و زمانت نەسووتێ‌و لەسەرت نەکەوێت‌و نەبێ بە دەنگۆو هات‌و هاوارو واتەوات‌و قاو لە هەموو ماڵێکدا، ئێستا کە دەدوێم‌و قسان هەڵدەبزڕکێنم وەک ئەوە وایە خوێنم لێ بڕوات..تۆ واتزانی

ئەو خوێنەی لەژێر کەپرەکەدا لە دامێنم ڕژا..ئیتر وەستا؟ نەخێر و هەرگیز.. نەک تۆ کە دانیشتوویتو نازانم بیر لە چی دەکەیتەوەو بە چی ئەم قسانەم لێکدەدەیتەوە، بەڵکو هەر هەموو شارەکەش ناتوانێت ئەم خوێن بەربوونەم ڕابگرێت، تۆ هەر ئەوە نەبوو کە لە ژێر کەپرەکەدا ساڵانێک لەمەوبەر لەگەڵما خەوتیت و راموسانێکی عاشقانە بووبێت و تەواو.. ئەو کەپرەی ئێستاکە قامیشەکانی ڕزیون، تۆ ڕۆیشتیتو کەوتیتە ئەودیو سنوورەکان، کەچی من سەدەها شەو خەونم بەو تنۆکە خوێنانەوە دەبینی کە لە من دەڕژاو زۆرجاران دەبوو بە دەریاچەیەکی سوور یان گۆلاوێکی پڕ خوێنو تیایدا دەخنکام، هەر هەموو ئەو خەونە خوێناوییانەم ڕەسم دەکردو دواتر خۆم لێیان دەترسام، سێ ساڵ باکگراوندی هەموو نیگارەکانم ڕەنگی سوور بوو، لە یادمە تۆ هەستایتەوە .. بێباکو نێرانەو خەندەیەک بەسەر لێوتەوە بوو، من لە پەلو پۆ کەوتبووم .. نەک وەک کچێک لەزەتێک سڕی کردبێت .. نا .. بەڵکو زەندەقم چووبوو، دەترسام ئەو تنۆکە خوێنانە خوێنی دیکەی بەدواوە بێ، تەریقی کوشتبوومیو نەمدەوێرا چاو بکەمەوەو سەیرت بکەم، کە ئەو خەندە خوارەتم بینی .. شەهوەتبازانە بەسەر لێوتەوە .. ئیتر نەموێرا بتبینم، ئازارێکی جیاواز کە هەرگیز نەمچەشتبوو بە خوێنما بڵاودەبۆوە، دوور دوور خەیاڵی بردبووم، هەر دوای ئەو ڕۆژەو پاش سەفەرەکەت .. هەر لەوساوە تاوەکو ئێستا من خوێنم لێ دەچۆڕێت، ئەم قسانەشم درێژەی ئەو خوێن پژانەی ژێر کەپرەکەیە،

زۆرجاران هەستم کردووە کە هێڵو ڕەنگو هیچ فڵچە وەشاندنێک فریا ناکەوێت هەقایەتی ئەو دۆڕانو مەحاڵەو خوێن لەبەر ڕۆیشتنە نەبڕاوەم بگێڕێتەوە، ویستوومە هەناسە بە هەناسە ئەو چیرۆکە بگێڕمەوە، حەسرەت بە حەسرەت بینووسمەوە، فرمێسکەکانم کە لە تەنیاییدا دەمڕشتن، تەنیاییەک کە ورچێکی مێ لە قوتبی باکووردا بەرگەی ناگرێت، یان ئەو ورچە تەنیایەی کە لە پارکی- شایی- دا خەڵکی دەچنە سەیرانی .. لە بەیانییەوە تا شەوخەوتنان چەپۆک دەکێشێت بە شیشەکانی قەفەزەکەداو کەللەی دەکوتێ بە کۆنکرێتی ئەو حەوزەی کە ئاوەکەی بۆگەنی کردووە، لە شوێنی خۆیەوە لەسەر هەر چوار پەل هەڵدەپەڕێتو بەدەوری خۆیدا گێژ دەخواتو دەبۆڕێنێ، تەنها جارێک ئەو ورچە شێتەم بینیو خۆم بیرکەوتەوە کە منو ئەو ورچە چەند لە یەک دەچین، بیستم کە نێرەکەی هەر لە یەکەم مانگی لە قەفەزنانیان بەرگەی نەگرتووەو دلێرانە لە حەوزەکەدا خۆی خنکاندووە، زۆر گریام کە زانیم ورچیک چەندە ئازادی خۆی خۆشویستووە تا دەگا بەوەی خۆی بکوژێت و کەچی باکی نەبێت ئەو ورچەی کە هاودەم و هاوقەفەزییەتی لە دوای نەمانی ئەم چی بەسەر دێت.. دەمپرسی بۆچی ئەم گیاندارە کێوییە نەیتوانی چیتر لە ناو قەفەزەکەدا لەتەک مێیەکەی خۆیدا ئولفەت بگرێت؟ من دواترو درەنگ لەوە تێگەیشتم کە زۆرن ئەو کچو ژنو بێوەژنانەی، بە گەنجو پیرەوە، بەندکراوی ناو قەفەزی خۆیانن، هەندێکیان قەفەزەکانیان گەورەترو ڕازاوەترن، هی

هەندێکیش بەرتەنگو بۆگەنترە ..بۆ هەمیشەش ورچە نێرەکان بە مەرگ بێت یان ژیان وان لە شوێنێکی دیکەدا...
لاشەی داڕزیوی مێردە نەخۆشەکەم کە من یارمەتیم دەدا جار بەجار خۆی هەڵگێڕو وەرگێڕ بکاتو کەلەکە بگۆڕێت، تاوەکو پیسایی و میز و گوو بۆگەنتری نەکات، پتر لەو شۆڕشەی خۆمان دەچوو کە ڕۆژانێک لە شاخ چەند گەنجو بە سامو سەر بڵندو جەربەزەو بە جەرگو پڕ لە خەونو خەیاڵ بووە، بەڵام چەند ساڵێکو کەچی لەناکاو ژەهراوی دەبێت تا دەگاتە ناو شار لە پەلو پۆ دەکەوێت، گەرچی سەرەتا هیچ دیار نییەو نیشانەکانی ئەو دەردە کوشندەیە زۆر زوو دەرناکەون، بەڵام هێدی هێدی ڕۆژو ساڵەکان تێدەپەڕن تاوەکو ژەهرەکە دەگاتە هەر هەموو گەردیلەو خانەو موولوولەکان و دەمارە دەزوولەییەکان .. تا ڕژانی ئاوی چاو و کوژانەوەی ڕۆشنایی ناو بیلبیلە .. تا تەپبوونی گوێو شکانی زمانو پووکانەوەی دەماغ، چ لە دونیای دەرەوەو چ لەناو مندا ڕۆژانە هەر هەموو خەونو خۆزگەکان دەمردن، ئەوەی پێمان دەوت جیهانێکی تازە بەرلەوەی ببینین داتەپی، بوومەلەرزەیەک لێیداو..بوو بە دارو پەردووی بەسەر یەکدیدا رروخاو.. زەمین لەرزینەکە لە چینەکانی ژێرەوەی ئەم خاکەوە نەهات..نا .. نەخێر.. بوومەلەرزەیەکی وا کوشندە لە رۆحی زۆربەمانی دا..بەر لە هەر کەس لە ساختمانی ئەخلاقی هاوڕێ و دۆستە شۆرشگێرەکانی تۆی دا..لە دەرەوەش دونیا لە منو ئەو پیاوە نەخۆشە جوانتر نەبوو ..

هەرگیز .. ژەهراویتر دەبوو، خودی بەهاکانو دروشمەکانو خەونەکان دادەڕزان .. هەلاهەلا دەبوون، ئێستاش تێناگەم بۆچی ئەوەندە ڕقیان لە درەخت بوو .. لە سەوزایی، ئەو گردە کەچەڵەی بەرامبەرمان سەرپاکی دارستان بوو..بە بینینی دارو درەختەکانی وەرزەکانی ساڵم لە یەکدی جیا دەکردەوە، تۆ بەچی لێکی دەدەیتەوە کە بە هەزارەها هێکتار زەوی چۆڵو بەڕیا هەیە، کەچی ئەم کۆنە شۆڕشگێڕانە گەڕیان لەم چەند ماڵەو منارەیە ئاڵاندووە، لەم چەند گردە سەوزەی هەوای شاری پاک دەکردەوە،شێتی کۆشک و قوللە دروستکردنن لەسەر ئەو گردانە، هەمیشە وەک خودا ..وان بە بانی سەرمانەوە، زۆرجاران خۆم وەک ئەم نیشتیمانە دێتە بەرچاو .. یان ئەم نیشتیمانە وەک منی بەسەر هاتووە .. ئەتک کراو و تەنیاو جێماو .. بێوەژنێکی جحێڵ کە سمێڵ بابڕەکان مرخیان لێ خۆشکردووەو قەستیانە سواری بن ..بیخۆن، ئەو پیاوانەی بە ڕەوشتی ڕاوچییەکانەوە مانەوە .. دەبوو بکەونە ڕاوکردنی کچە جوانکیلەکان تا بیسەلمێنن شۆڕشو شاخ پیری نەکردوون، تۆ دەزانی لە شەڕی براکاندا دوو حاجی لەقلەق کە بەسەر منارەکەی مزگەوتی خانەقاوە بوون کوژران، کە لەوەتەی ئەو شارە هەبووە هێلانەی ئەم لەقلەقانە بەسەر ئەو منارەیەوە بووە و هیچ ڕەشەباو باو بۆرانێک زەفەری پێ نەبردووە، ورد بەرەوە لەم منارەیەی کە مەرامیانە بەسەر گۆڕی باو و باپیریاندا بیرمێنن، بە دەستەڕاستدا دیارە کە سەری منارەکە کەل بووەو ڕووخاوە، ئەمەیان جێ زەبری

چەند گولله هاوەنێكه كه براكان دەیانگرته یەكدی، لەسەر گرتنەوەی گردێک كه ئێستا كەسی بەسەرەوە نییه و مانگاكان میز و ریخی بەسەردا دەكەن سەدەها كەسیان به كوشتن دا.. لەم شارەی تۆدا براكان به دڵێكی گەرمەوە ڕاوەدووی یەكتریان دەنا، بەدەم جنێو و دروشمی عەمبارەپۆوە كۆڵانەو كۆڵان یەكتریان هەڵدەبڕی، لەناو دەشتو دەرو دۆڵەكاندا وەک ئەوەی كەڵەكێوی ڕاو بكەن یەكدیان ڕاو دەكردو .. هەتا دیلیان دەكوشتو له ڕادیۆكاندا به یەكدیان دەوت: ئەی ترسنۆكینه وەرن كەلاكەكانتان ببنەوە كه ئەم خاكه پیرۆزەمانی گڵاو و بۆگەن كردووه ..

ئەو چەند تنۆكه خوێنەی له من ڕژاو چی خوێنی لەم وڵاته بەدەستی براكان ڕژاوە خراپترینو ناشیرینترین حەقیقەتی پڕ له درۆ و فیشاڵی ئێمه بوو، پەڵەیەكی سوور یان ڕەش كه تا دەهات دەتەنییەوە به ڕادەیەک كه هەر هەموو خەڵكو خاكی داگیر كرد، برینێكی گەورە كه بوو به تیراوەو تەشەنەی كردو هەر هەموو بەهاو پیرۆزی و جوانییەكی ژەهراوی كردووه، چی پاكه .. پیسی كرد، هەموو شتێكی لەم وڵاته گۆڕی به هاربوونو شێتییەتیو ڕقو كینه كه تەواو ڕۆحو دڵەكانی ژەنگاوی كردووه، هیچ سەردەمێكی ئێمه ئەوەندەی ئەمڕۆكه ڕەش نەبووه، باڵەخانه بڵندەكانو پرده تۆكمەكان بناغەیان لەسەر فرمێسكو خوێنی خەڵكێكی بەشمەینەته نەک لەسەر بەردو چیمەنتۆو ئاسن ..

تۆ وات مەزەندە دەکرد شووم کردووە بە بەرپرسێکی دەوڵەمەندو خۆشبەختم، من لە ماچەکانی هەستم بە تامی تووتنو ئەو ژەهرەش دەکرد کە لە خوێنیدا دەگەڕاو مەیی بوو، دواجار کە لەناو جێگادا کەوتو ساڵو نیوێکی خایاند .. ناچار خۆم خزمەتم کرد، یەکەمجار بەقەد ڕەشکەکایەک ئەستوور ببوو .. دەئاوساو دەپەنما، دوای دوو مانگ پەیکەری ئێسقانەکانی دەردەکەوتن، ئەوەندە لەسەر پشت کەوتبوو گۆشتی سەر هەردوو کۆڵنجیو قەبرغەکانی هەڵدەوەرین، مووی برۆکانی، ڕیشو سمێڵیو سەری، هەردوو چاوی کە تا دەهات چاڵتر دەبوونو جگە لە من کەس نەیدەوێرا سەیریان بکات، لە دوا قۆناغەکانی دەردەکەی تکای دەکرد کە کەس نەیبینێ، بەدەم گریانی بێ فرمێسکەوە گلەیی لە بەختی خۆی دەکرد کە بۆچی لەو سەدەها شەڕە گوللەیەک سەر دڵی نەسمیوە .. ئەوکاتەی وەک پڵنگ هەڵمەتی بردۆتە سەر سەنگەرەکانی دوژمن، تکای لە منیش دەکرد کەسێک بەکرێ بگرم تاوەکو خزمەتی بکات، ساڵێک بەر لە مەرگی نەمهێشت لە ئاوێنەکانەوە سەیری خۆی بکات، ئەوەی کە ئەم پیاوەی جوان کرد پەشیمانبوونەوەی بوو لە هەموو ئەو شتە ناشیرینانەی لە ژیانی خۆیدا کردبوونی، تا فرمێسکی نەما هەر دەگریا، گوایە جوانیو میهرو وەستانی من لەتەکیا وای لێکرد ببێت بە ئینسان، دەگریا کە چۆن بەناوی خیانەتکردنەوە برادەری خۆی کوشتووە، سەربازی دیل کە بەر لەوەی گوللەباران بکرێت بۆ دایکی دەگریا .. ئەو پیاوە نیوەمردووە

دەگریاو دەیوت ژنێکم کوشت کەگوایە لەشفرۆشەو دەستی لەگەڵ بەعسییەکان تێکەڵا کردووە، کۆڵانەو کۆڵان لە دەستم ڕایدەکرد، منداڵەکانی بەدەم زریکەو هووڕەوە کەوتبوونە دوای منو دایکیانەوە، دەگریانو دەپاڕانەوە .. مامە مەکە .. مامە توخوا مەیکوژە .. کە ڕاوەدووم دەنا سۆلەکانی بەجێمان، عەباکەی لە قاچو قۆڵییەوە ئاڵاو ساتمەی کردو لەپەو ڕوو کەوت، تاوێک لێی نزیک بوومەوە، جارێک هەستایەوەو ڕەتی بردو زەمبیلەکەی دەستی کەوتە خوارێو چی تەماتەو باینجانو سەلکە پیاز هەبوون بەو ناوە وەربوون، ئاوڕێکی لە من دایەوەو وەک بێدەسەڵاتترین ژنێکی ئەم دونیایە بە هەزارچاوی پڕ لە پاڕانەوە کە خۆی لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا لە بەرامبەر پیاوێکی خوێنخۆردا بدۆزێتەوە.. سەیری کردم، کوشتم بێئەوەی بزانم ئەو پەیامەی شۆڕش کە پێمگەیشتووە ڕاستە یان درۆ .. گوایە دەستی لەگەڵ سیخوڕەکان تێکەڵ کردووە و خیانەتکارە، منداڵەکانی لە پێچێکی ناو ئەو کۆڵانەدا وێل ببوون، لە دوورەوە لەگەڵ شەقژنی گوللەکانی مندا گوێم لە هاوارو زریکەیان بوو، بە هەشتاو بەسەر تەرمی ژنەکەدا بازمداو لە پێچێکی تردا خۆم ونکرد ..

پێم سەیر بوو ئەو زەلامەی کە بە درێژایی تەمەن تفەنگی تەقاندووە وەها ناسک بووبێتەوە، لە هیچە سۆز دەیگرتو دەگریاو دەیوت بۆچی بەختم نەبوو زووتر تۆ بناسم، کە دەیخواردەوە پتر فرمێسکی

دەباراندو دەیوت پەشیمانم لە زۆر کارو کردەوەی خۆم کە لە قەڵای ئەو سەروەرییەم کەم دەکاتەوە، پتر لە هەر شتێک کوشتنی ژنەکان ئازاری دەدا، لەوەدا نە لە گریان ژێرم دەکردەوە نە دڵم دەدایەوە .. هەرگیز .. دەمزانی گریان کەمێک گەردو تۆزی سەر دڵی دەشواتەوە، کەمێک ڕۆحی پاک دەکاتەوە، دەگریاو دەیوت: ئاخۆ منداڵەکانیان چییان بەسەر هاتبێت؟ بێوەژن یان کچ و ژنی بە مێرد بوون..؟ نازانم.. کێ دەڵێت ئەو خانمانە موستەهەقی مردن بوون؟!
لەناوەوە ڕێزم دەگرت کە شەرەفی ئەوەی پێبەخشیوم لەو جەنگەم دژی ئەو میرانەی جەنگو بازرگانانی خوێن نەوەستم، گەرچی بۆنی مەرگ لە منو دارو دیوارو پەردەو ڕایەخو تابلۆکانیش دەهات، بەڵام هەر ئامادەبووم میزو گووی ئەو پیاوە پاک بکەمەوە تەنها لەبەر ئەوەی بڕوای بەوە بوو کە ئەم شەڕەی من ڕەوایە، لە هەموو هاوڕێکانی شارو شاخی تۆرا کە سووسەی ئەوەی دەکرد دژی من وەستاونەتەوەو دەستیان لەو کاولکارییەدا هەیە، ئەگەر شووکردنی منت بەلاوە نەنگییە تۆ خۆت بیری لێ بکەرەوە کێ منی گەیاندە ئێرە؟ دواجار لەو خوێنو فرمێسکەوە زۆر شت فێربووم، توانیم دەستو پەنجە لەگەڵ ژیانو مەرگدا نەرم بکەم، ئەگەر ئەوەیان جوان بێ یان ناشیرین .. کێ لە هەموو ئەو چیرۆکانە بەرپرسیارە؟ کێ وای کرد بەدیار لاشەی زەلامێکەوە پاسەوان بم..؟ لە سووچێکی دڵی خۆمدا قەرزارباری ئەو زاتەم کە نەیهێشت کەس بەو نهێنییەم بزانێت، من نامەوێت دادگاییت

بکەم لەسەر هیچ، نامەوێ بتخەمە گۆشەیەکەوە، بەڵام تۆ ئامادەی دوای ئەو قیامەتەش بە کەس‌و کار بڵێیت من بووم ئەو ژنەم ئاواهی بەدبەخت کرد، شکەستەباڵ بەجێمهێشت‌و وەک مەلێکی پاشوو بەستە خستمە قەفەزێکەوە..

تەنها نەخۆشی‌و دەردێکی گران یان دۆڕانێکی جەرگبڕ وا دەکات مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ خۆیی‌و دونیا بگۆڕێ یان هەتا تێکبچێت، ئێمە هەردووکمان وا بووین‌و زۆر لە یەکدی دەوەشاینەوە، ئەم پیاوە لەشی ژەهراوی ببوو .. منیش ڕۆحم، ئەم سیاسەت خوێنی پیس کرد .. منیش بە ژەهری خۆشەویستی تیا چووم.. تەنها ئەوەش وایکرد کە جیاوازی تەمەنمان مانایەکی نەمێنێ، من وەک کچێکی بێ بن بەتەنها یەک نهێنیم بۆ ئەو پیاوە درکاند، کەچی ئەو نهێنی هەموو ژیانی خۆی ڕشتە بەردەمم، سەرەتا هەستم کرد وەک هەر پیاوێکی ئێمە حەزی لە گێڕانەوەی چیرۆکی ئازایەتی خۆی بوو کە ئافرەتێک سەرسام بکات، کەچی زۆر زوو زانی ئەمەیان حەزو مەراقی گەورەی من نییە، ئیدی کەوتە گێڕانەوەی سەرلەبەری مێژووە ناشیرینەکەی خۆی وەک ئەوەی بە سەلیقەی خۆی هەستبکات ئەوەیان پتر وای لێدەکات لە لای من بە ئینسان بچێ گێڕانەوەی هەقایەتی ناشیرینی و شکەستەکانییەتی، نامەوێ باسی هەموو نهێنییەکانی ئەوت بۆ بکەم، چونکە هەقایەتێکی درێژەو جگە لەوەی هەستم کرد کە حەز دەکات تەنها من بیزانم، باسی خاو و خێزانی خۆی، هاوڕێکانی لە بازرگان‌و پێشمەرگەو سیاسەتبازو

نووسەرو هونەرمەندو پیاوماقوڵانی شارو ئاغاو بەگلەرو تا دەگا بە ڕەشە خەڵکەکەو هەر هەموو شێتەکانی کە ئەم لە هەر چینو توێژێکی دیکە پتر خۆشی دەویستن، دواجار دەفتەرێکی گەورۆنەی قەرزاری دامێ وتی ئەوەیان یاداشتەکانمەو دوای نەمانی خۆم گەر حەزت کردو زانیت هیچ مانایەکی هەیە وەک ئەزموونی بنیادەمێک بڵاوی بکەرەوە .. گەر نا بیسووتێنە ..

من وام لێهاتبوو هەستبکەم جەستەی ئەو درێژکراوەی جەستەی منە لە دارِزانێکی تەواودا، جەستەی نیشتیمانو شۆڕشێکە کە هەر هەموو خۆزگەو خەونەکانی دەباتە ناو گۆڕێکەوە، یاداشتەکانیم خوێندەوە کە داستانی خوێنبەربوونێک بوو لەنێوان براکاندا، زۆر کوشندەتر لەو خوێن بەربوونەی من.. شەڕێکی ئەبەدیو خوێناوی لەسەر میراتێک کە نییە، یاداشتەکانی بە زمانێکی زۆر سادە نووسیبوو، بەڵام سەفەرێک بوو بەناو جەهەننەمدا، هەر بۆیە بە ئەرکی خۆم دەزانی پاسەوانی بکەم تا واملێهات تەواو ڕاهاتم، بەو هەموو خەمو ناخۆشییەوە مەرگی ئەو پیاوە بۆشاییەکی گەورەی بۆ دروستکردم، پیربوونی ئەو زەلامەو مردنی جگە لە مردنو پیربوونی خۆم لە شوێنێکدا هیچی دیکە نەبوو، یەکەمجار پەنجەکانی دەستی ڕاستەی لە جووڵە کەوتن، پەنجەی دۆشاومژەی تەواو سڕبوو کە ئەو دەیوت پەنجەی شایەتمانە، دەیوت هەر لە تەمەنی جحێڵیمەوە هەزاران جار ئەم پەنجەیەم خستۆتە سەر پەلەپیتکەی جۆرەها تفەنگ بڕنەوو کلاشینکۆڤ، دووبارەو دە بارەی

دەکردەوە کە هەرگیز باکی بە مەرگ نییە، چونکە کە دەمریٚ دوا شت تا چاو لێک دەنێت تارمایی من دەبینیٚ، خەمی لەوە دەخوارد کە دەمریٚو تێری لە جوانی من نەخوارد، دەگریاو شەرمی لە خۆی دەکرد کە شێرە پیاوێکی وەک ئەم لەناو جێگادا بۆگەن دەکاتو من دەیبینم، لە تەریقی خۆی هەمیشە لە ژێر پەتۆو لێفەدا خۆی دەشاردەوەو لە ژێرەوە بە دزییەوە هەنسکی هەڵدەدا، وەک پیاویش خەفەتی لەوە دەخوارد کە پێخەفەکەم ساردوسڕە، دیارە ئەم نەیدەزانی کە من دەمێک ساڵ بوو بیٚ زەوقو خەیاڵو مردارەوەبوو بووم، جارێکیان پیموت کە چۆن خەتەنە کراوم.. شینی حەسەن و حوسێنی بۆ کردم.. پێموت ..مەگری .. لەوە کوشندەتر ئەوەیە رۆحم خەتەنەکراوە..هەر لەو ڕۆژەی کە بە خاو و خێزانەوە تا سەر سنوور هاتینو تۆمان بەڕیٚ کرد ..!

ئەوەندە نووشتابوومەوە بەسەر ئەو پیاوە دەردەدارە بۆ لاواندنەوەو دڵدانەوەی کە بۆنی خوێناو و میزو تووتنو ژەهری مار تا ئێستاکە لە هەناسەم دێت، لە دوا دوو هەفتەی بەر لە مەرگی فریا نەدەکەوتم کە پیسایىو پاشەڕۆک لە ژێریدا پاک بکەمەوە، هەمیشە تەنیا بوومو بێجگە لە دایکە پیرەکەی خۆم کەسێک نەبوو لە کەسو کاری خۆمو هۆمەر کە بێزی بێت سەر بەم ماڵەدا بکات ، بۆن بۆگەنی دەگەیشتە ناو حەوشەی دەرودراوسێکان، لاشەی نیوە مردووی دادەڕزاو هێدی

هێدی خۆی دەبوو بە پاشەڕۆک کە مەحاڵ بوو بۆم کۆبکرێتەوە، بەڵام هەر دەبوو ئاگام لێی بێتو.. هێزێکم بوو کە ناکرێت ئەو خەمە بمکوژێ، لە دەرەوەش هەوڵمدەدا کە ئاگام لە نەخشەی گڵاوی چەتەکان بێت، دەمزانی بۆیان بکرێت لە هیچ نامەردییەک سڵ ناکەنەوە، بەڵام پاسەوانەکانم کە دڵسۆزی مەرحووم بوون بە هەق کوڕی ئازاو جوامێر بوون، هەڵبەت ئەو نامەردانە بۆ ناو زڕاندنم هەقایەتی سەیریان بۆ دروستکردم ..

گرفتی گەورەی منو ئەو پیاوە ئەوەبوو کە بە تەنها دیوی دەرەوەی یەکدیمان نەدەبینی، بەڵکو ناوەوەی یەکدیمان دەبینیو دەمانزانی چی لە دڵو دەروونی هەر یەکەماندا دەگوزەرێ، یادەوەری تاڵو ترسی تەنیا کەوتن، من نەمدەتوانی ئەو پیاوە بگێڕمەوە ناو ژیان، نەمدەتوانی ڕزگاری بکەم، بەڵام وای لێکردم قووڵ لە سیاسەتو خۆشەویستیو خیانەتو مەرگ ڕابمێنم، دواجار لەزەتم لەوە دەکرد کەوتوومەتە ناو ئەو دەردو بەڵاو خوێناوە، گەرچی ئازارو تلانەوەی مرۆڤێک دەیکوشتم، من ببوم بە پەرستاری مەرگ.. دواتر زانیم کە چ پەیوەندییەکی قووڵ و مێژوویی لە نێوان ژنەکان و مەرگدا هەیە.. هەمیشە ئێمەین کە دەبین بە پەرستاری پیاوە دەردەدارەکان..خودا هاوار چ میحنەتێکە کچبوون و ژنبوون...! گەورەترین وانە کە فێری بووم ئەوە بوو کە لە هیچ نەترسێمو پشووم درێژتر بێ، لە هەمووی کوشندەتر ئەوەبوو کە ماوەی سێ مانگی بەر لە کۆتایی ژیانی بە

تەواوی کوێر بوو، پتر ڕۆحیو دڵی ناسکتر ببوون ..
پڵنگو هەڵۆو مارو مێرووی سەر زەوی ئاسوودەترن، جگە لە مرۆڤ هەر هەموو ڕۆحلەبەرێکی تر لەناو زەریاکانو لە ئاسمانو لە ژێر زەوی زۆر بەختەوەرترن لە ئێمە، چونکە ئەو چاو و ڕۆحە شک نابەن، چاو و دڵو ڕۆحێکیان هەیە بێ بیرکردنەوەو خەیاڵو یادەوەری، هەر بۆیە گیاندارەکانی دیکە هەرگیز بەرپرس نین لە لاشەو مەرگی یەکتری ..گوایە ئێمە تا ماوین ناچارین ئەو سزا ئیلاهییە بچێژین ..لە مەرگ و خوێنەوە نزیک بین.. مادامەکێ فریوی شەیتانمان خوارد و ئێوەمان لە بەهەشت وەدەرنا..چونکە ..گوایە گەر لەوێندەرێ بووینایە .. نەدەمردین...
ئەم بەناوی سیاسەتەوەو لە پێناو سیاسەتدا ژەهراوی بوو .. مرد، منیش بەناوی خۆشەویستییەوە، هی هەردووکمان هەر ژەهراوی بوون و داڕزانی ڕۆحو لەش بوو، ڕەنگە پێت سەیر بێو بە غەزەبەوە سەیرم مەکە، کچێکی «بێ بن» لەم وڵاتەی کە پیاوەکانی شێتی پاکیزەن، شێتی هەموو شتێکی دەق نەشکاوو تەقەت و داخراو و جوانو تازەو سەرمۆرن بە عارەقو ئافرەتیشەوە .. دەبێ چاوەڕێی چی بکات؟ ئەو پیاوانەی لەزەت لەوە دەبینن خۆیان قاپی عارەقی سەرمۆر بکەنەوە و پەردەکان بتەقێنن .. تۆ دەزانیت مێردەکەم جارێکیان نهێنی دوو لەو پیاوانەی بۆ گێڕامەوە کە دەمیان پڕ لە دروشم بوو کە لە شەوی هەشتی مارت بە یادی ڕۆژی ژنانەوە لەسەر تەلەفزیۆن دەمهەراشو بە

نەڕە نەڕەوە لەسەر ئازادی ئافرەتو پیرۆزی ئەو ڕۆژە قسەیان دەکرد، کەچی دوو کچی جوانکیلەیان خراپ کردبوو، پاشان کەس نەزانم پەردەکانیان بۆ دووریبوونەوە تاوەکو بێ مەترسی شوو بە زەلامی تر بکەن، لە دوای ڕاپەڕینەوە پتر لە هەر وەختێکی تر دوورینەوەی پەردەی کچێنی بازاڕی گەرمە، خانمێک کە لە ڕۆژنامەیەکدا دیداری لەتەکدا کراوە شانازی بەوەوە دەکات کە لەم چەند ساڵەی دواییدا هەزار کچی بێ بنی لە مەرگ ڕزگار کردووە، دیارە هەر کچێکی بێ پەردە کە بەدەست پیاوێکی نەوسنو گەلۆرەوە ئەتک کراوە چاری نییە جگە لەوەی ئەو ناجوامێرە پەردەکەی بۆ پینە بکات..هەرزانە..چەند سەد دۆلارێکەو رادەستی سستەرێکی لێزانی دەکەن و کەسنەزانم پینە دەکرێت، تۆ دەتویست من خۆم بگەڕێم بەدوای ئەم پینەو پەڕۆکردنە .. پاشان بۆ؟ تەنها بۆ ئەوەی سەرسەلامەت شوو بە پیاوێکی تر بکەم .. دیسانەوە چۆنو بۆ؟ پاشان تۆ پێمبڵێ با دوورینەوەی پەردەش ئاسان بێ، ئەی دوورینەوەی پەردەی ڕۆحو دڵ کە دڕابێت لە کام کوچەی بەرگدرووەکانو پەردەدرووەکان بۆی بگەڕێین؟ من بۆ خۆم کە دیداری ئەو سستەرەم خوێندەوە، زانیم کە هەقییەتی شانازی بەخۆیەوە بکات کە نەیهێشتووە ئەو پیاوە ملهوڕانەی بنەماڵەکان پێبزاننو بیانکوژن، ئەو پیاوانەی وا تێدەگەن ناوگەڵی ئەو کچانە سێگۆشەی «بەرمۆدایە»و چی جامانەو کڵاو و خەنجەرو تەزبیحو چی شەرەفو ناو و موڵکو ماڵیان هەیە ئەو سێگۆشەیە ..هەر هەمووی

هەڵدەلووشێ ..

دەزانم تاساوی‌و لە دڵی خۆتدا لێکی دەدەیتەوە کە بۆ وا بێ پەردە قسە دەکەم‌و داخدارم، قسە لەسەر خەمی پەردەو بەفیڕۆچوونی نیوەی ژیانم .. نا .. دەکرێ بڵێم هەموو ژیانم، چونکە ئەوەی وتم خەم‌و قەهری هەفتەیەک نییە، ترس‌و دڵەڕاوکێ‌و ڕۆح سووتانی شەوێکم نییە، با بچم هەندێکی دیکە لە ئەلبوومی نیگارو سکێچەکانمت بۆ بهێنم کە نەتدیون‌و بە خوێن‌و فرمێسک ڕەنگ کراون، وەرەو هەندێک لەو تابلۆیانەم ببینە کە کانڤاسەکانی ڕۆحی داپۆشراوی منە بە دەیەها ڕەنگ، هەر هێڵێکی خوارو شکاوی شکانی ساڵانی تەمەنمە لەناو قەدەوە، بیانبینە کە پڕە لە پیاوی ڕاوچی، کە ئافرەت‌و ئاسک وەک یەک ڕاو دەکەن، پڕە لە خەندەی خوێناوی کە ئەگەر «داڤنشی» بمایەو ئەم ڕۆژگارە بژیایە شەرمی لەخۆی دەکرد چوار ساڵ بەدیار خەندەی شیرین‌و دەگمەنی «مۆنالیزا»وە ڕابمێنێ‌و ڕەسمی بکات .. هانێ بگرە .. پڕ لەو پەپوولە مردووانەی کە تۆ بە منداڵی ڕاوت دەکردن، لەو باڵندە کوژراوانەی مێردەکەم نیشانەی لێ دەگرتنەوە، لەو کەناری‌و بوولبوول‌و کۆترانەی ناو قەفەز‌و کولانەکان کە باوکم‌و براکانم خوویان پێوەگرتبوو ..

ئەوەی تۆ لە مندا کوشتت.. خۆشەویستی بوو، ئەوەی تۆ لە مندا ڕشتت بەتەنها تنۆکێک خوێن نەبوو لە ژێر کەپرەکەدا، چەندەها شەو دوای سەفەرت ئەو تنۆکە خوێنە بڵقی دەکردو دەپەنماو گەورەو

گەورەتر دەبوو، لە خەونەکانمو لە خەیاڵی ڕەشمدا دەبوو بە زەریایەکی خوێن کە لە شەپۆل بە یەکدادانو گێژەنی شێت نەدەکەوت، منیش بە بەلەمێکی شەقو شڕەوە دەمویست بگەمە کەناری نەجات، زۆرجاران بەسەر کەڵەکێکەوە سەوڵم لێدەدا، هەندێک جاریش لەناو زەریای خوێنی خۆمدا بێ سەوڵ خۆم دەبینیو شەپۆلێک بەلەمەکەمی سەرەو ژێر دەکردو لەناو خوێنی ڕژاوی کچێنی خۆمدا دەخنکام، لە ترسو تاوی خنکان بە ئاگا دەهاتمو تا بەیانی دەگریام ..

دانیشەو گوێ بگرە .. بە مەزاقەوە دەپرسی کە بۆچی شووم بەو پیاوە پیرو نەخۆشو خوێناوییە کردووە؟ کێ بە کچێکی بێ بن قایل دەبێ کە بیەوێت ڕسوابوونی خۆییو باوکو براو ئامۆزاو خاڵۆزاو پوورزاو چی نێرەوزەی قەومو قەبیلە هەیە بیشارێتەوە؟ ئابڕووتکانو شەرمەزاری ئەبەدی دایکو خوشکەکانمو گشت کچانو ژنانی بنەماڵەو خێڵی خوێنخۆر ..چ خوێنێک دەیشارێتەوە؟ کێ دەمو زاری پڕ لە واتەواتی ئەم گەڕەکەو گەڕەکەکانی تر دادەخات؟ خۆ کوشتنیش نەیدەتوانی ئەو پەڵەو ماکە لەسەر تەوێڵی نێرینەکانی هەردوو بنەماڵەکەمان بشواتەوە .. دەنا خۆم دەکوشت، تۆ تەنها تنۆکێک خوێنت لە مندا نەپژاند خاڵۆزا، تۆ سەرچاوەی جۆگەلەیەک لە خوێنت لە مندا تەقاندەوە کە نەمدەزانی بەراوەکەی بەرەو کام بیابان بگۆڕم، ڕەنگە لە چاوی تۆدا دڵڕەق دەربکەوم، بەڵام چاوەڕێی چی لە ژنێکی تەنیا دەکەیت کە لە نێوان مەرگو ژیاندا هەمیشە جۆلانەی کردبێ؟

من تا کەی ئەو مەرگە بە دوای خۆمدا ڕابکێشم کە تۆو ئەوانەی گوایە منیان خۆش دەوێ بەسەر مندا سەپاندیان، من پتر لە زیندانی دەچم، ئەو ئازارەی لە مندا وەک گەردەلوول ڕۆحم بە ئاسماندا دەبات لە من نادوێ بە تەنیا .. لە خودی ئازارەکەش نادوێ .. گەر درۆت لەگەڵ نەکەم لە تۆ دەدوێ .. لە عەزابێک کە تۆ بەئاگا یان بێئاگا لە مندا بەجێتهێشت، ئارەزووییەکم نەماوە لە زیندانێکدا بژیم کە هەر هەموو ئەو کەسانەم لەگەڵدا بێ کە زیندانەکەیان بۆ دروست کردووم، دەزانم کە هەموو کەس‌و کاری من‌و تۆ زەندەقیان چووە لەوەی بێوەژنێکی جوان‌و جەحێڵ بەتەنیا لە خانوویەکدا دەژی‌و کۆمەڵێک کوڕوکاڵی بەناوی پاسەوانییەوە ڕاگرتووەو بوونەتە باخەوانی باخی سینەی، هەموو ئەم قسە پڕووپوچانەم پێدەگاتەوە، بێباکم‌و شادومانم بەو تەنیاییەی خۆم، تۆش بۆ ئەوە هاتوویتەوە ئەو بێوەژنە ڕزگار بکەی لە پێناو حەیاو حورمەتی بنەماڵەکەو یان بەناوی خۆشەویستییەک کە چاوەڕوانی‌و خەم‌و خوێن کوشتی، ڕاستی نەخۆشی‌و مەرگی ئەو پیاوە گەورەترین ڕووداو بوو بۆ من کە هەموو ئیقاعی ژیانمی گۆڕی، تەنیایی پاش نەمانی شەو و ڕۆژانێکی زۆری پێبەخشیم کە لە خۆم ورد ببمەوەو خستمیە ناو تێڕامانێکی قووڵ، لەوە دڵگران مەبە گەر بڵێم ئێستاکە من لەناو جەرگەی هێمنی‌و هەم هەرایەکدا دەژیم کە ڕاهاتووم‌و چێژی لێ دەبینم .. بەتایبەتی هەراو هوریای ئەو جەنگەی فێری گەمەی هێزو ململانێی کردم، هاتنەوەی تۆ بەم درەنگ وەختە

پەرێشانم دەکات .. وەک ئەوە وایە گاشەبەردێک هەڵبدەیتە ناو گۆمێکی مەنگ ..

تۆ بەتەنها پەردەیەکت لانەبرد خاڵۆزا، تۆ ڕووتت کردمەوەو بێ سیپاڵو پۆشاک بەجێتهێشتمو وتت دەی ئازابەو بۆ خۆت بژی، بۆیە لە دونیایەکدا هەر هەمووی چاوەو سەیرت دەکاو بەدوای خاڵێک، پەڵەیەک، هەقایەتێکی ناشیرینی ئافرەتێکدا دەگەڕێ، ئەو ئافرەتە هەر کەسێک بێ گرنگ نییە .. بەمەرجێک ژنو خوشک یان دایکی ئەو پیاوانە نەبن، قسەزان بووم .. وانییە؟ دوای ئەو هەموو ساڵانە شیاوە یان نا؟ نیگارکێشانو کتێبەکانی تۆ کە بۆت بەجێهێشتم .. ئەو شەڕەی خۆم تێفرێداوە فێری زۆر شتیان کردم، خۆ تۆ حەزت دەکرد زۆرزانو ئاوقاتو ئازا بم ..! وا مەزانە رقم لێتە..نا.. لە شوێنیکی رۆحی خۆمدا دەزانم منیش لەو گەمە خوێناوییەدا لەگەڵتا هاتم..بۆ هاتم؟ دەزانم کە خۆشەویستی بوو ئەم قەسابخانەیەی دروست کرد.. سەیری ئەو چوار تابلۆیە بکە کە کچێک لە ژێر هەر چوار وەرزەکەدا، زستانوبەهاروهاوینوپاییز، بە تەنیا وەستاوەو چواردەوری چۆلەوانییە، ئاسۆیەکی خوێناوییەو ڕەشەبایەک چۆن زیواڵ زیواڵ جلەکانی لەبەردا دادەکەنێ، ڕووتو قووت لەناو بروسکەو باراندا جێدەمێنێ، ڕەشەبا قژی دەسکەنە دەکاتو لە پایزێکدا کەچەڵی دەکات، لە هاوینێکدا سووتاوەو تەنها پەیکەری ئێسقانەکەی ماوەتەوە، لە زستانێکدا باو و بۆران دەیشواتەوە، لە بەهارێکدا هەموو دەشتەکە سەوز بۆتەوە ..

کەچی ئەم بە تەنها وەک قەدی وشک هەڵاتووی درەختێک بێ لقو پۆپو گەڵاو چرۆ بە پێوە مردووە، من نەمدەویست بەناو ئەم ڕووباری خوێنەدا لەگەڵ خۆمدا سەفەرت پێبکەم، من سندووقێکی داخراو و تەقەت بووم، کەوتبوومە بنی زەریایەکەوە، سندووقێکی پڕ لە نامەو پەیامی نهێنی، پڕ لە دڵی کوژراو و چاوی کوژاوەو ڕۆحێکی مردوو، پڕ لە ورێنەو ڕازو حەزو خۆزگە کە کەڕەکیفەیان هەڵێنابێت، من خۆزگەم بوو بچمە سەر سەکۆیەکی بڵندو هەموو ئەم هەقایەتە ڕەشو جەهەنەمییە بۆ هەمووان بگێڕمەوە، لە تابلۆکانمدا ئەو خەونو خەیاڵو ختوورە تاریکانەی خۆم ڕەسمکردووە، بەڵام خۆزگەم بوو هێزم هەبێو بینووسمەوە، من وامدەزانی کە تەنها خۆم تەنیاو دۆڕاوم، بەڵام بڕوات بێ .. دواجار خەمی سەدەها کچو ژنی دیکەم بیستو بینی، ئیتر شەرمم لە خۆم کرد ئەوەندە بکڕووزێمەوەو بلاوێنمەوەو سەردولکە بۆ دەردی خۆم بڵێم، بە ژنێکی کینە لەدڵو دوژمن بە پیاوم بزانیت یان نا .. گرنگ نییە، بەڵام ئێرە مەملەکەتی قەیرە کچو بێوەژنە تەنیاکانە .. مەملەکەتی ئەو کچانەی گەر زۆر بەختەوەر بن کڕینو فرۆشتنیان پێوە دەکرێت وەک ئەوەی لە بازاڕەکانی «عوکاز»بن، هەر هەمووشی قوربانی دەستی باوکو مێردو براکانو کوڕەکانن، پرسیارەکانت وەک نەشتەربوون کە نووکی تیژی گەمەی لەناو برینەکانم دەکرد، گەمەیەکی خوێناوی، تۆ هاتیتەوە مەعشووقەکەت قورتار بکەیت، بەڵام تەندوورەکانی دۆزەخت ئاگرداو .. کوورەکانیت پتر جۆش دا...!))

دەبوو هیچ یەکێک لەم پرسیارانە نەکرێن، دەستەکانیو لێوەکانی پێکەوە دەلەرزین، نەیدەتوانی ئەو قوڵپی گریانە ڕابگرێت کە گەرمو سەرکردوو لە شوێنێکی پەنهانەوە دەهات، ئەو شوێنە نە دڵ بوو .. نە ڕۆح، لە سەرچاوەیەکەوە دەهات کە مەحاڵ بوو خۆیشی پەی پێ ببات، هەرچی بوو بێت .. گەر بەوپەڕی خامۆشیشدا تێپەڕیبا سەرلەبەری حیکایەتی عیشقو دۆڕانەکەی بیرکەوتەوە، کۆی چیرۆکی دابڕانو تەنیاییو مەرگو جەهەننەمی جەنگێک لە دەرەوەو جەنگێک لەناوەوە کە ئاسان نییە ژنێکی تەنیا لەم وڵاتەدا بەرگەی بگرێت، هیچ نەیدەویست .. پێویستی نەدەکرد هیچ کامیان هیچ بڵێن، هەرچی دەوترا هەڵکۆڵینی برینێک بوو، گەمەی نووکی خەنجەر بوو دەنێو دڵدا، لابردنی قەتماغەی برین لە دوای برین، دوای ئەو هەموو دەردو خوێنە .. ئەو قیامەتە .. چ خۆشیو خولیاو خەونێک ماوە؟ چەندە لەو دوو ڕێبوارە دەچن کە لە هەمان وێستگەی قەڵەباڵغدا بن، کەچی لە یەکدی وێڵ ببن، هەریەکەو سواری شەمەندەفەرێک بێت کە تا ئەوپەڕی دونیا .. دوور دوور بیبات کە هەرگیز گەڕانەوەی نەبێ، دوو شەمەندەفەر بە پێچەوانەو ناتەریب بازۆنو بە درێژایی هێڵە ئاسنینەکان هەزارەها دڵی ئاشق بهاڕن. کەس نەیدەتوانی ئەو بێدەنگییە بشکێنێت کە وەک دەستبردن وابوو بۆ قەڵایەک لە مینا، کە بتەوێت لە بنەوەڕا یەکێک لە میناکان دەربهێنیت، زۆر بە خشکەیی، کە بووەتە یەکێک لە بناغەی قەڵای میناکان بێئەوەی بڕووخێت، ئەو ماڵە هێشتا

بۆنی نەخۆشیو مەرگی لێدەهات، هەناسەی پیسی دەردەدارێک وەک هەڵاوێکی بۆگەنو خەست بە هەموو کەلو پەلەکانەوە نووسا بوو، هەتا ئاوێنە بازنەییو گەورۆنەکەی ژووری نووستنی تەڵخ کردبوو، ناڵەو کۆکەیەکی خنکاو لە قوژبنێکەوە دەهات کە بواری هیچ حەزو تاسەو یادگاریو هۆگربوونو تەماسێکی شیرینی نەدەدا لەنێوان ئەو دوو کۆنە یارەدا، کزۆڵەو داماوتر لە نەخۆشێکی هیوابڕاو، خامۆشتر لە مردوویەک لەوێداو لەسەر کورسییەک کەوتبوو، تەنیاو ئافەرۆز، خامۆشتر لە گاشەبەردێک لە بن گۆمێکی لیخنو قووڵ، نەیدەزانی ئاخۆ بڕوات یان چاوەڕێی ڕازێک، درکاندنی نهێنییەک، گفتێک یان موعجیزەیەک بکات، گەر بڕوات چۆن هەستێتو لەکوێوە بڕواتە دەرێ، کتومت لەوە دەچوو کەوتبێتە ناو قەڵایەکی سەد دەرگاو ڕاڕەوی پڕ لە پێچو لوول .. یان توونی بابا، هەستانو جوڵانو هەنگاونانو زارکردنەوە بەنیازی ماڵئاوایی لە گواستنەوەی کێوێک گرانترە، ئەمەیان دڵڕەقترین دیمەنێکە کە تەنها لە فلیمەکاندا بینیوییەتیو لە هەندێک ڕۆماندا خوێندوویەتییەوە، کە پاڵەوانی بەرامبەر ئەوەندە بێئاگا بێت کە نەزانێت میوانێکی هەیەو لە هەمان ژووردا چاوەڕێی وشەیەکی لێدەکات، چاوەڕێی هەر جووڵەو هەناسەو نیگاو ئاوڕدانەوەیەک، چەندە غەریبن بە یەکدی، هەر چاوەڕێیەو ..کەچی هیچ، چرکە بە چرکە هەستی دەکرد میوانێکی ئێسک گرانە، وەک بەندکراوێک کە لە دوا ساتەوەختی ئازادبوونیدا پەیامێکی پێبگات

کە هێشتا بەقەد سالآنی زیندانی پێشووتری.. مەرجە لە بەندیخانەدا بمێنێتەوە، بێئەوەی وازی لێبێنن کە لە حەوشەی بەندیخانەکەدا هەناسەیەکی پاک هەڵبمژێت، بەڵام خۆ ئێرە زیندان نییە، ماڵێکەو دەرگاو پەنجەرەی تێدایە، کەسیش دەرگاکانی دانەخستووە، ئەمەیان تا ئەوپەڕی غەمهێنە، تەنها شتێک وادەکات بەرگەی سووکایەتیو ئەم کەمبوودییە بگرێت وەڵامی پرسیارێکە کە سەدەها میلی بۆ بڕیوەو دەیەوێت لە دەمی ئەو خانمەوە گوێبیستی بێت، بۆ وەک پاڵەوانی فلیمەکان بە تووڕەییەوە پیاوانە هەڵناستێتو شەقێک لە مێزەکەی بەردەمی هەڵنادات یان هەر شتێکی دیکە لەو ناوەدا، شراق ..شراق.. دەرگاکە بەدوای خۆیدا دابخاتو بێ ئاوڕدانەوە بڕوات، بێ ماڵئاواییو گلەیی، بێ باوەشو گریانو خواستی بەخشینو ئاشتبوونەوە .. بۆ؟ چەندە خۆی شکەستەباڵو بەزیو دەبینێ، چەندە پیرو پەککەوتەو لاڵ، پێشبینی دەکرد دیدارەکە وەک سەرشانۆیەکی پڕ هەراو هوریاو دراما پڕ بێت لە دەمەتەقێی گەرمو گوڕو نەبڕاوە، پرسیارو وەڵامی یەکتربڕ، ڕستەی درێژ کە کۆتایی نەیەت، پڕ لە گەڕانەوەی بۆ دوێنێو سەد بەڵێن بۆ بەیانی، چ فێڵێکەو چ هێزێکە وای کردووە ئەو ئافرەتە ئەو هەموو قەهرو خامۆشییە بکاتە میوانی سێیەمی ئەم ماڵە؟ چ نهێنیو چ ڕازێکە؟ هەتا گەر واش بێت .. چی ئەمی وا دەمبەست کردووەو زاتی ئەوە ناکات هەوای ئەم بێدەنگییە بلەرزێنێت؟ لەناکاو بۆنی سووتانی شتێک دێتو تا دێت پتر هەوای سەر سەری هەردووکیان

پەڕدەکات لە بۆنسۆ، دەترساو نەیدوێرا بپرسێ ئاخۆ چی لەسەر ئاگرەو دەسووتێت، هێشتا خانمی ماڵ بێئاگایە، بۆکرپوورێکی کوشندە گێژی دەکرد، تەمو دووکەڵێک تاو تاوە بەرچاوی تاریک دەکرد کە نەهێڵێت ڕوونو جوان دەمو چاوی ببینێت تا بزانێت بێباکە یان ئەویش ترسێک لە نیگاکانیدا دەخوێندرێتەوە، تاو تاوێک هەوای بالکۆنەکە لەو تەمو دووکەڵە پاک دەبۆوە کە شنەبایەک دەهاتو دەیبرد، لاو و نیو وەستابوو، زەحمەتە بزانێت چی لەو ڕووخسارەدا خۆ دەنوێنێ کە هێشتا وەک جارانی شیرینە: ڕق، تۆڵە، خەم، خۆشنوودی، گومان، ترس یان تاسە .. چی .. تا دەهات دووکەڵێک لە ژوورەکانەوە دەهاتو لەناو دەرگای کراوە بەسەر بالکۆنەکە چڕتر دەبۆوەو بەسەر هەوایەکی خنکاوەوە هەردووکیانی لوول دەدا، کە دەقاودەق پتر بە دەوری ئەمدا چڕ دەبۆوە، وەها چڕ کە بکۆکێت،پاشان وردە بەدەم باوە و بەو ئاسمانەوە شی دەبۆوە، دەستی برد بۆ پەرداخەکەی بەردەمی، کەچی ئاوی تێدا نەبوو، سووڕاحی ئاوەکەش لەسەر مێزێکی دیکە بوو کە سێ هەنگاوی دەویست بیهێنێت، شەرمی دەکرد ئەو سێ هەنگاوە بنێت، چەند جارێک ویستی هەستێت، کەچی وەک ئەوەی ئیفلیج بوو بێت نەیتوانی ڕاست بێتەوە، خانمی خانەخوێش هێشتا لاو و نیو وەستابوو لە منارەکە ڕادەما، کتومت وەک ئەوەی لە بالآی عاشقەکەی بڕوانێتو تاس بیباتەوە، لەوە دەچوو بێباک بێت یان زۆر ئەستەم بێت ئاوڕێک بداتەوەو ببزوێت تاوەکو بزانێت چی دەسووتێو

ئەم دووکەڵە لەکوێوە دێت، ئەم میوانەی لە دوور وڵاتەوە هاتۆتەوە بۆچی دەکۆکێو دەخنکێ، ئەوەندە کۆکی کە نەیدەزانی چاوەکانی پڕبوون لە ئاو لە تاوی دووکەڵەکە یان بە قەهرو خەمێکەوە لەتاو خامۆشی ئەو خانمە ڕووی تێناکاو وەستاوە بە هەردوو چاوان دەگری، ئەوەندەی لە خانمی ناو تابلۆیەک دەچوو کە بە دیار منارەیەکەوە ڕاماوە.. ئەوەندە لە حەقیقەت نەدەچوو، کە سەری هەڵبڕی ڕێک لەسەر دیوارەکەی بەرامبەری تابلۆیەکی گەورەی بینی کە تا ئەو حەلە سەرنجی ڕانەکێشابوو، کە دووکەڵەکە دەرەوییەوە ڕوونتر تابلۆکە دەردەکەوت کە نیگاری وەستانی خانمێکی ڕەشپۆش بوو بەدیار باڵای منارەیەک کە سەری دەیدا لە هەورەکانی ئاسمان، تۆ بڵێیت ماڵەکە گڕ بگرێتو کەچی خانمی ناو تابلۆکە هەر نەجووڵێت هەروەک خانمی ناو بالکۆنەکە، دەکرێت خۆشەویستی ئەو منارەیە بایی ئەوەندە سەرمەستی کردبێت کە نەخوازێت لەناو توانەوەی ڕەنگو هێڵەکاندا نەیەتە دەرەوە، بێباک لە دووکەڵو گڕەکە کە لە ژوورەکانەوە بە خشکەیی بێتو پاشان بەدەم لرفە لرفەوە گەمارۆیان بداتو هەر ئەوەندە فریا بکەون کە لە بالکۆنەکەوە خۆیان فڕێ بدەن، نا .. خانمی ناو بالکۆنەکە وەها عاشقانە وەستاوە لە بەرامبەر منارەکەی کە مەحاڵە باکی بە سووتان بێت، زۆر بێ خەمتر لە خانمە ڕەشپۆشەکەی ناو نیگارەکە، هێشتا دووکەڵەکەیەو چواردەوری خانمی ناو تابلۆکەی تەنیوە، گوێبیستی قرچە قرچی سووتانی شتێک بوو کە مەحاڵ بوو

بزانێت چییە، لەوەدایە گڕەکە بە ترسو شەرمەوە یان فێڵەوە دزە بکاتو پاشان بە هەزاران پەلو پۆی کڵپەو بڵێسەوە زمانی بگاتە هەموو شتێکو هەرچی هەیە هەڵیلووشێت کە ئەم فریای هەڵاتن نەکەوێت، فریا نەکەوێت ئاوڕ لە ماڵێکی سووتاو بداتەوە کە بێوەژنێک تیایدا ئاگری تێبەر دەبێت، بێگومانە لەوەی کە تا دێت سیپاڵی بەری دەبێت بە دووکەڵ، خەریکە ڕەنگەکانی ناو تابلۆکە لەبەرچاوی تێکەڵ دەبن یان دەتوێنەوە، هیچ کامیش لەو دووانە ناجووڵێنو خامۆشن، ئاخۆ گوێکانی بە دەنگێکەوە دەزرنگێتەوە یان هەر بەڕاستی یەکێک لەو دوو ئافرەتە بە چرپەوە کە خەمو فیگاری لێ دەتکێت دەڵێت:

((ئەوا .. من ڕۆیشتم!))

ئەم بەدەم کۆکەوە ویستی هەستێتو بڵێت:

((ئاخر .. بۆ کوێ؟))

بەڵام وەها دەکۆکی کە نەیدەتوانی قسان بکاتو زار بکاتەوە نەبا دووکەڵێکی زۆرتر بچێتە خوێنییەوە، ماوەیەکی زۆر کورت مابوو بۆ ڕستەیەکی ناتەواو کە بەرلەوەی لە زاری بکەوێتە خوار .. بمرێت، ڕستەیەک بە وتنی و زارکردنەوە دووکەڵەکە بیخنکێنێت، بە نەوتنی خەمو قەهرێک بیکوژێت، ڕستەیەک کە لەناو سووتاندا .. لەناو دووکەڵدا هیچ مانایەکی نەبێت، ڕستەیەک کە بەتەنها چەند وشەیەکەو بیری چۆتەوە، کەچی داڕشتنەوەی لەوە گرانترە کە خەیاڵی بۆی دەچێت ..کە ئەگەر وەک ئەکتەرێک نەیەتەوە یادی..هەر هەموو دیالۆگەکە

نایەتەوە زەینی ، مەگەر بگەڕێت بۆ ڕستەیەک .. ڕستەیەکی حەکیمانە تاوەکو نەبێتە گاڵتەجاڕی بەردەم بینەرانی خۆی، بە ئاستەم گوێی لە ڕازێکە یان خەیاڵی خۆی درۆی لەگەڵدا دەکات ..

( (نیازت چییە .. بەر لە سووتان چیت هەیە بۆ وتن؟))

کۆکین لێنەدەگەڕا هیچ بڵێت .. دووکەڵ لێنەدەگەڕا هیچ ببینێت .. دەیوست پڕ بە دونیا هاوار بکات .. بەدەم نووزەیەکەوە دەخنکا.

( (منیش .. وا ژەهراوی دەبم ..!))

دەنگێک بە ترسو شەرمەوە لەناو دووکەڵەکەوە دەهات دەیویست دڵنیابێت کە دەنگی خانمی ناو بالکۆنەکەیە یان لە غەیبەوە دێت .. کە بە چرپەوە دەڕژایە ڕۆحییەوە ..

( (ئەوە گەر تۆ پێشتر .. بەر لە ئێستا ژەهراوی نەبووبیت!))

خەمی ئەم ڕازە وەک قورقووشم ڕژایە گوێچکەکانییەوەو لەوێوە بۆ ناو هەناوی جۆگەلەی بەست، لە حەیبەتی ئەم ڕستەیە وەک حەیوانێکی کێوی کەوتە سەر هەر چوار پەلانو تەکانی دەدا بگاتە دامێنی خانمی بێباک لە ماڵی سووتاو بەسەر لەپی گڕەوە، بە ئازارێکەوە وەک کەڵەکێوییەک لە ژێر چەقۆدا بێت دەیقرخاند کە هەمان دەنگ هاتەوە ..

( (درەنگە .. بانگم دەکات .. من دەڕۆم ..!))

لەپی دەکوتاو کوێرئاسا نەیدەتوانی دەرگاکە بدۆزێتەوە .. دەیویست بڵێت ..

((خەریکە دووکەڵ بگاتە خوێنی دڵم ..))
کەچی کڵپەیەک وەک چۆلەکەیەکی سووتاو لەسەر زمانی نیشتەوەو نەکرا هیچ بڵێت .. دیسانەوە گوێی زرنگایەوە بەو دەنگەی مەحاڵ بوو ئاراستەکەی بزانێت .. وەلێ دڵنیابوو دەنگی ئافرەتێکە کە دووکەڵو خەم ڕەشی کردووە .. گڕو کەرخ ..
((هەموو گەڕەک دەسووتێ ..!))
ڕووەو بالکۆنەکە لەسەر هەر چوار پەل دەخولایەوەو دەستی دەکوتا تاوەکو بگاتە دامەنی تارمایی ئەودیوی دووکەڵەکە، گومانی لەوەدابوو کە ئاخۆ ئەمەیان ڕژانی چڕی تاریکی شەوێکی ئەنگوستەچاو بێت یان دووکەڵ، کەچی هێشتا منارەکە ڕۆشن دەدرەوشایەوە وەک ئەوەی چرایەکی گەورۆنە بەسەر سەرییەوە پرشنگان بهاوێژێت، یان مانگ تەواو نەوی بێتو خۆی بکات بە کڵاوی سەری ..
((تکایە فریام کەوە .. دەرگاکە لەکوێوەیە؟))
لەوێدا کەسێک نەمابوو .. شتێک نەمابوو بۆ وەڵامێکی وا سادەو هەم مەرگهێن ئامادەبێت، شتێک دەسووتا بێئەوەی هیچ خۆڵەمێشێک لەدوای خۆیەوە بەجێبێڵێت، بێئەوەی ئەو خانمە بترسێتو بلەرزێت یان وەک هەر ژنێک بداتە هاوارو قریشکەو باوکەڕۆ .. یاخود کە پارچە پەڕۆکێک لە ماڵەکەدا گڕدەگرێت زۆر بە تاو و تینەوە گەر جامە ئاوێکی دەست بکەوێت پڕی بداتێ بەنیازی کوژاندنەوە بکەوێتە هەڵەکەسەما، شتێک بوو لە ناوەوە دەسووتا یان لە دەرەوە؟ بۆنەکە لە سووتانی

گۆشت دەچوو یان پەڕۆو پاتاڵ، بۆ تاوێک دووکەڵەکە تەنکتر بوو .. بڵند بەسەر سەریانەوە دەڕەوییەوە، بۆنسۆکە کەسکوونتر .. گوێی زرنگایەوە بێئەوەی دڵنیا بێت کە دەنگی وا مەحاڵە لە ئادەمیزادێکەوە بێت، کە نائومێد بوو لە گاگۆلکێ گەیشتن بە دامێنی خانمی فریادڕەس، ڕاستەپێ هەستایەوەو ڕێک کەوتە بەردەم خانمی ناو تابلۆکە .. وای لە سەرسامی .. ئەو ژنە ڕەشپۆشە ئاشکرا لێوەکانی دەجووڵان .. چرپەی ڕازەکە وەک تۆزی ڕەنگەکان دەڕژان ..

( (دەمێکە دەسووتێ .. هیچ نییە .. دڵێکەو دەسووتێ ..!))

نەدەکرا بڕوا بە چاوەکانی بکات .. دەبوو تا زووە لەو جەهەننەمەی تێیکەوتووە دەربازی بێت ..

( (دەرگاکە کوانێ .. لەکوێوە دەرچم؟))

وەک مەلێکی بێزارو شێت دەنێو قەفەزێکی بەرتەنگو هەناسەکوژ کە بەدەم باڵەفڕێوە خۆی بدا بە قەفەزدا.. خۆی دەدا بە دیوارو جامخانەو کەلو پەلەکاندا ..

( (ئێرە جێبێڵە .. درەنگە منارەکە بانگم دەکات.))

( (بۆ کوێ بچم .. لەکوێوە؟))

( (ئەوێندەرێ ..))

( (ئەوێندەرێ .. کوێیە .. ئەوێندەرێ؟))

( (من دەڕۆم .. بانگم دەکات ..!))

( (من ڕێ دەرنابەم .. خەریکە دەخنکێم.))

ئیدی تەواو..خەون بێت یان خەیاڵ.. راچەنی و تەم و مژێک قولانج بە قولانج دەڕەوییەوە..هیشتا بۆنسۆیەک ناو باڵکۆن و ئاسمانی سەر سەریانی تەنیبۆوە..دووکەڵ هەردوو چاوەکانی میوانی ناوەختی تاریک و لێڵ کرد.. ئەمجارەیان چڕی دووکەڵەکە لە کەلاوەکانی خوارەوە رووەو ترۆپکی منارەکەو بالکۆنەکە هێرشی دەهێنا.. کە هەست و خوستی نەماو خامۆش بوو،خانمی خانەخوێ وەها ڕۆچوو بووە ناو خەیاڵ کە هەستی نەدەکرد کەسێک لەناو بالکۆنەکە دانیشتووە، ئەلبوومی باڵندە کوژراوەکانو پەپوولە هەڵوەریوەکانو منارە قیتو چەماوەکان هەڵبداتەوە، ئازارێکی کوشندە وەک مار بەناو دەمارەکانیدا لەگەڵ تەوژمی خوێندا بە پێچو لوول ڕێگەی خۆی دەکردەوە تاوەکو کەڵبەی ژەهراوی لێ گیر بکات، دوای ئەو هەموو هەڵکۆڵینە لە ڕۆحو یادەوەری خۆیدا، گەڕانەوە بۆ ئەو هەموو شوێنو ڕۆژو مانگو ساڵانە، چوونەوە بۆ سەر یەکەمین زریکەی لەدایکبوونو یەکەمین فرمێسکو یەکەمین دڵۆپە خوێنو یەکەمین ماچو یەکەم دابڕانو یەکەم دۆڕان .. وەک سەفەری ڕووبارێک وابوو بەناو دۆزەخدا، گۆڕەوشارێک بوو کە یەکەمین شیری مەمکی دایکی بەدەم ڕشانەوەیەکەوە بە دەم و لووت بهێنێتەوە، یەکەمین تف، یەکەمین جنێو، یەکەمین چاوسوورکردنەوە، یەکەمین سەر شکانو دڵشکانو ڕۆح شکانو چاوشکان، لە قوژبنێکی پەنهانی ڕۆحیدا گومانی هەبوو لە هەر هەموو مانا شاراوەو ڕازو نیازی

ئەم وڕێنەی خۆی .. مەحاڵ بوو تێبگات هەڵدانەوەی قەتماغەی برینەکانیو ئەو خوێن بەربوونە چی لە زیندەگی ئەم دەگۆڕێت، ئەم بە سەرو هەردوو دەست لە دەرگایەکی داخراوی دەدا کە ئەگەر بشکرێتەوە.. هەر بەسەر کەلاوەدا دەکرێتەوە .. بەسەر دۆزەخێکدا کە دەمێک ساڵە بۆ ئەم لە جۆشدایە، ئەو زەلامە بە درێژایی ئەو دانیشتنە زۆر بەگرانو هێواشی لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە، وەک ئەوەی بترسێت باڵندە کوژراوەکانو پەپوولە هەلا هەلابووەکان بە خوێنو پەڕوباڵو تۆزی ڕەنگەکانەوە، بە چریکەی خنکاوەوە، بە دەنووکی قرتاوەوە لەناو ئەلبوومەکانەوە بێنە دەرێو گەمارۆی ئەو پیاوە رێکپۆش و شیکە بدەن کە وەک میوانێکی شەرمنو غەریب هۆ لەوێ دانیشتووەو هەناسەی لەخۆ بڕیوە، شپرزەییو نیگەرانییەک دەشارێتەوە هەر وەک ئەوەی لەوە بترسێت نیگاری منارە لاربووەکان هەر بەڕاستی بەسەر ئەودا بڕووخێنو لە ژێر داروپەردووی منارەکەدا بخنکێ، نەیدەزانی بیر لەچی دەکاتەوە، دوای ئەو خوێن بەربوونە بۆ چ وەڵامێک دەگەڕێ، هەر قسەو وەڵامێک مردووترە لەوەی لەو بالکۆنە دەری بکات، لە ڕامانی بەرامبەر ئەو منارەیەی کە چاوەکانی ئەم قیتو سەرکەش دەیبینێ، هەوایەکی گەرم لە دەرەوە بوو یان لەناو سینەی پڕ لە جۆشوخرۆشی ئەو خەمە پەنگخواردووەی کە جۆگەلەی سەر بڕبڕەی پشتی پڕکرد بوو لە ئارەقە، لەزەتی لەو شنەبایە دەکرد کە هەمیشە خەیاڵی خۆی بێت یان راستی ..بۆنی کوێستانەکانی دەهانی

.. بۆنی گەڵاو گوڵو چرۆو بەفری نەتواوەی سەر ترۆپکی چیاکان، سەیرە کەسێک لەوێداو لەسەر کورسییەک دانیشتووەو تەپڵەکەکەی پڕکردووە لە ئاغزە جگەرە، تەنها دوو هەنگاو دوور .. کە هەتا ناتوانێت ناوی بنێت کۆنە یار، هەر وەکو ئەوەی نەهاتبێتەوەو هێشتا لەودیو کێوەکانو زەریاکانەوە گیری خوارد بێت، هەر وەک ئەوەی ئەمەیان خەونێک بێو هیچی دیکە، گەر وا نەبێ مەحاڵە دونیا ئەوەندە خامۆش بێت، ماقووڵە منارەیەک لە پیاوێک پڕ ئەفسوونو جوانتر بێ کە ساڵانێک لەمەوبەر ئاشنای ببوو، منارەیەک قیتو قۆزو ڕاوەستاوتر بێ..؟ ئێستا هەست دەکات درۆی لاربوونەوەی منارەکەو ڕووخانی بیانوویەکی ئەو پیاوە گرگنو هەمیشە کڕنووشبەرانەیە کە ڕقیان لە وەستانو سەربڵندییە، هەر لە سۆنگەی سەنگینی ئەم بڵندییە گەرەکە بیڕووخێنن، چ هەوایەکی پڕ لە غوربەتە، منارەیەک سێبەری گەورەو چڕی ئەم پیاوە کزۆڵەو خامۆشو لاڵەی کە چەقیوەتە ناو کورسییەکەی .. تەواو تاریک کردووە .. تاریکتر لەوەی لە تارمایی جیابکرێتەوە، پیاوێک کە ناوێرێت سەر بڵند بکاتو تۆزێک لەو منارەیە بڕوانێتو بزانێت چ فەزایەکی داگیرکردووەو خۆ ئەگەر ڕاستە کەمێک لاربۆتەوە، هی ئەوەیە بەڕێزەوە سەر نەوی دەکا بۆ خانمێک کە بەتەنیا دژ بەم هەموو بۆرە پیاوانەی شار جەنگاوە، لاربوونەوەیەکە لە پای شەرمێک کە بێوەژنێکی قەشەنگ پشتی لەو هەموو مێردە گولەو عاشقە ساختەبازانە کردووەو چاوی بڕیوەتە ئەم .. ئەمەیان

چ جوانییەکو چ ئازایەتییەکە کە شایستەی نەک لاربوونەوەو کەمێک سەر نەوی کردنە، بەڵکو شیاوی هێلانەیەکە لە گوڵ دامەزراو لەسەر ترۆپکی خۆی، شانشینێک بەو ئاسمانەوە، ئەوەندە سەری هەڵبڕی بۆ منارەکەو لە بالآی ڕوانی کە تەواو دڵی خاو بۆوە، نەیدەتوانی ئاوڕ بداتەوەو سەیری میوانی دووروڵات بکات، چیتر بەپێوە خۆی ڕانەدەگرت، خەیاڵێکی ماندوو یان خەوێک کە سەرەتای بانگێک بێت بۆ مەرگو تیاچوون بانگی دەکرد، هاوارێکیش لەناو هەناوی منارەکەوە بانگی دەکرد بۆ ڕابوونو مانەوە، شتێک وەک مینایەکی ناسک لە ناوەوەیدا وردوخاش دەبوو، دەتوت لەم ماڵە کۆنینەدا خۆی بۆتە ماڵێک بە هەزار پەنجەرەوە کە هەرهەمووی بەیەکەوە لە ترسی بوومەلەرزەیەک هاڕە دەکەنو دەشکێن، ڕەشەبایەکی شێت دێتو هەموو شتێک دەبات، برووسکەو باو و بۆرانێک، وەیشوومەو ئافاتێک، هەر هەموو هەقایەتی عیشقو سەفەرو هاتنەوەی ئەم پیاوە بەم درەنگ وەختەو مەرگی پیاوێک لەم ماڵە .. بێوەژن کەوتنی .. هەر هەمووی .. تاکە شتێک کە لەم خەوە بەئاگای بێنێت وەستانییەتی لەبەردەم ئەم منارە خۆشەویستەی، بەڵام هەتا ئەوەشیان نزیکترە لە خەیاڵ، ئاوڕێکی دایەوە تاوەکو دڵنیا بێت کە قسەی بۆ کەسێک دەکرد .. گرنگ نییە ئەو کەسە کێیە، ئەویش لە منارەکە ڕامابوو وەک ئەوەی بوونەوەرێکی زیندوو بێت، لە چڕی سێبەری منارەکە بەسەر ڕووخساری ئەمدا .. زۆر ئەستەم بوو نیگاکانی ببینێ، نینۆکەکانی

خۆی دەخواردو جار جار سمێڵی خۆی دەکرۆشت، ڕەنگە لەوە داخدار بێ کە عاشقانە نەیگرتە ئامێز ..

((کە باڵەکانم نەمابن .. چی بگرمە ئامێزم؟!))

ئەم هاتۆتەوە سەر خەرابات، لای بێوەژنێکی تەنیا کە لەوەتەی جەنگەکەی ڕاگەیاندووە بۆ هەمیشە وا هەست دەکات وا بەسەر منارەکەوە وەستاوەو هەرگیزاو هەرگیز دانەبەزیوە، ڕووتو قووت، هەر هەموو خەڵکی شار خڕبوونەتەوەو لە خوارەوەڕا سەیری دەکەن، سەرسامو واق وڕماو .. چاوەڕێ، دیسانەوە وەک هەموو دەمەو ئێوارەیەک یان شەوێک خەیاڵێک باڵەفڕەی پێدەکاتو تاوەکو سەر منارەکە هەڵیدەگرێو سووکێ دەنیشێتەوە، دونیا تاریک داهاتووە کەچی خەریکە هەتاو بەو بانی منارەوە دەیسووتێنێ، خەون بووبێت یان ڕاستی .. دوای لە هۆش خۆ چوونو وەئاگاهاتنەوەی ڕۆژێکی وا ژیاوە کە هەموو ئازارو قەهرو ترسو دڵەڕاوکێو ڕسوابوونێکی کۆی تەمەنو زەمەنێک لە خۆیدا چڕ دەکاتەوە، ئەوکاتەی بەسەر سەرییەوە سەدەها کۆتر ڕیقنەو شاپەڕو گەندەپەڕیان بەسەردا دەباراند، هاشووهوشی باڵەکانیان کاسی دەکرد، هەڕەشە دەکاتو سوێند دەخوات کە ئەگەر واز لەو منارەیەو گەڕەکەکە نەهێنن خۆی هەڵدەداتە خوارێو .. چش لەوەی کە کەللەی کاسو پڕ لە ژاوەژاوی بەسەر گاشە بەردێکەوە دەپژێت، چش لەوەی دەمرێو چیرۆکێکی بریندار کە لە تنۆکێک خوێنەوە سەرچاوەی گرتو بوو بە ڕووبارێکی خوێنین کە

تیایدا وەک پووشو پەڵاش سەرئاو کەوتووەو نازانێت دەکەوێتە ناو چ گێژەنێکەوە، دەنگۆی ژنێکی ڕووت بەسەر منارەوە وەک ئاگری ناو پووشو پەڵاش تەشەنە دەکاتو لە چاوترووکانێکدا بە هەڵەداوان حەشاماتێک گرد دەبێتەوەو ئەڵقاو ئەڵق چواردەوری منارەکە دەگرنو گەمارۆی دەدەن، کەسانێک لە بڵندگۆکانەوە بە ترسەوە هاوار دەکەن .. کەس سەرنەکەوێت .. کەس توخنی ئەو ئافرەتە نەکەوێت، هەمووان ڕووەو بڵندایی سەر هەڵدەبڕن .. تکایە کەس لە منارەکە نزیک نەبێتەوە، ئاپۆرەی عەزازیلێکەو .. تەجاڵەو هاتووەو هێرشی ئاجووج و ماجووجە.. بەناو یەکدیدا دەقژقژێن .. هاتو هاواری پۆلیسەکان لەناو شەڕو گێچەڵی لاوە تووڕەو تۆسنەکان کە لە هیچە قاقا لێدەدەنو شەڕە جرت دەکەن، هۆڕنی ئۆتۆمبێلەکان گیرخواردو لەوبەر جادەکە، ڕاکەڕاکو داڕژانی سەدەها کوڕیژگەی عەلاگەفرۆشو مەکتەبلی، واقەواقی قەمەرەی پۆلیسەکانو ناڵەی جەرگبڕی ئیسعافەکان، شاتەشاتی چەند ژنێکی عەبا بەسەر.. ئەیەڕۆ ژنینە خۆ حەیامان چوو، زریکەی ئۆتۆمبێلی ئاگر کوژێنەوە، پیرو گەنج.. هەر هەمووان بە ڕۆحێکی ئاهەنگسازییەوە هاتوونەتە سەیرانی ئەو بەزمەی کەسیان نازانێت ناوی چییە، هەر هەمووان حەز دەکەن کە ژنێکی ڕووت ببینن کە وا بەسەر ترۆپکی منارەکەوە مانی گرتووەو دانابەزێت ..خۆزگەیانە بیبینن، هەر لە داخی ڕماندنی منارەکەش خۆی عیبرەت کردووە، تا ئێستا کەس شتی وای نەکردووە .. کوا لە کوێیە؟ دیار نییە .. ئەیەڕۆ

خوشکینه .. براینه .. لەوەتەی ئەم شارە هەبووە ئەوەیان یەکەمجارە ژنێکی بەحەیاو حورمەت خۆی بکات بە پەندی زەمانە، وانییە خەڵکینە .. خوا بناسن .. درۆو دەلەسەیەو .. دوژمنەکانی بۆی هەڵدەبەستن، گوایە داوای کردووە سەرۆک خۆی نامەیەک بنووسێ کە پەیمان بدات ئەو ملۆزمانە واز لەو منارەیە بهێنن، نا .. داوای کردووە سەرۆک خۆی بێت، قسەی قۆڕ سەرۆک ئیشو کاری نییە بۆ دەڵەقۆڕێکی وا بێتە ناو ئەم شێتخانەیە، تازە کەللەیی بووەو دانابەزێتو یەکێک دزە بکاتو سەربکەوێت، خۆی فڕێ دەدات .. هەرزەکاران ئەم تێکقژقژانە بە هەل دەزانن تیلک بە کچو ژنەکانەوە دەکەنو بیژمۆتانە تەکان دەدەنو خۆیانیان پێوە دەنووسێننو بەلاقرتێوە دەڵێن .. نیعمەتی خوایە ژنێکی ڕووت بەو ئاسمانەوە بفڕێو بکەوێتە باوەشی یەکێکمان .. با باوەشی من بێ هیچم نەدیوە .. ئای لە کوڕی فاتە دۆمێ .. خوشک عەرەبانە ئێمە چیمان دیوە؟ بڕواتان بێ کوڕینە .. خۆی هەڵبداتە خوارێ لەتو کوتی نامێنێ .. هەر بە ئاسمانەوە وەک پۆڕی ژێر چنگی هەڵۆکان دەخورێت .. قوڕ بەسەری .. مەگەر بن ددانی چی نێرەوزی ئەم ناوەیە بگەڕێین .. خواش نایدۆزێتەوە، هەر هەموویان تەقەللا دەدەن لە دەروازەی بنەوەڕا بچنە ناوەوەو سەربکەون، هیچ نەبێ بە ڕووتی ببینن، کە خۆی هەڵداوێت سەدەها پیاو و کوڕوکاڵ باوەشی بۆ دەگرنەوە، یەکێک هاوار دەکات، لێیگەڕێن .. لەو بێوەژنە عەزرەتییە قەستی ئەوەیەتی بکەوێتە سەر ڕەپو ڕەقان نەک نەرمان، وای لە

عاجباتی ئاخرزەمان خوشکینە، ژن‌و کچە ئەلمۆدەو عەبا بەسەرەکان خۆ لادەدەن نەکا خوێنی پیسی ئەو بێ دەرپێیە بێ نوێژیان بکات .. سەرت بە تاشین چێ قەحپەی گلاو، چاوتروکانێک‌و دەبێتە هەزار کوتە گۆشتی وردو جنراوی ژێر دەست‌و پێی پیاوەکان‌و تۆلازەکان، تۆپەڵە مووی بابردوو لێرەو لەوێ کە هەرزەیەک بە دوایدا ڕادەکات، ئەمەیان چ هەقایەتێکی درۆزنە، چ خەیاڵێکی ڕەشە، چ مۆتەکەیەکە، شارێکی شێت‌و پڕ لە هەقایەتی درۆو واتەوات، منارەی چی‌و ئافرەتی ڕووتی چی، هەر هەمووان دەگەڕێن ئاسەوارێک نادۆزنەوە، هیچ شتێک نەماوە، تاڵە موو .. لەتە گۆشتی جنراو و کوتراو و خوێنی وشکەوەبوو بەناو لەپی تەڕو ئارەقاوی پیاوەکان‌و هەرزەکانەوە ماوەتەوە، ناکرێت ئەوەی بوو .. هەر هەمووی هەقایەتێکی درۆو هەڵبەستراو بێت، چیرۆکی ژنێک کە نزیک بەم منارە نیمچە داڕووخاوە ماڵێکی بووە، هەقایەتی ئەو هەموو داروپەردووە بەسەر یەکدیدا کەڵەکە بووە، کەلاوەو گووفەک‌و سەرەنوێڵکی پڕ لە پشیلەو سەگی تۆپیو، خشتی کۆنینەو داڕزیو کە لە ژێر پێڵاوی سەدەها پیاو و کوڕوکاڵی بێ ئیش‌و منداڵی سەرکەو بنکە دادەڕزان‌و دەبوون بە خۆڵەپۆک، هەر هەموو دەگەڕان بۆ شتێک .. هەر شتێک کە نەزانن چییە، دەڵێی خەیاڵی چیرۆکنووسێکە .. منارەی داتەپیو و شەڕی بێوەژنێکی تەنیا چی دەسەلمێنن، هەر دەڵێی داستانێک بووە .. ئەفسانەیەک لە دێرزەمانەوە دەماو دەم ئەم بۆ ئەوی دەگێڕێتەوە، هەر هەقایەتبێژێک و رستەیەک

و دووانی خستۆتە سەر..برێکی دیکە لە فانتازیا.. هەموو کەس لەم شارەدا بۆ خانوویەکی کۆن دەگەڕێ، بۆ بالکۆنێکو کوڕە لاوێک، کۆنترین باڵەخانە لە کۆنترین گەڕەکی ئەم شارە، دەگەڕێن .. خەمخۆرانو دۆستانی هونەر بۆ ئەلبوومی مەلە کوژراوەکان، پەپوولە پیرو هەڵوەریوەکان، مینیمالاّ و کۆتەڵی چکۆلەو گەورۆنەی منارەکان .. تابلۆی جێماو و بێ ناوەکان .. بۆ پیاوێک کە لەناو ئەو بالکۆنەدا بە درێژایی ئەو ڕۆژە بینراوەو کەچی لەناکاو لە ژێر تەمو دووکەڵێکی چڕدا ونبووە، میوانی ناوەختو کەس نەناس، شەڕانیو دەم بە هاوار کە وای کردووە خانمی خانەخوێ دە جاران لە شەققەی باڵ بداو وەک کۆترێکی هەڵەتە کە هەڵۆیەک ڕاوی بنێتو خۆی فجووق بکات ڕووەو منارەکە، هەر جارەو خۆی بە دیواری منارەکەدا دەداو دوا جار خۆی بۆ نەگیراوەو گێژەلووکەیەک لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی، دە جاریش شکستەباڵ کەوتۆتەوە بن دەستو پێیان، لە ترسو تاوی مەرگ هێزو تەکانێکی دیکەو باڵەفڕەیەکو کەوتنەوە لەسەر لەپی «با»و وەک پەڕەمووچێک لەنێوان منارەو بالکۆنەکە گێژی خواردووە، لەناو حەوشەکەدا هۆمەرو باوکو براکانی سایلی ئەو خەڵکە، عاشق بە یاهوویەکی وا سرک نیشانەی لێ دەگرنەوە، مەحاڵە نەیپێکن، پڕ بە ئاسمان دەچریکێنیو گمەی خوێناویو گەندەپەڕو شاپەڕەکانی پێکەوە دادەبارێن، ئەوە خودایە گمەی غەریبی کۆترە خۆشەویستەکەی ناو هێلانەو قەفەزەکانی خۆیان بناسنەوە، پاسەوانەکانیش کە هۆمەر

دەبینن غیرەت دەیانگرێ .. نەکەن وا بیپێکن کە بمرێ، تەنها گڕی ساچمەکە بیخاتو بەس، ئەوەندە دەترسێت کە تا دێت بچووک دەبێتەوە، بچووکو بچووکتر .. هەر بەقەد پەپوولەیەکی نەخشینی لێ دەمێنێتەوە، ڕووەو بالکۆنەکە باڵا لێکدەداتو بەهرام هیچ گەورە نەبووە، هێشتا هەر منداڵەکەی جارانەو لەناو بالکۆنەکەو بە ژوورەکاندا ڕاوی دەنێ، دەشزانێت گەر بیگرێ وەک سەدەها پەپوولەی دیکە دەرزی ئاژنی دەکاتو ناچار بەسەر ئەو تابلۆیە دەنیشێتەوە کە هەر هەمووی پەپوولەیەو ئەوە خوایە نەیدۆزێتەوە .. پەپوولەی پیرو باڵ هەڵوەریو. شەو نییە ئەو مۆتەکە نەیگەیەنێت بە مەرگو زیندووی نەکاتەوە، ڕۆژ تێناپەڕێت گۆڕەوشار نەدرێت، هەر دەبێت ئەم عەشقە ڕووتو شێتانەیە بۆ منارەکە سووڕی هەمیشەیی شەهادەت بێت کە دەماو دەم خەڵکی شارێک بۆ یەکدی دەیگێڕنەوە، زیندوێتی ئەو بێت لەسەر زارانو پاشان بوون بە ئەفسانە، ئەفسانەیەک کە تەنها پیروخەڕۆکان بەدەم وڕێنەو خڵەفانێکەوە بۆ یەکدی دەیگێڕنەوە، هەقایەتی خۆهەڵدانی ژنێک ، یان بە پەیکەربوونی ژنێکی ڕووت کە وەک فریشتەیەک باڵەکانی کردۆتەوەو ترسێک لە مەرگی خۆییو ڕمانی منارە خۆشەویستەکەی لێناگەڕێت بگاتە سەر زەوی، یان ترسی منارەیەو ناهێڵێت شۆخێکی شەیدا بە باڵای ئەمدا بکەوێتە بن دەستو پێی ئەو حەشاماتەی تفو نەفرەت دەنێرن بۆ ژنێک کە ئابڕووی شارێکی بردووە، هەر ئەو ترسو تۆقینە باڵای بە منارەکە دەکرد تا

سەری بیدا لە عەرشی فەلەک، کە دەیزانی لە خوارەوە کوڕگەل، خورتو هارو هەوەسباز، شەڕیانە لەسەر ئەوەی دەکەوێتە باوەشی کامەیان، ئەفسانەکە دەڵێت بەرلەوەی فجووق بکات قژی پڕو پەخشی تا دامێنی منارەکە درێژبۆتەوەو نێرەوز بە گەنجو پیرەوە بە هەزار دەستەوە خۆیان هەڵداوە تا پرچی دەسکەنە بکەنو زووتر دایگرنە خوارەوە، منارەی تاین چەندین گەزی دیکە هەڵکشاوە، قژی پەخشو پڕی وەک هەورێکی ڕەش سێبەرێکی چڕو تاریکی ئەو حەشاماتەی لە یەکدی وێڵو پەشێو کردووە، وەلێ هەندێک سوێند دەخۆن کە خۆ هەڵدانەکەی جگە لە خەیاڵێک هیچی دیکە نەبووە،هەندێکی دیکە سوێندی قەڵەوتر دەخۆن کە خۆی هەڵداوەو کەوتۆتە بن دەستو پێی سەدەها مەزنو منداڵ، کە گەڕاونو هەر یەکەو توند بە هەردوو دەست گەرەکی بووە بیگرێتە ئامێز، کەچی جگە لە تارماییو سێبەری پەرتو هەڵاتووی خانمێک هیچی دیکەیان نەدیوەو نەگرتووە، ئانو سات تارمایی پڕو بەرجەستەی ئەو وەک فریشتەیەکی تووڕهەڵدراو لە ئاسمانەوە هەر هەموو پیاوە نەوسنەکانی بە شەوارە خستووە، هەر هەموو ڕەنگەکانی بەهەشت لە چاوەکانیدا پڕشنگی داوەتەوە، سەدەها گەنج بە هەڵەداوان بەدەم بای غارەو دۆخینو قایشو پانتۆڵەکانیان کردۆتەوە، بەدەم کەفە ژیلکەی لەلالێوەوەو شەهوەتێکی هەڵچوو لە خوێندا وەک (قەومی لووگ) پەڕوباڵی فریشتەکەیان هەڵپرووکاندووە، بە سەدەها پیرو مەلاو فەقێو دەروێش بەدەم زیکرو تەهلیلەو هایووهوو

.. زرمو کوتی دەفەکان کە بە ئاسمانەوە دەخولانەوە .. زرم و کوت نەیانهێشتووە کەس تێبگات ئەم قیامەتە لەپای چی هەڵساوە، چ هاتو هاوارو دادو فیغانێکە .. خودا هاوار .. وەک «قەومی لووت « تەفرو تووناماں نەکەی .. خودا ئەوەیان چ زەڵاڵەتێکە .. چ کوفرو چ حەرامێکی گەورەیە کە قیامەت نزیک دەخاتەوە، دەرگاکانی بەهەشت کلۆم دەداو .. هەر هەموو دەرووەکانی جەهەننەم سەر واڵا، گەرچی سەروەختی نوێژ نییە .. بۆ دەرکردنی ڕۆحی شەیتان لەم ناوەدا با لە هەموو مزگەوتەکانەوە بانگ بدەین، بە هەردوو دەست چاوانیان دەگرن .. هەتا زووەو گڵاو نەبووین ئەو کچی ئیبلیسە لەم ناوە دووربخەنەوە، لە بڵندگۆکانەوە دۆعاو ئیستیغفارو ئیستکبارو گریانو سەڵەواتو ئایەتەکانی خۆپاککردنەوە بەسەر هەزاران منارەوە بەسەر هەموو هاوارو زەناو چرپەکانەوە زاڵ دەبێت، هەوا دەترسێو دەشڵەژێ، تاقە منارەی تەنیاو هەتیو لەو ناوەدا کە بانگی لەسەر نادرێت، بە ترسو حەیبەتێکەوە وەک پیرەپیاوێک عزرائیل دەستی لە ئەوکی نابێو قژی هەڵبووەرێت، ئاواهی منارەی تاین تاوناتاوێک خشتەکانی هەڵداوێت، هەرکەسەو بە ترسێکەوە خۆ پەنا دەدا نەبا خشتێک سینگوڕکی بکوتێت، بەدەم ڕەشەبای بە تینو تاوی ئەو هەموو بانگو دوعاو سەڵاتەوە منارەی تاین بەلادا دێت، هەر وەک قامیشێکی باریکو وشکەوەبوو لە شکانی خۆی بترسێت، هەرگیز وانەبووە، منێو

قەستییەتی خێرەومەندێک بێتو سایلی منارەکانی دیکە بانگو سەڵا بۆ نزیکو دوور بنێرێت، بۆ تاوێک سەر لەرزیو و پەشۆکاو بەدەم ئەو قیامەتەوە بێئاگا بوو لە خۆشەویستەکەی خۆی، هارەو داڕژانی «الله اکبر .. الله اکبر» لە هەزار لاوە چی کۆتری سەر منارەکەو فڕندەکانی سەر گومبەتو ناو ئاسمانی شاری گێژو زەندەقبردوو کرد، پۆل پۆل بەسەر شاردا بەناو یەکدیدا تێکدەقژقژان .. دەشێوان .. سەدای بانگەکان ئاراستەی فڕینیانی تێکدەدا، منارەکە پتر بەلادا دەهات، منارەی تاین وەیادی دەهاتەوە کە لە وەرزێکی پڕ لە ئافات و وەیشوومەداو لە زەمانێکی دێریندا هەزاران شمشێربەدەست لە بیابانەکانەوە بەسەر ئەسپە عەرەبییەکانیانەوە ئاواهی ئاگریان کردۆتەوەو گەمارۆیان داوە.. تا چاو بڕدەکات ئەو ناوە ڕەشو بۆر دەچۆوە، درۆ بێت یان ڕاست ئاپۆڕەی خەڵکەکە لە ترسی لاربوونەوەی منارەکە دەتەکینەوە، بە سەدەها پیاو و تۆلاز بەپەلەو تەنگەتاو گەرەکیانە فریای نوێژەکانیان بکەون، داڕژانی سەدەها کوڕوکاڵ شەپۆل شەپۆل گەمارۆی منارەکە دەدەن، شانو شەپیلک لە یەکدی گیردەکەنو بەدەم قەرەپەستەوە سەر هەڵدەبڕنو بۆ ژنێکی ڕووت دەگەڕێن، ئەو ژنەی سەد جاران لە بڵندگۆکانەوە گوێی لە ناوی خۆی دەبێتو بەر نەفرەتی ئیماندارەکان دەکەوێت، هاوارو نەعرەتەی وا بڵند کە لەوەدایە پەردەی گوێیەکانی بتەقنو خوێن بە لاجانگییەوە داچۆڕێت ..چ ئعجووبەیەکی ئاخیرزەمانە .. عەلامەتی هاتنی تەجالاو .. عەزازیلو

.. ئاجووجو ماجووج-ە .. کەیفو سەفای بێچووە شەیتانەکانە ..

زەنگی کڵێسایەک بە شەرمو ترسەوە بەسەر هەواوە شەپۆلان دەداو بە ئاستەم دەگاتە گوێ، بزر دەنێو بانگو سەڵای ناقۆڵای سەر منارە و گومبەتەکان، لەناکاو خۆی دەنێو گەمەی شینو شەپۆڕو دادوفیغانی کچانو ژنانی ڕەشپۆشدا دەدۆزێتەوە، خۆی لە ژێر عەبایەکی چڵکندا دەشارێتەوە کە لە تەک سەدەها عەبای دیکە بە بزمارێکەوە هەڵواسرابوو، داکوتراو بە ئەستووندەگی ژێر دەوارێکی ڕەش، هەترەشی چووبوو بیناسنەوە، سایلی ژنەکان لە ڕوومەتی خۆی دەداو دایدەڕنیو وەک ئازیزمردە دەیلاواندەوە، سەردولکەی ژنەکان گڕی بەردایە هەناوی، هەر هەمووان لە چاوی ئەودا دەبوون بە قەلەڕەشو .. قاغ .. قاغ.. بەو غەڵبەغەڵبەوە لەوە دەچوو هەر کچێکو ژنێک دابڕ لە هەمووان بۆ چارەڕەشی خۆی بگری، ئەویش بۆ شتێک، بۆ ڕازێکو خەمێک دەگریا کە مەحاڵ بوو هیچ خانمێکی ڕەشپۆشی ژێر ئەو دەوارە ڕەشە دەرکی بکات، کەس نە وەڵامی سڵاوی دەدایەوەو نە بەخێرهانی لێدەکات، سەردولکەی پیرەژنە غەمگینەکان ڕۆحی هەلاهەلاو پەژمووردە دەکات، تاوێکو دوو و سێ وەک ئەوەی بیناسنەوەو گومانی لێ بکەن .. بەدەم پرتەو بۆڵەوە قاوی دەدەن، بە شاتەشات لەنێو گریانو واوەیلای نەسرەوتی ژنەکاندا وەدەری دەنێن، پرسەیەکو دووانو دە .. ئەوەندە لە پرسەکاندا بەدەم شیوەنەوە

دادەنیشێت .. پیر دەبێت .. هاوار دەکاتو دەپاڕێتەوە .. خودا هاوار .. بۆ نامکوژیت؟ چەندەها جار دوا کەس خۆی کە تەنیاو بێکەسو بێ ماڵ لە ژێر ئەو دەوارە ڕەشانەدا دەمێنێتەوە، غەریبەماڵا و ئافەرۆز بۆ بێ بن بوونی خۆی شیوەن دەکات، لە دوورەوەش گوێی لە ناوی خۆیو داباریینی نەفرینو .. ئەعوزوبیللا .. ئەستەغفیروڵڵا دەبێت.. خودایە پەنامان بدەیتو دووربین لە فاحیشە .. لە فسقو فجوور .. لە دێڵەبەبای ئاخیرزەمان، چ قەهرو دۆڕانێکەو خۆی نەبان دەکات، بەزمو ڕەزمی شاییو گۆڤەندێک لە گەڕەکدا فریوی دەدا، کەچی ئانو سات لەژێر دەستو پێی سەدان پیاو و ژنی تووڕەو تۆسندا خۆی دەبینێتەوە .. نە شاییەو نە قاو و قریوەی سەرچۆپیکێش، پێ کوتانی کچانو کوڕان سەرمەستی حەزو سۆز نییە لەناو هەڵقەی نەپساوەی شاییکەران، ئەم ڕەشبەڵەکە کوتانەوەی پەنجەکانە، کەللەی سەرو .. سینەی پڕ لە حەسرەتە ..بێئەوەی کەس .. هیچ کەس .. هەتا کۆنە یاریش گوێی لە هاوارو قیژەی نییە، بێئاگا لە خۆی .. وەک ئەوەی هێشتا لەودیو زەریاکانو کێوەکانەوە بێت، بام گوێبیستی ناڵەی بێت، کێ دەتوانێت سەدەها بازنەو دیواری ئەستوورو هەڵچنراو لە مەردووم ببڕێت کە ڕەشبەڵەکی خوێن سازو گەرمی کردوون، لێرەداو هەنووکە مێردە نەخۆشەکەی دڵی بۆی دەسووتێت، لەوێندەرێ مێردە مردووەکەی لە گۆڕدا ڕادەچڵەکێت کە دەبینێت شار میرخاسو جوامێرێکی تێدا نییە، بەپەلەپڕوزێ تەقەللا دەدات لە بن دەستو

پێی هەمووواندا دەریبێنێتو قورتاری بکات، کەچی ناتوانێ ڕاستەپێ بەرزبێتەوە، نە قاچەکانی ماونو نە دەستو پەنجەکانی تاوەکو بڕنەوە ژەنگاوییەکەی لە دیوارەکەوە دابگرێتو بکەوێتە تەققە تاوەکو بڵاوە بەو حەشاماتە شێتو بەلەسە بووە بکات و قاویان بدات، کە ئەو ملۆزمو لەندەهۆرانە نیازی ناو چاوانی دەخوێننەوە، پەلاماری دەدەنو وەک فەردە پەتاتەی ڕزیو بەدیواریدا دەدەن، هەر بە حەواوەیە کە دەیبینێت جارێکی دیکە دیسانەوە دەیکوژنەوە، لەتەک ئەو پیاوە کەسیرەیە دەمرێتو گۆڕەو شار دەدرێت، هەر ئەوەندە نا .. هێشتا بە حەواوەیە کە باڵندە ڕاوکراوەکانی دەکوژرێن، بولبولو کەناریو کەوی باوکو براکانی بە قەفەزەوە وردو خاش دەکرێن، ڕەشبەڵەکی خوێن گەرمەو گوێی لە قریوەو قاقای مەرگهێنە، هەزاران پەپوولەی بۆرو ڕەنگ بوواردو کە لە کەلاوەکانەوە هەڵدەفڕن بەدەم فڕینەوە هەڵدەوەرن، لەناو هەراو هەنگامەی ئەو ڕۆژی حەشرەدا، دەنێو پەڕوباڵی هەڵوەریوی سەدەها کەو و کۆترو کەناریو قەتێو پۆڕو سوێسکەو قەلەباچکەو باشووکەو ڕیشۆڵەو پاساریدا، دەنێو داڕژانی پەپوولە بە تۆزبووەکاندا ون دەبێتو خۆی لە یاد دەچێتو هەرگیز بیری ناکەوێتەوە بۆ ..؟ چۆن ..؟ لەکەنگێوە بەسەر منارەوەیە؟ گەر خۆی هەڵداوە..بۆچی ناگاتە سەر زەوی؟ یان گەیشتۆتە سەر عەردێکی ڕەقەنیو بووە بە هەزار هەزاران ڕۆحی جنراوی ناو لەپو بن دەستو پێی گاگەل، جارێکو دوو .. دەو .. سەدەها جار لەپەو

ڕوو دەكەوێت بەسەر سەدەها منارەی وەک تیغ تیژ، ڕەپو ڕەقو چەقیو تا ناو هەناوی، جارێک بەسەر تەوقی سەردا کە کەللەی سەری ببێت بە دوو لەتەوە، جارێک لە ناوگەڵەوە لێکدی هەڵدەزڕێت، دوا نیگاو کەچی هێشتا منارەی مەعشووقی وەها بڵندو سەرکەش، وەها قیت بە ئاسماندا ڕۆچووە کە سەری دەیدا لە کەشکەڵانی فەلەک، بە زمانی قوڕو خوێنو گڵو خۆڵەپۆک بانگی دەکات، بڵندتر لە هەرای ناقۆڵای پیاوە خوێنخۆرەکان، قووڵترو پاکتر لە بانگو سەڵای هەڵفڕیو بەسەر گومەزو منارەکانی دیکەوە، بەوپەڕی سۆزو میهرەوە بۆی دەنووشتێتەوەو گەرەکییەتی وەک کۆترێکی دەنووک خوێناویو نیوە مردووی ناو هێلانەی زارکی خۆی دەنێو خوێنو قوڕولیتە هەڵیبگرێتەوە، وای لە خانمی خوێناوی .. لەوی هێشتا کچو تازە مەمک کردوو .. لەوی مێ .. لەوی بێوەژن .. نە کچو نە بێوەژن .. لەوی بێ بن .. بێوەژنو لەتەژن .. لەوی هیچو .. باپووسکەو .. بابردەڵە .. لەوی کوژراو وەک خەیاڵو ڕۆحێکی گوزەر کردوو بەناو جەهەننەمدا.. بەناو زەمەنی زریان و وەیشوومەدا، لەوی تەنیاتر لە (مریەمی مەجدەلییە) کە ئاودامان خوێنەو سەنگەسار دەکرێت، لە سەد لاوە بەردبارانە، سەری دەتاشنو دۆو دۆشاوی بەسەردا دەکەنو پشتاو پشت سواری کەرێی دەکەنو شاربەدەر تا قیامەت، نە عیسایەکی موعجیزە دێت دەنێو خوێناو و کەڵەکە بەردەکان هەڵیبگرێتەوەو ئاوڕ لە ئاپۆرەی خەڵکی بداتەوەو بڵێت:

((کێ لە ئێوە کە گوناهێکی نەکردووە .. بەردێکی تێبگرێت!؟))

هیچ ئافرەتێکی جگەرسۆزیش نادۆزێتەوە لەناو ئەو حەشاماتە دەم بەهاوارە کە ماست بەسەری تاشراویدا دەکەن، ئەم وەک هاوسۆزو هاورەگەزی خۆی پەلی بگرێتو ژنانە ڕایفرێنێو بیخاتە ژێر عەباکەی خۆیی‌و لە دەستو چاوان بیشارێتەوە، جوامێرێک لەو ناوە پەیدا نابێت کە لە ڕاهی خودا یان شەیتان تا بیمارستانێک ڕایفرێنێو لەوێندەرێ تیماری بکەن، لێرە دەمرێتو کەچی لەوێندەرێ پیاوە ماقووڵەکانی بنەماڵەو ڕیش سپی خێڵو کوڕوکاڵی سمێڵ گووگرە بەدەم تەزبیح هەڵگڵوفینەوە سەر لە بن گوێی یەکدی دەنێن‌و بە چرپەوە دەدوێن، چۆن چۆنی کوشتنی حەڵاڵترە؟ بە خەنجەرەکەی بابە گەورە گۆشاو گۆش سەری ببڕن یان بالیف بخەنە سەر دەمی تا دەخنکێت؟ دوو گاشە بەرد بە قاچەکانییەوە ببەستن‌و هەڵیدەنە ناو چەمێک یان دەرمان خواردووی بکەن؟ چاوەڕێ بکەن تاوەکو براکانی وکوڕگەلی ئەو بەرەبابە کە هەڵەتەی وڵاتان بوون بێنەوە یان تا زووە سەرنگومی بکەن؟ ئەم دەکوژرێتو دونیاش پاکو خاوێن دەبێتەوە، کەس‌و کاری ئابڕوومەندو ژنان‌و کچانی بنەماڵە بێ سەرئێشەو داوێن پاکتر لە جاران دەژین، چیتر ئەو پەڵە ڕەشە بە نێوچەوانەوە نامێنێت، لە پرسەو شایی ناکەون، پیاوانی ناموسپەرست دەستو پلیان لە خوێنی ڕەش‌و

پیسی ئەم پاک دەکەنەوە، هەر هەموو دەست بەیەکدا دەدەن .. خودا هاوار .. ئەوە چی بوو؟ کەی لە تایەفەو بەرەبابی ئێمە ژنی وا بێ شەرمو چەقاوەسوو هەبووە ..؟ ئاخر بووە ژنێک شەرەفی هەر هەموو قەبیلەکەی بخاتە ژێر کەوشەکانیو مل لەبەر ملی یەک دونیا نێرەوزی ئەم شارە بنێت؟ وەها چاو قایم گوێ لە باوکو براکانیو هەر هەموو پیاوانی گەڕەک نەگرێتو خوێنی خۆی بخاتە کاسەوە..؟ لەناو هەقایەتەکانیش عاجباتی وا نەبووە، ژنانو کچانی بە شەرمو شکۆی بنەماڵەو خزمو خوێش پێکەوە هەموو شوێنێک دەپشکنن بۆ کەل و پەل و جلەکانی.. تا دەگات بە سۆلو پێڵاو و شانەو وێنەکانی کۆدەکەنەوە، هەر هەموو سکێچو نیگارو تابلۆکانی .. هەرچی بۆنی ئەمی لێ بێت دەنێو کانتۆرو چەکمەجەو جانتاو خورجینو بووخچەکان .. هەر هەمووی مەرجە بسووتێن، ناسنامەو چی نامەی دۆستانەو کاغەزەکانی دڵداریو دەفتەری یادگارییە شەرمنەکان، کۆی کتێبەکانی فکرو فەلسەفەو ڕۆمانەکانو چیرۆکو دیوانی شاعیرە تازەو کۆنەکان، ئەلبوومە زۆرەکانی نیگارکێشە رۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکان، دەبوو هیچ ئاسەوارێکی نەمێنێت، کزۆڵەو داماو لە مردن راست دەبێتەوە و دەپاڕێتەوە کە دەست لە سووتاندنی ئەو شتە خۆشەویستانەی نەدەن، ئاخر ڕۆحی ئەم وا دەنێو ئەو پارچە کاغەزو کتێبو ئەلبوومانەدایە، سوێند دەخوات بیدەنەوەو ئیتر سەری خۆی هەڵدەگرێت.. چ مردوو بێت و چ زیندوو.. لەم مەملەکەتە ئابڕوومەندە دەردەچێت ..

پۆلیسەکان بە قامچیو قیرپاچ لە دە لاوە هەموو ئازای جەستەی ئاگر دەدەن .. فاحیشەی دێڵەبەبا سەد جاران سوێندت خواردو درۆت کرد، کوڕە لاوێک تابلۆیەکی خستۆتە بن باڵیو بەدەم بای غارەوە هاوار دەکات .. تۆ بشمریت .. تابلۆکانت نەمرن .. دەیەها تابلۆی دەکەوتنە ژێر پێی مەردوومەکانو دەیانشێلا، نیگارەکانی بەدەست هەرزەو مێردمنداڵەکانەوە، مینیماڵو کۆتەڵی منارەکان کە چەندەها شەو و ڕۆژی لە هەڵکۆڵینو داتاشینیان بەسەر بردبوو، تاڵانو بڕۆو ببە، ئاسنگەر بە بەروانکەی سووتاوەوە، قەساب بە کێردەوە، پینەچی بە چەکوشەوە، وەستاو خەلفەکان ئاودامانی نوقمی ژێر گەچو قوڕو چیمەنتۆی وشکەوەبوو دەوریان دەداو قژوقاڵی ئاڵۆزکاویان دەسکەنە دەکردو لە ڕەگەوە هەڵیاندەکەند .. قەحپەی دەڵەقۆڕ ئەو منارەیە بوو بە چی؟ قەسەم بەوەی خەڵقی کردین ئەو منارەیەت تێببڕین .. خوێ بکەنە دەرپێکەیەوە ..ئاڵۆشداری تێرنەخۆرە، لە ژێر تەبارو قورسایی ئەو پیاوانەی بەسەرییەوە سەگانە تەکانیان دەدا دەکەوێتە سەر ئاخو ئۆف و ناڵەو قیژە.. کەچی پتر لەزەتیان لە نێربوونی خۆیان دەکرد .. بێهوودە بوو گریانی خوێنینی، بەدەم جنێودانەوە بە نووکە شەق بە نیازی کوشتن تێیان هەڵدەدا، وەها کوشندە کە ناوهەناوی هەڵتەکێت، بە سەرە سم لێکدا لێکدا ناوگەڵیان هەڵدەتەقاند، دەگریا نەک لەتاو ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە، بەڵکو ئەوە خوایەو بزانن کە ئەمیش بنیادەمە، دەخەنێتەوە تا بینوێنێت بەخشندەیە .. بێ

سوودە، دەخوازێت لەو پارچەو لەتو کوتانەی لەشی خوێنی زیاتر بڕژێت تا بەزەییان پێدا بێتەوە، گەرەکییەتی خۆی خڕ بکاتەوە .. دەگەڕێتو جگە لە پەنجەیەکی قرتاو بە ئەنگوستیلەوە، ددانێکو تۆپەڵێک قژ هیچ نادۆزیتەوە، هەموو ژنەکان پێکەوە لە لاڕوومەتی خۆیان دەدەن .. وەیش .. وەیش بابان وێران .. بەو جوانییەوە خۆی کرد بە عیبرەت، ژنە ترسنۆکو تەریوەکان لەتەک کچە نەباڵقەکانو تازە باڵقبووەکان بە پشتدا دەکەونو پتر سڵ دەکەنەوە نەکا فیچقەی خوێن کە لە ژێر زەبری شەقو پێلەقە فرتە بکاو ئەوان گلاو بکات، دەیەها پیاوی تووڕەو تۆسنو نەوسن لەتەک ئەو هەموو گەنجە خورتو داخدارو ئاگرگرتووانەدا تەقەللا دەدەن چنگیان بیگاتێ کە وەک تەنێک لە عەزاب دەدرەوشێتەوە، وەک گۆمێک لە خوێنی مەییو، وەک تۆپەڵێک لە قژی دەسکەنە کراو، مەلاو فەقێو پۆلیسو سەربازو باشبۆزغ بەسەر سەرییەوەو ئەمیش وەک میزراح دەنێو دارستانێک لەلاق دەخولێتەوە، لە خۆی دەگەڕێتو لەناو ئەو ئاپۆرەیەدا مەحاڵە خۆی بدۆزیتەوە، لە چاوتروکانێکدا کوڕە لاوەکەی بەر دڵی دەبینێت، بە یادی سۆزو میهری جارانەوە پڕ بە ئاسمان هاواری بۆ دەکات، بەدەم قیژەو گریانەوە بانگی دەکات، کەچی وەک پشیلەیەکی تۆقیو بەسەر منارەکەدا هەڵدەزنێت، شپرزەو سەرلێشێواو کە نەزانێت ئاراستەی ئەم هاوارە لەکوێوە دێت، هەر خودی هاوارو قریشکەکە لە سەد لاوە سەداو دەنگدانەوەی بوو، چەند گەزێکو لە منارەکە

دادەخزێتە خوارێ، هەر بە شانو قۆڵو باسک سەوڵ لێدەدات تا زەریای ئەو خەڵکە ببڕێتو فریای بکەوێت، تازە مەحاڵە .. ونی دەکەی .. ونت دەکات، لەوە وردوخاشترە ئەم بەدی بکات، توێ توێ خۆی هەڵدەداتەوە، بەناو خۆیدا ڕۆدەچێت تا دەگاتەوە سەر شاراوەترین برین لە ڕۆحو لەشیدا، سەر یەکەمین دڵۆپە خوێنی ڕژاوی ساڵانی پڕ لە شەڕوشۆڕ کە ئەم خاکەی سوور کرد و کەچی نەیتوانی ئەو دڵۆپە خوێنەی لەبیر بباتەوە، چ ڕقو حەسرەتو تووڕەییەک لەم دونیایە تەرەی کرد، زانی ئەو ڕقو داخە تەنها لە خۆی دەخوات، ناچار دڵخوازی سپڵەو نادیدەکەی خۆی بەخشی تاوەکو کەمەکێ ئاسوودە بێت، چ ڕۆژێکی سووتاو بوو کە خۆر لەناو چاوەکانیدا ئاگری دەکردەوە، ئەو تنۆکە خوێنانەی هەنووکە دەڕژێن دەیبەنەوە سەر ئەو خوێنەی لەناکاو لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا دەرپێکەی پڕکرد، زەندەقی دەچێتو دایکە بە پەڕۆو پاتاڵ پاکی دەکاتەوەو شپرزەو تۆقیوتر لە کچەی تازەباڵقبوو .. مەترسە کچەکەم .. تەواو .. ئیتر عازەبیتو سەرو عوزرشۆر .. مانگی جارێکەو تەواو، وای لەو هەموو خوێنەی جۆگەلە دەکاتو هەرگیز نابڕێتەوە، ڕۆژێکی گەرمتر لە هەموو ڕۆژەکان دایکەو خوشکەکانیو ژنانی دەرودراوسێو بە دەیەها دەستەوە ملی بە دواوەدا دەشکێننەوە، تا نەزانێت لە دامێنییەوە چی ڕوودەدات، ئەیەڕۆ وا باڵق دەبێت سوونەت نەکراوە، هێشتا خۆر لە چاوانیا دەسووتێ، ئارەقەی خۆی دەخواتەوە، سەدەیەک بەناو توونێلێکی تاریکدا غار

دەدات، سەدەیەک دەنێو گۆڕستانێکدا کە تەنها خۆی تیایدا گۆڕەوشار دەدرێت، سەدەیەک بە داوێنی خوێناوییەوە بەناو زەمهەریردا بەپێی پەتی گوزەر دەکات تا دەگاتەوە سەر یەکەمین تنۆکە خوێن کە لە یادی مابێت، حەوشەیەکی پڕ لە پیرەژنی ئەرژەنگو پشیلەی لەڕو چڵکن، چەندین کچی هەترەشچوو کە هاوزای خۆی بوون، قۆڵبەستکراو، یەکە یەکە لە یەکدی دووردەخرانەوە، مرە مرِی پشیلە برسییەکان، لەودیو پەنجەرە کراوەکانی ژوورەکانەوە براکانیانو کوڕیژگەی دەرودراوسێ بە ترسەوە هەڵدەلەرزینو هەندێکیان بێباکو بیژمۆت لەناوگەڵی کراوەی کچۆڵەکان ڕادەمان، خێڵو خوار بە خەندەیەکی شەرمنەوە، هەر ژنەو بۆ مووسێکی حەشاردراو دەگەڕا لە کونە دیوارەکان، لە قەڵەمبڕو تیغێکی تیژ کە موو بکات، بۆنی گۆشتێکی خاو نەیدەهێشت پشیلەکان حەوشەی ئەو حەسارە چۆل بکەن، لەسەر بانیژەکانیشدا دەیەها کوڕیژگەو کچی پارچەلە واق وڕماو پاڵیان بەیەکدییەوە دەنا، باوکەکان دیار نین .. برا گەورەکانیش، پیرەژنەکان بەدەم هەڕەشەی کێربڕینەوەو دەست بە تیغەوە ڕاوەدووی کوڕیژگەکانیان دەنا، وەک پشیلەکان لێرەوە قاویان دەدانو لەوسەر دەهاتنەوە، شەڕبوو کامەیان بتوانێت لەودیو دیواری ئەستووری پیرەژنەکانو دایکی کچەکانەوەو ژنانی دەرو دراوسێ، لە کونێکو درزێکەوە ناوگەڵی کراوەی کچەکان ببینن، وەها قاچیان پێ بڵاودەکەنەوە کە هەڵزڕێن .. دوای بیسمیللاو دوعاو ئەڵڵا بە تەمای

توو .. بە گوێزانو تیغی ژەنگاویو کول کوتە گۆشتێک دەبڕن، زریکەو ناڵەیان دەگاتە عەرشی فەلەک، کوڕیژگەکان لە ترساندا دەست دەخەنە سەر چاوەکانیان و میز بە خۆیاندا دەکەن .. ئاخ .. بە خۆڵەمێش برینی سێگۆشەی نێوان هەردوو ڕانی کچۆڵەکان سواغ دەدەن، قیژەو هاواری ئەم و کچانی لە هۆشخۆچوو دەگاتە لای خودا، کەس نییە فریایان بکەوێت، نە کوڕیژگە بێغیرەتەکان، نە دایکە داماوەکان، نە برا چەلەنگەکان، نە خوشکە خەتەنە کراو و نەکراو و گەورەکان، نە باوکە کافرو ئیماندارەکان .. نا .. هیچ کەس .. نە خودای ئاسمانان، ئەو کوتە گۆشتە جنراوانەی ناو لەپی پیرەژنە ددان کەوتووەکان بە حەوادا بۆ پشیلەکان هەڵدەدرێت، هەر بە حەواوە دەکەونە ناو زاری کراوەی پشیلەکان، وەها هار هێرش دەکەن وەک ئەوەی ناوگەڵی خوێناویان بلێسنەوە، زۆر زەحمەت بوو ناڵەناڵو گریەو زاری ئەوان لە مڕەمڕی پشیلەکان جیابکرێنەوە، کفتو نیوە مردوو لەسەر کەچە لبادێک پاڵیان خستبوو، بەسەر سەرییەوەو چەپو ڕاستیان لێ گرتبوو، کە چاوەکانی کردەوە دایکو خوشکەکانی دەگریان، لێویان دەلەرزیو لووتیان دەسڕی، کە پتر هۆشی هاتەوە دەتوت چەقۆیەک چەقیوەتە نێوان هەردوو ڕانیو تا ناو هەناوی بڕیوە، هەستی دەکرد کەسێک چنگ لەسەر چنگ خوێ بە برینەکەیدا دەکات، نەیزانی چۆن گڕێکی زۆر بە سوێ کە گەرد بە گەردی لەشی دەسووتاند بکوژێنێتەوە، هەردوو دەستەکانی بەسترابوونەوە، ئازارێکی کوشندە وەک زمانی

بڵێسە بە مۆرەغەی پشتیدا دەڕۆیشتو دەگەیشتە کەللەی سەریو خێلی کردبوو، پەڕۆو پاتاڵێکی تۆپەڵ کراو نەیدەهێشت ڕانەکانی جووت بن، زمانی بە بن مەڵاشوویەوە نووسابوو، وشکو تفتو تاڵ، وەک تینوویەک کە بخنکێت بە ئاماژەی دەستو پەنجەکانی ئاوی خواست، جامێکی تەزیویان لە دەمی نزیک خستەوە کە تا دوا چۆڕی خواردەوە بە ئومێدی ئەوەی کە گڕەکەی ناو هەناوی بکوژێتەوە، هێشتا خوێن دادەنیشت، کەچی دایکەو خوشکەکانی پەلی بەستراوی بە هەل دەزانن‌و هەر دوو گوێی دەسمن، هەر هەموو بووکەشووشەو مووتوومورووەکانیان لێ سەندەوە، هەر هەموو بەردە ڕەنگاوڕەنگەکان کە لەناو چۆمو جۆگەلەکاندا کۆی کردبوونەوە، ئیتر تەواو گەورە بوویت، ئەوەندە ماندوو .. خوێن لەبەر ڕۆیشتوو .. پرزە لێ بڕاو کە نەیدەتوانی هەستێتو پرکێشی ئەوە بکات ئەو دونیا سادەو چکۆلەیەی منداڵی لە دایکو خوشکەکانی‌و پیرەژنە ئەرژەنگەکان بستێنێتەوە، دەنێو ئەو هەراو زەناو زایەڵەدا شتێک لە ڕۆحی یان لە جەستەیدا جیادەبۆوە، هاوزەمان لە دەیەها شوێندا پەرتو بڵاو دەبۆوە بێئەوەی لە هیچ جێگەیەکدا ئۆقرە بگرێت، ناچار جارێکو دوو . دە .. وەک کۆترێکی دەنووک خوێناوی‌و شکەستە باڵ کە بە باڵەفرەیەکی زۆر زەحمەتەوە بگاتە سەر هێلانەکەی بەسەر منارەکەوە .. دەگیرسێتەوە، ئەوەندە پرزە لێبڕاو کە خۆی نەگرێتو سەرانگرێ بێت، سەربەرەوخوار، لەتەک ئەمدا منارە ئازیزەکەی لەناوقەدەوە دەبێت بە دوو کەرتەوەو

بە دوای عاشقەکەی خۆیدا دەڕمێت، دەکەوێتە ناو گۆلاوێک کە بە خوێنی نەوەستاو و داچۆڕاو لە دامێنییەوە سوور دەبێت، بێ ئەوەی دڵی بێت یەکێک لەو خشتانە بەر ئەم بکەوێت، مەزنو منالی سەر شکاو و زامار پەرت دەبنو هەر یەکەو بەلایەکدا ڕادەکاتو خۆی پەنا دەدات، پیاوێکی شان شکاو بەدەم بای غارەوە ئاوڕ دەداتەوەو هاوار دەکات .. بێ ئابڕووی دەڵەدێو.. ئەم سمێڵە هی پیاو نەبێت گەر ماڵە کاولبووەکەت بۆ نەکەین بە گۆڕ، بە چواردەورییەوە شەڕو گێچەڵێک بوو کە گەورەو بچووک دەمو ددانی یەکدیان دەشکاند وەک ئەوە وابوو میرات دابەش بکەن، شەقژنی گوللەو تەکینەوەی حەشامات، ساتمەکردنو بەدەمدا کەوتن، شەڕە تفو جنێوباران، دەیەها ژنو پیاوی چەقاوەسوو بە یەکدیاندا دەماڵیو دەستەو یەخە سەرو گوێلاکی یەکدیان دەکوتایەوە، فڕکان فڕکان چی لە ماڵەکاندا بوو بە تالانیان دەبرد، ئەو مالانەی تاوێک لەمەوبەر لە ترسی هێرشی شۆقلەکان بەپێوە خۆیان نەدەگرت، تۆزو خۆڵو دووکەڵ پێکەوە ئاسمانیان تەنی، چ غەمێک بوو خودا هاوار .. لەناکاو باوکی دەرکەوت کە دە هەنگاو دوور کووڕ ببۆوە و گۆڕێکی لێدەداو سەری هەڵنەدەبڕی ببینێت چۆن لەناو ئەو گۆلاوە چەقیوە، براکانی بینی بێباکتر لە باوکە قەفەزەکانیان چاک دەکردەوە کە لە ژێر دەستو پێی ئەو ڕەشە خەڵکە وردوخاش دەبوون، بەدوای ئەو مەلانەدا ڕایان دەکرد کە باڵیان کرابوو، بەو نیازەی سەرلەنوێ ڕاویان بکەنەوەو بیانخەنەوە ناو

قەفەزەکانەوە، گۆلاوەکە دەبێ بە ڕەحمی دایکەو گەرەکییەتی بەدەم زریکەیەکی تازەوە بێتە دونیاوە، تەواو .. لەو منداڵدانە تەڕو تاریکە وەڕس بوو، دایکە هەر هەموو هەقایەتی ئەم مەرگەساتەی بۆ دەگێڕێتەوە، هەقایەتی یەکەمین خوێن بینینی خۆناسین و خوێی خەتەنەو خوێن پڑانی پەردەو بێ بنبوونو عیشقو سەفەرو دۆڕانو جەنگی نەبڕاوە، هەرچی دەکات و دەکۆشی زاتی ئەوەی نییە ئەو سەفەری خوێنو فرمێسکە بکات، پیرەژنەکان دیسانەوە بە لەتە گوێزانو تیغی ژەنگاوییەوە بە دیار ژانو ژووری دایکەوە وەستاون، چاوەڕێن کە لە دامێنی بکەوێتە خوارێو ناوکی ببڕن، بە زۆردارەکیو کێشمەکێش تەقەللا دەدەن لە قوڵایی ئەو گۆلاوەی ڕەحمی دایەکدا دەریبێنن .. ژنینە وریا بن .. بە قاچ هاتووە یان بە سەر .. بەسەر هاتبێت یان قاچ .. زوو نەیەت دایکە دەمرێت، زریکەیەکو هەر هەموو ژنەکانو مامانەکەش گرژو مۆن لەو زانە دەڕوانن، سێ چوارێکیان لە ڕوومەتی خۆیان دەدەن .. نۆبەرەو کچ .. خەڵاتی خودایە چ دەکەیت؟ وای لەو هەموو خەونە ناخۆشو خەو زڕانو خوێن بەربوونە ئەبەدییە، سەفەرێک لە تاریکی ڕەحمی دایکەوە بۆ ناو ڕووناکییەک کە بەشەوارەی دەخاتو کوێری دەکات، چ مۆتەکەیەک بوو زیندەگی، چ گرانەتایەک کە هەرگیز بەری نەدات، چاوتروکانێکو وەنەوزێک دەدات، کەمێک دەبۆرژێت، دەنێو گۆلاوی خوێناوی پەلی دەکوتاو هەرچی دەکات لە لێوارە خزەکەیەوە خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ و لەپەو ڕوو دەکەوێتو نوقم

دەبێت، تاوێکو لەوەدایە دەرباز بێت .. هەرجارەو پیاوێک بە لەقەیەک دەیخاتەوە ناو گۆلاوەکە، ئەو خوێنەی تنۆک تنۆک لێی دەڕژێت هی بەرەژانو زانێکە، چ زوو .. کەی .. لەکوێ .. لە کێ ئاوس بوو .. مەحاڵە دەنێو ئەو ڕۆژی حەشرەدا یادی بکەوێتەوە، ها ئێستا نا .. ها قەیرێکی دیکە واقە لە دامێنییەوە دێتو منداڵێکی دەبێت، بەرلەوەی بزانێت کچە یان کوڕ، بەدەم تفـو جنێوەوە شەق لەناوگەڵی هەڵتەقیو و برینداری دەدەنو بێچووەکەی ڕادەفڕێنن، کەس نەزانم وەک ئاسەواری گوناهێک ونی دەکەنو دەیشارنەوە، غەمبارو داهێزراو خۆی دەبێتە تنۆکێک فرمێسکی درشتو بەسەر ڕۆحی هەلاهەلابووی خۆیدا دادەتەکێت، چاوان لێک دەنێتو گوێی لە دەنگی پیاوێکە کە وەک ڕەشەبایەک گڤە بکاتو تێپەڕێت، ئەو قەحپەیە بکوژنو ئەم توفڵە حەرامەش سەرەونگوم بکەن .. بە دامێنی خوێناوییەوە هەڵدەستایەوەو لەتری دەدا، بەدەم تەکانێکەوە خۆی لە قوڕاو و چڵکاو و خوێناو و سەد دەست ڕادەپسکاند کە لە ئەوکی گیربببوون، دەیویست فریای کۆرپە چاو نەپشکووتووەکەی بکەوێت کە بێئەوەی ناوکی ببڕن ڕایانفڕاند، لە کۆلانی پێچاوپێچو تەنگەبەردا خۆی بە دارو دیواردا دەدا، ساتمەی دەکردو ڕەتی دەبردو بە دەمی پڕ لە خوێنەوە هەڵدەستایەوە، ئەمەیان چ چارەنووسو دۆزەخێکە؟ هەر هەموو دەرگاکان داخرابوون، هیچکام لە خانووەکان پەنجەرەی نەبوو، دیوارەکانیش بڵند، ئەو دەرگایانەشی کە کرابوونەوە ئەوەندە بەرتەسک

بوون کە مەحاڵ بوو بزنە لەڕێک پیایاندا تێپەڕێت، لەسەر بانەکانەوە مەردوومێکی زۆر کە کەوتبوونە ئەودیو تۆزو خۆڵو گەردەلوولو دووکەڵێکەوە بەردیان تێدەگرت، قژ بژو سینە واڵا کێویانە لە ڕێبوارە بێباکەکانو ژنو پیاوە تاڵانکەرەکان ڕادەماو دەپاڕایەوە کە داڵدەی بدەن .. بێهوودە بوو .. بەناو ئەو تۆزو گەردەلوولی دووکەڵەدا ساتمەی دەکردو دەیویست هەناسەیەکی پاک هەڵمژێت بەرلەوەی بخنکێت، یەکێک لە دواوە بەتاو دەهاتو تیغێکی بەدەستەوە بوو دەینەڕاند .. بوەستە ڕوو ڕەشی بێ دەرپێ.. لە چ گەوادێک ئاوس بوویت؟ چ خەونێکی ڕەشە کە ناهێڵێت هەرگیز بسرەوێت، بەدەم بای غارەوە دەکەوێتەوە بەردەمی حەشاماتێک کە شێتانە لەو گەڕەکە دەکەونە تاڵانیو فڕکان فڕکان، وەک کەسێک کە دەمرێت بۆ دواجار بەرلەوەی تەرمێک ببەن بۆ گۆڕستان، کەسو کارو خزمو خوێ تکاکارن کە بۆ دواجار تەرمەکە ببەنەوە بەردەمیماڵەکەی خۆی .. دوا نیگاو دوا ماڵئاوایی بکات بەرلەوەی بینێژن .. خودا هاوار..ئەم مردووە یان زیندووە کە ئەو حەشاماتە بە ژنو پیاوەوە لەسەر هەزاران لەپ دەیبەنەوە بەردەم ماڵەکەی خۆی، پاسەوانەکان لەتاو هێرشو پەلاماری ئەو خەڵکە ڕادەکەن، ئەوەندە تۆقیو کە چەکەکانیشیان فڕێ دەدەن، ئەو ڕەشە خەڵکە شانو شەپیلک دەکوتن، چی دەکەوێتە بەر پێیان دەیهاڕن، تا دێت بەرزتری دەکەنەوە، ئەوەندە بەرز کە خۆرێک لەناو هەردوو چاوەکانیدا بسووتێت، هەر لە ماڵەکەی خۆیدا گۆڕی بۆ

لێدەدەن .. لەوەدایە هەر لەوێدا لە خاچی بدەن، هەر هەموو مل دەنێن‌و وەک بەراز ناتوانن مل بسوورێنن .. فاحیشە ئەم زۆڵەت نوتفەی کێ بوو؟ بەدەم ڕاکەڕاکەو هانکەهانکەوە بەرازئاسا شفرە لە هەر شتێک هەڵدەدەن کە دەکەوێتە سەر ڕێگایان‌و .. هەڵیدەدەن بە ئاسماندا، ئەوەی کە پتر لە هەر شتێک هاریان دەکات بینینی پیاوێکی غەریب‌و کەس نەناسە کە ئەو بالکۆنە جێناهێڵێت .. کێیە؟ چی دەکات، نیازی چییە؟ شێتە یا هۆشمەند؟ ئەمیش لەبری کفن.. سیپاڵی بەری خوێن‌و ئارەقەو قوڕو لیتەیە، دەست هەڵدەبڕێت‌و هاواری لێدەکات .. خاڵۆزا .. جوامێر بەو بڵێ ئەو منداڵە لە منە .. بڵێ‌و لە غەزەبی خوێناوی کەس‌و کارو ئەهلی گەڕەکو شار قورتارم کە .. دەستم دامێنت .. دەخیلتم فریام کەوە، کەچی هەیهات .. ئەویش لەو دوورەوە بێباکو خەیاڵ مردوو لە گێژەنی ئەو خەڵکە ڕادەمێنێ‌و وەک منداڵێکی دڵڕەق پەڕە بە پەڕەی ئەلبوومەکانت دەدڕێنێت‌و دەیداتە دەم با .. دەفتەری سکێچەکانت، دەفتەری گەورۆنەی پڕ لە پەپوولەی دەرزی ئاژن کراو کە بە داخێکەوە هەڵیان دەداو با بەناو لاپەڕەکاندا هەڵدەکات‌و .. وەک ڕۆژانی خۆڵ باران .. تۆزو گەردی سەدەها پەپوولە ئاسمان دەتەنێت‌و دەڕژێتە سەر بالای هەمووان، لەبەر چاوانی دەبنەوە بە هەزار پەپوولەی پیرو بۆر کە بە زۆر دژی ئاراستەی با بە زەحمەتەوە باڵ لێکدەدەن‌و گەرەکیانە بگەڕێنەوە ناو ماڵە کاولبووەکە، لەبەر چاوانی دەبێتەوە بەو منداڵەی جاران‌و دیسانەوە شاگەشکە

پەپوولە پیرو باڵ هەڵوەریوەکان ڕاو دەکاتەوەو دابڕ لەو حەشرو نەشرە لە دەفتەرێکی تازەو پانو پۆڕدا بێباک لەو قیامەتە دەرزی ئاژنیان دەکاتەوە، دایکە بەدەم قیژەو ناڵەناڵەوە کە بەرەژانی زانێکی وا کوشندەو نەعلەتی  لە گۆی دەخات و ناهێڵێت بە هەناسەبڕکێوە هەقایەتی ئەو مەرگەساتە بۆ کۆرپەلەکەی تەواو بکات، سەفەری ڕێگای هاتو نەهات، سەفەرێک بەناو گۆلاوەکانی جەهەننەم، ئەمیش دەنێو ترسو تۆقینی خۆیدا گرمۆڵە دەبێتو ئەوەندە زەندەقی دەچێت کە لە کۆرپەلەوە ببێتەوە بە دەڵەمەو بە سەرەمێکوتەو هەرگیز نەوێرێت لەو گۆلاوە خوێناوییە بێتە دەرێ، سەرەتاتکێ دەکاتو دە پیاو پێکەوە وەک ئەوەی بۆقێکی پیس بێت میزی پێدا دەکەن، ئارامترە ناو وێڵاشو ڕەحمی دایکە، هێشتا وا دەنێو گۆلاوەکە کە خوێن لەنێوان هەردوو ڕانییەوە فیچقە دەکات، لە ژنەکان دەپاڕێتەوە کە یارمەتی بدەن بە پەڕوو پاتاڵ خۆی پاک بکاتەوەو ئەو خوێن بەربوونە ڕابگرنو هەریەکەو عەباکەو چارۆگەو دەسماڵو ڕەفتەی خۆی بخاتە بەردەم و بەرپێی پیاوەکان بەڵکو ئەو خوایە شەرمی پیاوانە بیانگرێتو واز لە ئافرەتە تەنیاو نیوەڕووتە بهێنن .. وەلێ ئەفسووس بێهوودەیە .. تازە خوێن بەرچاویانی گرتووەو .. مەحاڵە لە هیچ سڵ بکەنەوەو .. بتەکنەوە، دامێنی هەمیشەو تا ئەبەد خوێناوی پیشانی ژنەکان دەدات بەڵکو بەزەییان پێیدا بێتەوەو یەکێکیان دەستی ڕابکێشێتو لەو گۆلاوە دەریبهێنێت، وەلێ پتر پشتاوپشت خۆ بە دوور

دەگرن نەبا گلاو بن، کەس بەهانایەوە نایەت، پیاوێکی چەتەوڵو ڕدێن درێژ تا بەر ناوکان، مرادخانی لەبەر، مشکیو هەوری تێکەڵ کردووە، بەسەر سەرییەوە وەستاوەو بە تەزبیحێکی کارەبای قل گەورۆنە کەللەی سەری کۆتی دەکوتێتەوە، پژدێن سەوز، کەڵەگەتو شانو شەپیلک پان، وەک پاسەوانی دۆزەخ تووڕەو داخدار، بە مشتەکۆڵە سینگوڕکی دەکوتیو ڕێک وەک ئەوەی نیشانە بگرێتەوە لەقفەیەک دەوەشێنێتو بەر مووسڵدانی دەکەوێت، تف لەسەر تف چاوەکانیو ڕوومەتی سواغ دەدات، کە ورد دەبێتەوەو لە خولەکێکدا ڕووخساری دەگۆڕێت وەک ئەوەی دەمامکەکانی بگۆڕێت، هەر چرکەو ڕووخساری پیاوێکی دیکە دەنوێنێت، هەموو ئەو پیاوانەی لە منداڵییەوە تا هەنووکە تفیان لێکردووە، جنێویان پێداوە، لێیان داوە، ئەو شاپەی کە ناو هەناوی هەڵتەکاند وەها بەزەبرو کوشندە بوو کە هەر هەموو سووڕەکانی خوێن بینینی تەمەنی خۆی بینییەوە، لە یەکەمین ڕۆژی خوێن پژانەوە تاوەکو دوا خوێن بەربوونی ناو ئەم گۆلاوەو سەر منارەکەش، هەر هەمووی بەسەریەکەوە کە وای لێبکات وەک پڵنگێکی مێ قەپ لە دەستو مەچەکو لا ڕانی خۆی بگرێت، هەر خۆی بوو.. کەچی سەد لەتو کوتی لێ دەبۆوە، هەر لەتێکی لە سەعاتێکی خوێناویدا، لە ڕۆژێکی تاریکدا، لە شەوێکی تەنیاییدا، لە مانگێکی شەونەبڕاوەداو لە ساڵێکی سیادا.. خوێنی لەبەر دەڕۆیشت، هەنووکە دوو لەتی گەورۆنەیە .. لەتێکی وا بەسەر منارەوەو باڵ لێکدەداتو

نافڕێت، لەتەکەی دیکەی وا دەنێو چاڵاویکەو بۆ هەناسەیەک سەر هەڵدەبڕێتو بۆ کەمێک هەوا کە گەرەکییەتی لە خوداو لەو خەڵکەی قەرز بکات .. خەریکە دەخنکێت، ئانو سات نیوەکەی دیکەی باڵ لێکدەدات ڕووەو لای ئەم دەفڕێت تاوەکو خۆیت پێوە پەرچ بکات، نیوەی چەقیوی نێو گۆلاوەکەش پەل دەکوتێو .. کەچی ڕۆحی دەیبیستێ کە لە دە لاوە دەنگی گڕی پیاو و کوڕوکاڵەکان پێکڕا پڕ بە ئاسمانی شار هاوار دەکەن .. نەهێڵن سەر دەربێنێت، لە سەرماندا هەڵدەلەرزێتو دەمارەکانی شین هەڵدەگەڕێن، دەمی پڕ لە گوو بۆقو قوڕباقەو مارمێلکەی ئاوێو سەرەمێکوتە، تکای تیرۆژێکی دەکرد لە هەتاو، بەقەد هەر دوو پێی خاکێکی گەرم، پاروە نانێک، زەردەخەنەیەک، نیگایەکی پڕ سۆز، دەستی درێژکراوی پیاوێکی جوامێر کە بە میهرەوە لەم زەلکاوە دەری بکات، ژنێکی ئیماندار کە چش لە گڵاو بوون بکاتو لەو خوێنو قوڕو لیتەیە پاکی بکاتەوە، لەسەر هەر چوار پەل تەکان دەداتو خۆی ڕادەتەکێنێت بەو نیازەی دەربچێت، چەندین زەلام بە حەیزەرانو چەقۆو قامچیو مەترەقەوە بۆی وەستابوون، سەر هەڵدەبڕێتو بەغیلی بەو ئافرەتە دەبات کە لە دوورەوەو لەناو بالکۆنێکدا وەستاوەو قژی تەڕو درێژی بە خاولییەک وشک دەکاتەوەو چ بە نازەوە دایدەهێنێت، بێباک لەو حەشاماتە دەڕوانێت وەک ئەوەی سەیری ئاهەنگێک بکات، دڵخوازەکەشی منداڵا بۆتەوە و هێشتا ڕاوەدووی پەپوولەکان دەنێتو ڕاویان دەکات.. بێباک

لەوەی چی لە دەوریدا دەگوزەرێت، ئەوەندە مندالْ بۆتەوە کە پێی شەرمە بڵێت .. خاڵۆزا .. دڵخوازەکەت تەنیایەو شارێک وا ڕاوی دەکات، وەک کارمامزێکی گەڕو قاچ شکاو و کوێر ڕێ دەرنابات، شەکەتو شێواو .. نیوەی سەر منارەکە نەیدەزانی بە باڵەفرەیەک خۆ هەڵبداتو لەگەڵ نیوەی دیکەی ناو گۆلاوەکە ئاشت ببێتەوە یان هەر بە حەواوە بمێنێتەوەو هەوا لە ژێر باڵەکانی کۆبکاتەوە لەتەک ئەو هەموو بازو هەڵۆو شەهێنانەدا کە چۆلەکەو کۆترەکانی سەر منارەکە دەتۆقێنن، یان هێلانە بۆ خۆی خۆش بکات تا گەر منارەکەیان ڕماند، ئەویش لە ژێر داروپەردووی منارە خۆشەویستەکەی ببێت بە قوربانی، کتو پڕ هەورێک هاتو نزم دەبۆوە، تێکەڵ بە تەمو دووکەڵ، گەردەلوولێک کە بابەخولەی بە زەلام دەکردو تا چاو بڕدەکات بە ئاسماندا ڕۆدەچوو، حەشاماتەکەی ترساند بە جۆرێک کە خۆ لەو تەمو دووکەڵو گەردەلوولە بشارنەوە، هەلێکی گونجاوی بۆ ڕەخسا کە لەو گۆلاوە بێتەدەر، کەچی هێشتا زاتی ئەوەی نەدەکرد، تاوێکو تەرزە دایکرد، درشتو گەورۆنە کە وەک وردە بەرد بنو سەرو دەمو چاو بقنجێنن، گران هەناسەی دەدا، لە سەرەوە خۆی گرمۆڵە دەکردو باڵەکانی تەڕتر دەبوونو سەنگی قورستر کە لەوەدابوو سەرانگرێ ببێت، تەرزەکان لە هەناویدا کۆدەبوونەوەو خوێن گران بەنێو دەمارەکانیدا شەپۆلو تەوژمی دەدا، لەوەدابوو خوێنی بیبەستێت، لە ترساندا باڵەکانی لێکدەدا تا گەرم دابێتو خوێنی نەمەیەت، گوێی لە

زرمو کوتی تەپڵو دەفێک بوو کە ناساز لێدەدرا، مارشێکی پرسەئامێز، گرمۆڵەو چکۆلەتر دەبوو، تا خۆی دەبوو بە تەرزەیەکی پڕ بە چنگێک، چکۆلە وەک دەڵەمەیەک کە بەسەر هیچ شتێکەوە جێگیر نەبێت، لە دوورەوە چەندەها بلدۆزەرو شۆڤڵو سلێنگو تراکتۆرو گەلابە بە نرکەو ناڵەوە وەک کۆمەڵێک دەعبای زەبەللاح دەهاتن، خانووە نەڕماوەکانی گەڕەک لە ترسی ئەو هێرشە وێک دەهاتنەوە وەک ئەوەی بچنەوە ناو قاوغی خۆیان، پتر زەندەقیان دەچێت کە پێیە پانەکانی بلدۆزەرەکانو کەڵبە ئاسنینو تیژەکانی شۆڤڵەکان دەبینن، پتر پاڵدەدەنە یەکدی، هەندێکیان هەر لەجێوە داتەپین، قەست دەکەن ببنە کۆلیتو کولانەی چکۆلە، لەگەڵ هێرشی ناقۆلای ئەو هەموو ماکینانەو هەنگاوی هاروهاجیاندا زەمین لەرزەیەکی وەهای لەو ناوەدا بەرپا دەکرد کە کەلاوە شان شکاوەکانیش بەسەر خۆیاندا پتر برمێنو سەگو پشیلەکانو هەر هەموو مارو مێروویەکی ئەو ناوە تەرە ببن، پەنجەرەکان وەک ئەوەی کۆمەڵێک چاو بن لە هێزێکی پەنهان دەترسانو دەکوژانەوە، منارەکەو گشت خانووەکانو درەختەکان لە قەڵەباڵغی ئەو خەڵکەو بەیەکدادانی ئەم بەودا تۆقیبوون، لە ڕژانی ئەو هەموو ئۆتۆمبێلو مەردوومە، کرێکارێکی بێشووماری دەست بە خاکەناسو پاچو بێڵەوە، ئەوانەشی کە بەخۆیان و تەلیس و گوێنییەوە خۆیان مەلاس دابوو بۆ فەرهوودێکی گەورە، درەختەکانی ناو حەوشەکان لە ترساندا هەڵدەلەرزین یان ڕەشەبایەکی توند لقو پۆپی تێکدەشکاندن،

هەموو شتێک لێڵو وێڵ خۆی دەنواند، تەنەکان تێکەڵ دەبوون، مەڕو ماڵاتو ماشێنە زەبەللاحو چکۆلەکان لە یەکدی دەئالان، چاوەکانی ڕەشکەو پێشکەیان دەکردو هەتا پیاوەکانیش عەباپۆش دەردەکەوتن، ئانو ساتو پێکەوە وەک ئەوەی هەر هەموو ئاسنەکان بەیەکدا بدەنو ماشێنەکان ئاگر بدەن تەمو دووکەڵێک هەر هەموو خەڵکەکەی دەپێچایەوە، چ ناقۆڵاو بڵند بوو زرمەی کەوتنی شۆڕەبیو چنارو دارتووەکانی ناو حەوشەکان، بەیەکداکەوتنی گاشەبەردەکانو کاریتەکانو شەقڵەکان، داتەپینی سەربانەکان، هەر هەمووان بە ترسەوە تەرە دەبوونو خۆیان بە دوور دەگرت لەو داتەپینە، خانووەکان لە ترسی شۆڤلەکان پتر وێک دەهاتنەوەو دەبوونە ماڵەباجێنەو خانۆچکەی سەردەمی منداڵییان، تەنها خۆیو دڵە لەرزیوەکەی لەو داڕمانو کاولکارییە ڕادەماو بە قەهرێکەوە دەگریا، ڕۆحی پەژمووردەو خەفەت خان لە چاوەڕوانی داڕمانی منارەکە بەسەر خۆیو ماڵەکەدا، وای لەو شار وێرانەیە، بۆ ماوەیەکی کەم زۆریان بێئاگا بوون لەم، دەنێو تەمو دووکەڵو خۆڵدا خۆی گەیاندە کولانەسەگێک، ئەوەندە تەڕو ئاودامان خوێنو ئارەقەو فرمێسک کە وەک دێڵە سەگێکی گەڕ خۆی دادەتەکاند، وەک تەرەکی بووبێت بە ژانێکەوە خۆی گرمۆڵە دەکرد، یەکێک لەناو ئەم وێرانەیە وەک ئەوەی ئەم مردبێت چەپکێک گوڵی ڕەشی بەدەستەوە بوو هەڵیدەدا، یەکێک دەیویست بیگاتێ چنگێک خۆڵ بکاتە ناو چاوەکانییەوە، دەیەها پیاو بە خاکەناسو

پاچو بێڵەوە کە پتر لە گۆڕهەڵکەنەکان دەچوون .. یەکێکیان فەرمانڕەوایانە بەسەر ئەوانی دیکەدا هاواری کرد .. بە زیندوێتی بینێژن، ژنەکان تا دەهات دوورتر دەکەوتنەوەو لەودیو تەمو دووکەڵێکەوە ون دەبوون، هەندێک لە مێردمنداڵەکان وەک ئەوەی بۆ خۆشی بەرد بگرنە بۆقێک .. بەردیان تێدەگرت، بەڵام ئەم بەڕاستی دەمرد، خوێناویو ڕەش داگەڕاو و نوقمی ژێر لیسوتەنیمۆک، یەکێک لە نزیکەوە گاشە بەردێک دەگرێتە ئەژنۆی، گوێی لە تەقینو شکانی کڵاوەی ئەژنۆیەتی کە ئازارەکەی لەو مەرگە ڕاستی دەکاتەوە، بۆ دواجار چاوان دەگێڕێتو کەس نابینێت کە بە سیلەی ڕەحم بگاتەوە بەم .. نە باوک .. نە براکان .. نە دایکەو نە خوشکەکان، نە خزمو خوێو نە دراوسێ .. هیچ کەس.. چ خوێنو چ خۆڵو چ قوڕاو و چڵکاو، هەر هەمووی سیپاڵی بەری بوون، سەدەها منداڵو هەرزە لەناو داروپەردووی بەسەر یەکدیدا ڕووخاو لە غارغارێن نەدەکەوتن، لە بەردەفڕکانێ نەدەسرەوتن، ڕەوە سەگێک: گۆلەو دێڵە وەها بەیەکەوە نووسابوون پێوە ببوونو بەناو یەکدیدا دەخولانەوە، مەحاڵ بوو لە یەکدی جیابکرێنەوە، لەناکاو بەردێکی دیکە بەر سەری کەوتو خوێنێکی گەرمو داچۆڕاو بەسەر تەوێڵو برۆکانیو چاوەکانیدا جۆگەلەی دەبەست..بە جۆرێک کە پەردەیەکی سوور بەسەر بیناییدا دابداو دونیا لەوە سوورتر ببینێت کە خۆی خوێناوی دەینواند، بۆ ئەم زەمەن زەمەنی ڕژانی خوێنو فرمێسک بوو، بێئاگا بوو لەوەی چەندی مانگەو

چ ڕۆژێکەو کامە وەرزە، شەو و ڕۆژەکان، تاریکیو ڕۆناهی لەناو ڕۆحی خۆیدا دەگۆڕان، خەونو خەیاڵ بێت یان زیندەخەو یان دۆخیکی ڕاستەقینە ..ئەم هێشتا وا بەسەر منارەکەوە، کۆنە یاریش هەروا دەنێو بالکۆنەکە، ئاسمانیش لێڵو بە هەورو هێڵ .. نم نم دەباری، هێشتا هەر هاتو هاوارو هەراو هۆرییایە، هێشتا بلدۆزەرو شۆفڵەکان دەگرمێننو تا دێت پتر گەمارۆی منارەکە دەدەن، ئەویش بێباکانە گەرەکییەتی جگەرەیەک ئاگردا وەک ئەوەی لە زەماوەندێک بڕوانێت، هەرچی دەکات جگەرەکە دانەگیرسێت، داگیرساندنی جگەرەیەک دەبێتە گەورەترین خەمو زۆر کەللە ڕەقانە چەرخەکە ئاگر دەداو .. بێهوودەیە، تێناگەی بۆچی ئەو بالکۆنە جێناهێڵێت، لەوەدەچوو لە نهێنییەک بگەڕێت لەوماڵەی ئەوەندەی نەماوە نۆرەی بێتو بڕمێت، وەک ئەوەی مۆڵەتی بدەن وەک خاوەنی ماڵ بارگەو بنەی تێکبنێت، ماڵی بێوەژنێکی تەنیا کە لە سەر منارەکەوە هەڕەشەی مەرگ دەکات، لە خوارەوەش سوێند دەخۆن کە خۆی ڕووتو قووت کردۆتەوە، خۆی هەڵداوەتە خواریو هێشتا وا بەحەواوە، کەچی چاوێکی هەر لەو میوانەی دوور وڵاتە کە لە بالکۆنەکە پەڕ بە پەڕی ئەلبوومەکان دەدڕێنیو دەیداتە دەست ڕەشەبا، وەک ئەوەی دیارنەمانی کۆنەدولبەرەکەی بە هەل بزانێتو دوعاخواز بێت هەرگیز نەگەڕێتەوە، بەپەلەو شێتانە هەموو کونو کەلەبەری ئەو ماڵە بپشکنێت، بەدوای ئاسەوارێک کە بیخاتەوە سەر دۆزینەوەی نهێنیو ڕازێک کە تەمەنێکە

لە کونجێکدا حەشاردرابێت، بە کامی دڵو بۆ دواجار پەردە هەڵماڵێت لەسەر داستانی ئەم تۆرانە کە ناکرێ بە تەنها نائومێدی بووبێت لە عەشقو خۆشەویستیو سەفەر، قەستی ئەوە دەکات بەرگە سەرینو لێفەو دۆشەکەکانیش دەربهێنێتو بەڵکو ئەوە خوایە شتێکی شاراوە بدۆزێتەوە کە لەو هەموو ساڵانەدا بە یادی ئەم هەڵگیرابێت، وێنەیەک با زەردو هەلاهەلا بێت، نامەیەکی دڵداری با وشە گەرمەکانی کوژابێتنەوە، تابلۆیەک کە دەنێو هێڵو ڕەنگەکانیدا خەم یان خۆشی بدۆزێتەوە، دەستەسڕێکی چڵکن، قەڵەمێک، بۆنێک، یەکێک لەو دەفتەرە چکۆلانەی پڕ بوون لە ڕازو نیازی شەرمنانەی کچێک کە هەر پیتەو بە ڕەنگێک، ڕەنگێکی تۆخو جیاواز، لەسەر بەرگی یەکەمیدا نووسرا بێت «یادگارەکان».. کتێبە کۆنەکانی مەکتەب کە دەکرێت لەتە کاغەزێکی تێدابێت بە دەستو خەتی خۆی کە تاسەو حەزێک هێشتا لەوێدا کڕکەوتبێتو بەدەم کردنەوەی لاپەڕەکاندا لە خەوێکی قووڵەوە وەئاگابێت ، باولی جلەکان، ناو چەکمەجەو دۆڵابو کانتۆرەکان .. هارو بێ ئۆقرەتر .. دوورتر بڕواتو بگەڕێت تا ناو پێچو لوولی خەیاڵەکانو تاریکی خەونەکان .. بێئاگا لەم لەو بانی سەرەوە، بێئاگا لەو هەموو ئیستیغفارو ئیستیکبارو دوعاو بانگو سەڵاو درووود کێشانو ویردخوێندنە کە لە بڵندگۆکانەوە بێ وەستانو سرەوتن هەوای سەر سەری ئەو حەشاماتەی دەشڵەژاند کە لە هەموو کونو قوژبنێکەوە دادەڕژانە ئەو ناوە، گەرچی بە چواردەوری ئەو منارەو گەڕەکەدا

تەیمانی تەلبەندکراو و شوورای لە پەتو شریت تەنراو لێرەو لەوێدا ببوونە بەربەست لەبەردەم پەرپینەوەی خەڵکی بۆ ناو جەرگەی ڕووداوەکە، کەچی هەر هەموویان هەڵپەیان بوو بیگەنێو بیبینن‌و تێیبگەن‌و بیگێڕنەوە، نەیدەزانی ئەم کەرنەڤاڵی خاپووربوونە ڕۆژێک یان هەفتەیەک، مانگێک .. یان دەهرێکی خایاندووە.

هاتو هاوارەکە دەگەیشتە ناو جەرگەی شار تا دەگات بە دوورترین گەڕەک کە وای دەکرد گەورەو بچووک گوێ قوڵاغ بکاتو لەو دوورەوە بترسێت، دەرۆزەکەرەکانیش کۆلیتو کولانەی خۆیان چۆل کرد، بەر هەیوانی مزگەوتەکان‌و سەر جادەکانیش، دزە زیتو تەڕدەستەکان، جحێڵە هەوەسبازەکان، هەر هەمووان بە هەڵەداوان دەهاتن‌و دەڕژانە ناو ئاپۆرەکە، منداڵە چەتوونەکان کە لە شەڕە گەڕەک ببوونەوە، بەدەم هانکە هانکەوە، بە خۆیان‌و شمشێری دارین‌و دارلاستیکو بەردەقانی‌و دەمانچەی ترەقەوە لۆتیانە لەتریان دەداو دەلەنگینەوەو شێتی ئەوە بوون خۆیان دەنێو گۆبەندێکی دیکەدا ون بکەن، ڕەوە سەگێکی گەڕو لەڕ کە بە قوون میزیان دەکردو لمووزی قوڕاویان لە خۆڵی زەوییەکە دەخشاندو لە بن دەستو پێی ئەو خەڵکەدا بۆنیان بە هەموو شتێکەوە دەکرد، بۆنی شتێکی شاراوە لەنێو ئەو خاکو خۆڵو خەڵکەدا کە تەماعی سەگانەیان وەئاگا بێنێت، ئەوەندە تۆقیو کە بەڕاستو چەپدا ئاوڕبدەنەوە، تاو نا تاو مردووانە دەیانقروسکاند

که گوڕیژگه بیژمۆتەکان به سەره سم له لمۆزیان هەڵدەدان، دەیەها ژنو پیاوی دەمامکدار بەناو یەکدیدا دەخولانەوه که کەس نەیدەزانی ئەوانه کێنو بۆ وەک سیخوڕو خەفیه له ڕووخساری هەموو کەسێک ورد دەبنەوه، وەک سەگەکان بۆن به هەموو کەسێکەوه دەکەن، کڵاو و جامانەو کلێته لەسەر سەری پیاوەکان لادەبەنو پەچەو چارشێو لەسەر ڕووخساری ژنەکان هەڵدەماڵن، قامچیو قیرپاچ بەدەستەوه، لافاوی بەر پێنەگیراوی ئەو حەشاماته به ڕاستو چەپدا دەیبرد، لەو سەرەوەڕا خۆی دەبینێت که خۆی هەڵداوەو تەمەنێک دەگوزەرێت تا دەکەوێته ناو ئەو پیاو و کوڕوکاڵانەی باوەشیان بۆ گرتۆتەوه، پێکەوه نووساون که وەک یەک تەن دەردەکەون، بەر له خۆی بۆنو بەرامەکەی دەگات که هەر هەموویان کاس دەکات، گران هەناسه دەداتو قوڵپی ڕشانەوەیەک له هەناوییەوه سەر دەکات، سەرو کەلله گران، له یادی نەماوه له کەنگێوه پارووه نانێکی نەگلاندووه، شەڕ بوو لەسەر ئەوەی کێ بیخاته ئامێزیو سەر دەستان، ڕەتی دەبردو دەکەوته بن دەستو پێیان، سەدەها سۆلو پێڵاو بەسەریدا دەبارین، سەدەها مەترەقو قامچیو .. فاجیرەی لەعنەتی .. هەریەکەو گەرەکی بوو گۆشتی لێبکاتەوەو بگاته خوێنیو هەڵیمژێت، سەدەها دەست وەک ئەوەی بیانەوێت له خاچی بدەن دیسانەوه بەرزیان دەکردەوه، خوێن له دەمو چاو و دەستو پەنجەکانی .. قۆڵو باسکەکانی دادەچۆڕا، هەستی دەکرد هەردوو مەمکیان شێلاوەو وەک دوو شەمامەی

گەورۆنە فلیقاونەتەوە، خوێن لە گۆیەکانی نەدەوەستا، هەردوو ئەبرۆ تەقیو و خوێناوییەکانی چاوەکانی تەواو لێڵ کردبوو، بەجۆرێک کە نەزانێت قەوارەی ئەو غەزەبە ئاگرگرتووەی چواردەوری چەندەو تا کوێ بڕدەکاتو کەی دەکوژێتەوە، بانگو سەلا تێکەڵ بە جنێوەکان دەبوو کە هەوای ناو سینەو سەر سەری بۆگەن کردبوو، دایگرن .. بیگرن .. نەهێڵن دەرباز بێت، بێچووە شەیتانی زۆر هەن یاوەری بنو قورتاری بکەن، بە زیندوێتی بیسووتێنن، ماڵەکەی خۆی بۆ بکەن بە گۆڕ، تازە مەحاڵە لەناو داروپەردووی ئەم وێرانەیەدا دەنگی بە کەس بگات، کە هەڵیدەبڕن بۆ دواجار دەبینێت کە هاتۆتەوە ناو بالکۆنەکەو وەکو شێت چی دۆزیوەتەوە لەسەر مێزەکە پەرتو بڵاویان دەکاتەوە، دوا ئەلبوومی پەپوولە مردووەکان دەدۆزێتەوە، چاو لەو حەشاماتە هارو شێتە دەکات، سەیری داروپەردووی بەسەر یەکدیدا ڕماو، ئاودامان لە خوێنو خۆڵو خەم چەقیو، تا دێت ئاپۆرەی خەڵک دیوارێکی ئەستوور لەنێوان هەردووکیاندا هەڵدەچنێت، تا بێت دوورتر دەکەوێتەوە، ماشێنەکانو شۆفلەکانو بلدۆزەرەکان گەمارۆی خۆیان توندتر دەکەن، خۆیو منارە تاقانەکەی گەمارۆ دەدەن، هاوار دەکاتو دەنگی دەرنایە، کتومت وەک ئەوەی کە لە خەونەکانیدا سەدەها جار هاواری کردووەو لەتاو خنکانو هەناسەی تاساو لە قورگیدا بەدەم لەرزو تایەکەوە، شەلاڵی ئارەقە وەئاگا هاتبێت، کەچی هەنووکە مەحاڵە لەم خەونە ڕەشە بێداربێتەوە، هێشتا خۆی دەبینێت

دوو لەتە، نیوەی وا بەسەر منارەکەوە، نیوەی هەلا هەلا بەدەست خەڵکێکی تووڕەو داخدارەوە کە تا بۆیان بکرێت مەرگی دواتر دەخەن، گەرەکیانە سەد جاران بیکوژنو زیندووی بکەنەوە، لەو بانی سەرەوە دەیبینی غەمگینو دۆڕاو و بێباکو کینە لەدڵ پەڕە بە پەڕە ئەلبوومی پەپوولە مردووەکان دەکاتەوە، ئەو پەپوولانەی بە لاپەڕە ئەستوورو زەردەکانەوە دەرزی ئاژن کراون، لەگەڵ هەڵدانەوەی لاپەڕەکان پەپوولەکان هەلاهەلادەبن بە پەڕە زەردەکانەوە دەبنە ئارد، وەک تۆزو گەردێک بەناو باڵکۆنەکەدا دەبارێنو ڕەشەبایەک دەیانبات، دوور دوور دەیانبات، هیچ گەردێکی لەتەک گەردێکی دیکەدا یەکدی ناگرێتەوە، هاوارێک دەکات کە ڕەشەباکە ئاراستەکەی دەگۆڕێت .. پەپوولەکانت ڕۆحی من بوون دەرزی ئاژنت کردوون .. چەندین ساڵە .. هاوار دەکات .. میرخاسو جوامێربەو .. فریام کەوە .. ئەوەتام لێرە .. لە بن دەستو پێی خەڵکێکی بێباکو ملهووڕو داخدارو تووڕە .. هارو هاج .. وا هەلاهەلا دەبم وەک پەپوولەکانت، تا دێت دیوارێکی بڵندو ئەستوور لە مەردوومو ماشێنو تەرزەو دووکەڵ و تەمو باران دوورتری دەخاتەوە .. پرزۆڵ پرزۆڵ .. زیواڵ زیواڵ کە ڕەشەبا بیبات .. دوور دوور .. دوورتر لە خەونی ژنێکی غەمگینو دۆڕاو کە دایکی شاگەشکە بەو زانە سوور بوو لەسەر ئەوەی کچە نۆبەرەکەی ناو بنێت شادی... ناچار ناویان نابوو شادی ...

٢٠٠٥-٢٠١٠

sherzadhassan2003@yahoo.com